هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
مەڵبەندی کوردۆلۆجی

- ناوی کتێب: شیعری ناوچەی موکریان
- نووسەر: د. عوسمان دەشتی
- پیتچنین: نووسەر
- دیزاین و سەرپەرشتیی چاپ: بریار فەرەج کاکی
- بەرگ: رەنج شوکری
- ژمارەی سپاردن: ١٣٢٦/ ساڵی٢٠٠٩
- چاپخانە: رەنج/ سلێمانی
- تیراژ:١٠٠٠ دانە
- نرخ: [illegible] دینار
- زنجیرە: ٣٠

مەڵبەندی کوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران- گەڕەك/ ١٠٥، كۆڵان/ ٢٥، ژ.خانوو/ ٤، ژ. پۆست/ ٩٥
تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣
kurdology2006@yahoo.com

# نـــاوەڕۆك

## پێشکەشە بە:

◆ بە خێزانو بە منداڵەکانم کە لە ڕێگای سەختو پێچاوپێچی ژیانو خەباتدا هەمیشە مایەی سەبووریو دڵنەوایم بوون.

◆ بە گیانی بەرزە فڕی ئەو نەمرانە:

کۆکەیی و سەیف و شەوقی

# پێشـــــەکی

ئەو لقەی قوتابخانەی ئەدەبی کرمانجی خواروو کە لە دەڤەری رۆژهەڵاتو ناوچەی موکریان دامەزراوەو نەشو نمای کردووە، سامانێکی رازاوەو بە بڕشتی پێشکەش بە ژیانی رووناکبیریی کورد کردووە، بەشی زۆری ئەو گەنجینە ئەدەبیەش تاوەکو ئێستا بە دەست لێنەدراویو دەق نەشکاوی ماوەتەوەو نەکەوتۆتە ژێر تیشکی رووناکیو توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەرنەکراوە، هەر ئەو راستیەش بوو بە هاندەری ئێمە کە ئەم نامەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە سیماکان[1] و هەندێ لایەنی بەرهەمی شیعری ناوچەی موکریان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا تەرخان بکەین.

لەم ماوە زەمانیەدا شیعرو بەرهەمی سێ شاعیرمان بە نموونە وەرگرتووە کە لە وێنەی سێ کۆڵەگە ئەزموونی ئەدەبی ناوچەی موکریانیان پێکهێناوە. ئەم سێ شاعیرە لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ لایەنی تاقیکردنەوەی شیعری لە یەکتری جیاوازنو هەر یەکێکیان دەنگێکی رەسەنی سەربەخۆیە، بەڵام لە جەوهەرو چوارچێوەی گشتی ئەدەبیدا یەك دەگرنەوەو لایەنێکی ئەزموونی ئەدەبی ناوچەی موکریان لە سەردەمێکی دیاریکراودا نیشان دەدەن.

ئەو سەرچاوانەی کە ئێمە لەم باسو لێکۆڵینەوەیەدا پشتمان پێبەستوون دوو جۆرن:

یەکەم: سەرچاوەی تیوری/ کە کتێبو گۆڤارو رۆژنامە دەگرێتەوە، بۆ مەسەلەی کتێبی کوردی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی ژیانو بەرهەمی شیعری شاعیرانی مەبەستی ئێمە، ئەوا لەم بارەیەوە کتێبخانەی کوردی زۆر هەژارە، هەر چی تایبەتیش بێت بەو باسو بابەتانەی لەو بارەوە لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاو کرابێتەوە، ئەوا کەمو دەگمەنو هەم ئەوەی کە هەشە ئەوا بە قەڵەمی زۆر درشتو راگوزەریانە شاعیرەکانو بەرهەمەکانیان بەسەر کردۆتەوە. ئێمە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنو

کەم و کورپیانە دەستمان بۆ کتێب و سەرچاوە بە هەردوو زمانی فارسی و عەرەبی درێژکردووەو بەهرەیەکی چاکمان لێیان وەرگرتووە.

دووەم: سەرچاوەی مەیدانی/ بۆ خۆ نزیکخستنەوەو تێگەیشتن لە راستی مەسەلەکان و پەیداکردنی شارەزایی تەواو لەمەڕ ژیان و هەڵسوکەوتی شاعیرانی مەبەستی ئێمە، گەشتی مەیدانیمان بۆ ناوچەی موکریان و زێدی شاعیران ئەنجام داوەو لە نزیکەوە لەگەڵ نووسەران و شارەزایانی ئەدەبی ناوچەکەو بنەماڵەو کەس و کاری شاعیران دیدارو گفتوگۆی سوود بەخشمان ئەنجام داوە، بەشێکیش لە وێنەو نامەو دەستخەتی شاعیرانمان لەو گەشتەدا چنگ کەوتووە.

گیروگرفتی بەرچاویش لەمەڕ سەرچاوەکانەوە لەوەدابوو کە هەرچەندە هەر سێ شاعیری مەبەستی ئێمە بەناو دیوان و کۆ بەرهەمی شیعری چاپکراویان هەیە بەڵام کێشەکە لە دوو لایەنی دیکەدا بووە:

١. ئەو نووسەرانەی دیوان و کۆبەرهەمی ئەو شاعیرانەیان رێکخستووەو بە چاپ گەیاندووە، ئەو راستییەیان راگەیاندووە کە ئەمەی بەردەست بەشێکی بەرهەمی شاعیر پێك دێنێ و هەموو بەرهەمی نییە.

٢. ئەو کۆبەرهەم و دیوانانەش لە هەڵەو پەڵەو کەموکورتی بەدوور نین و تەنانەت هەندێکیان گوایا دەستیشیان تێوەردراوە.*

یا ئەوەتا تا ئێستا دەق و تێکستە شیعرییەکان بە تەواوەتی ساغ نەکراونەتەوەو بە چاپ نەگەیەنراون، وەکو لە دیوانی مەلا مارفی کۆکەیی و تێکستە شیعرییەکانی مستەفا شەوقی بەدیار دەکەوێت.

مەودای باسەکەی ئێمە، کە ساڵانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە ماوەی گۆڕان و هەژانە گەورەکانی جیهان پێکدەهێنێ، ئەم ئاڵوگۆڕە جیهانییە خاکی کوردستان و کۆمەڵی کوردەواریشی گرتۆتەوەو شوێنەوارەکەشی لە ئەدەب و رۆشنبیری و لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا رەنگی داوەتەوە. هەر بۆیەشە ئەم قۆناغە لە ئەدەبیات و مێژووی کوردەواریدا بە سەردەمێکی گرنگ و پڕ بایەخ سەیر دەکرێت. بەتایبەتیش لە رەوتی مێژوویی شیعری کوردیدا، کە رابەرانی نوێگەری و تازەکردنەوە لە ئەستەمبول و

---

* لەدیدارێکدا لەگەڵ مستەفا کۆکەیی نەوەی شاعیر مەلا مارفی کۆکەیی، لە ماڵەکەی خۆیاندا لە مهاباد لە رێکەوتی ٢٠٠٥/٩/٢٨دا، ناوبراو پێی راگەیاندم کە مەرحوومی سەیدیان لەکاتی لە چاپدانی دیوانی مەلا مارف دا هەندێ دەستکاری لە تێکستی شیعرەکاندا کردووە.

سلێمانیو مهاباد وەخۆکەوتنو چەندان بناوانو سەرچاوەی تازەیان بۆ شیعری کوردی هەڵبەستو چەندان پەنجەرەو دەروازەی تازەیان بە رووی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیدا کردۆتەوە. ئێمە وای دەبینین کە گرنگی بەرهەمی شیعری شاعیرانی ماوەی باسەکەی ئێمەش هەر لەم روانگەیەوە دێت کە وەکو جۆگەلەیەکی گەورە ئاوێزانی رووباری جولانەوەی بیستەکانو سییەکانی شیعری کوردی دەبنو لە ئاکامدا رێبازو ئەزموونە تازەکانی دەریای ئەدەبی کوردی پێك دەهێنن. باسەکەی ئێمە لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی شیکاریو پراکتیکییە لەمەڕ هونەرەکانی روخسارو ناوەڕۆك لە شیعری ناوچەی موکریانی ئەوماوەیە. لە بارەی بنیاتو ستراکتووری ئەم کتێبەیش، بە شێوەیەکی گشتی لە پێشەکیو پێنج بەشو ئەنجامو بیبلۆگرافیای سەرچاوەکانو چەند بەڵگەنامەو پاشکۆیەكو کورتەیەکی نامەکە بە زمانی ئینگلیزی پێکهاتووە.

سەبارەت بە میتۆدو رێبازی لێکۆڵینەوەشمان رێڕەوێکی مێژوویيو ئەدەبی، وەسفی – پراکتیکیم پەیڕەو کردووەو لەمەڕ هونەرەکانی رووخسارو ناوەڕۆکی ئەزموونی شیعری ناوچەی موکریان لەماوەی زەمانی باسەکەدا، بە گوێرەی تیۆرەکانی رەخنەی تازە چەند لایەنێکی هونەری روخسارم خستۆتە ژێر رۆشنایی لێکۆڵینەوە، لە وێنەی زمانو شێواز، کێشو مۆسیقا، بنیاتو وێنەی شیعری. ئەنجا لە بەرهەمی هەر سێ شاعیردا شەقڵی ئەم هونەرانەم دەستنیشان کردووە، سەبارەت بە بابەتو ناوەڕۆکی شیعری، لە مەبەستە کۆن و تازەکانم لە بەرهەمی ئەو شاعیرانە کۆڵیومەتەوەو باسو بابەتەکانم بە نموونەو تێکستی شیعری بە پێز، دەوڵەمەند کردووە. بەو هیوایەم لە بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکەدا توانیبێتم هەوڵێکی زانستیی خاکەسار، پێشکەش بە کتێبخانەی کوردیو پسپۆڕانو دڵسۆزانی بواری ئەدەبی کوردی کردبێتو خزمەتێکی بچکۆلانەشم لە ئاست ئەستانەی رەوانی پاکی مەلا مارفی کۆکەیی، سەیفی قازیو مستەفا شەوقی، هەر سێ کۆڵەگە شیعرییە بەرزەکەی ناوچەی موکریان، بەجێ گەیاندبێت.

# باسی یەکەم
## ناوچەی موکریان و شوێنی لە رووناکبیری کوردیدا

١. **موکریـــــــان:** شـەرەفنامە وای بـۆ دەچـێت کـە لـە رۆژگـاری سـەرنگونبوونی تەختوبـەختی پاشـایانی تورکمـانی (قـەرەقۆینلو – ئـاق قۆینلـو)، مـیر سـەیف الـدین ناوێـك دەرکـەوتووە کـە بـە سـەرزنجیرەی سـەردارانی مـوکری دەناسـرێت، پیـاوێکی زۆرزان‌و بە فەنـدوفێڵ‌و داهۆبـووە ژمارەیـەکی زۆری لـە کـوردانی بابـان‌و شوێنەکانی دیکەی کوردستان لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوەو بووە بەدەسەلاتداری ناوچـەکە، بۆیـە بە (مەکری یان مەکرۆ) ناوی دەرکردووەو لە دوایی نـاوی تـیرەو تایفـەو ناوچەکەشـی لـە (مـەکریان، مـەکرۆیان)ەوە گـۆڕاوەو بۆتـە (موکریـان)[1]. لـە کتـێبی (تـاریخ مهابـاد)یشدا ئـەم بـیرو رایـەی شـەرەفخان دووپاتکراوەتـەوە[2]. هەنـدێ کەسـیش بـە دووری نازانن کە ئەم نـاوە لـە نـاوی خێڵـی (موکریـت)ی تورکمانییـەوە داکـەوتبێ کـە بەشێکیان لـە کۆنـەوە لـە ئازەربایجانی رۆژئـاوادا نیشـتەجێن[3]. کەچـی مێـژوونووس (مـەلا جـەمیلی رۆژبـەیانی) ئـەم بۆچـوونانە رەتدەکاتـەوەو پێـی وایـە واژەو نـاوی (موکریـان) زۆر لـە رۆژگـاری مـیر سـەیفەدینی سـەرداری مـوکری لـە مێژینـەترە، لەبەرئەوەی ئەم دەشتی موکریانە سەرە رێـی موغـەکانی پـەیڕەوی ئـاینی زەردەشـت بووە بۆیە ناونراوە (موغ رێ، موغ رێیـان)و سـەرەنجام بووەبـە (موکریـان). هـەروەکو (سەردەشت) کە ئەویش دیاردییە بۆ زاینگەی(زەردەشت)[4]. جا بۆیە (ئەو هەرێمە لە هەزاران ساڵ بەر هاتنە دنیای عیساوە تا ئەمڕۆ ئاوەدان بـووەو نـاوی (موکریـان)یـش لـە سـەرەتای سـەدەی هەشـتەمی کۆچـییەوە (چـواردەیەمی زاینـی) کەوتۆتـە لاپـەڕە زێرینـەکانی کتێبە مێژوویی‌و جیۆگرافیاییەکانەوە[5].

---

(١) بڕوانە: شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی:٥٣٠.

(٢) تاریخ مهاباد: ٣٠.

(٣) فەرمانڕەوایی موکریان: ٨.

(٤) سەرچاوەی پێشوو: ١٠ – ١١.

(٥) سەرچاوەی پێشوو: ١٠ – ١١.

موکریـانی ئـەمڕۆ ژینگـەو نـشینگەی گـەڵێ هـۆزو عەشـیرەتەو بـەدەیان هـۆزو تـیرەو تایفـەی هەمـەجۆری لـێ دەژیـن لـە وێنـەی پـیران و مامـەش و مـەنگورو دیبـوکری و فەیزوڵلاً بەگی، وەکو چۆن بە مەڵبەندی سەرەکی هۆزە کوردەکانی کوردستانی ئێران (بەشی ئازەربایجانی رۆژئاوا) دەناسرێت.

٢. **ناوچەی موکریان:** ناوچەو مەڵبەندێکی جیۆگرافییە لـە کوردسـتانی ئێـران، ئـەم سـەر زەمینـە لەسـەردەمانی زوو ئـەم هەرێمانـە دەگرتـەخۆ: مەراغـە، سـەلماس، شـنۆ، لاجـان، نەغـەدە، ورمـێ، سـایین قـەلاً، سـابلاغ، بۆکـان، میـان دواو، خانـە، سەردەشـت، سەقز، بانەو...جێگاکانی تری ناو ئەم سنوورە کە ئەمڕۆ بەشی هـەرە زۆری ئوسـتانی ئازەربایجانی رۆژئـاواو ئوسـتانی کوردسـتان لـە رۆژئـاوای ئێـران پێکدەهێنن. لـە دێـر زەمانەوە نـاوچەکانی کوردسـتانی ئێـران لـە ژێـر نـاوو نیشانی کوردسـتانی موکریـان، کوردستانی ئەردەلان، کوردستانی کرماشان دابەشکراوەو ناسراون.[٦]

ئەمڕۆ ناوچەی موکریان لە بەشێك لەسەر زەمینی خوارووی ئوستانی ئازەربایجـانی رۆژئـاواو بـاکووری ئوسـتانی کوردسـتان پێکـدێت، کـە شـارو باژێرەکـانی سەردەشـت و بانەو مەهابادو سەقزو بۆکان و خانەو شنۆو نەغەدە دەگرێتەوە.[٧]

موکریان ناوچەیەکی شاخاوییەو، لوتکەی کێوی (حاجی برایم) کە بەشێکە لە زنجیرە چـیای قەنـدیل و کەوتۆتـە ناوچـەی سەردەشـت بـەرزترین چـیای ناوچـەکەیە کـە بەرزاییەکەی (٣٥٥٠م) دەبێت و نزمترین شوێنی ئەم ناوچەیە ٩٣٠ مەتر لەسەر ئاستی دەریا بـەرزە[٨]. ئاووهـەوای خـۆش و سازگارەو لـە ناوچـە کوێـستانییەکاندا ساردو لـە دەشتەییەکانیـشدا مامناوەندییـە، رێـژیمی بـاران بـارین لـەو ناوچـەیەدا سـەر بـە ئاوهەوای ناوچەکانی دەریای سپی ناوەڕاستە.

ناوچـە دەشـتاییەکانی لـە نێـوان زنجـیرەی کێـوو چـیاکاندا هەڵکـەوتوون کـە ناودارترینیان دەشتی لاجان و وەزنێ و کەپرانە، دەشتاییەکانی دەوروبەری گۆڵی ورمێ فراوان و بەربڵاوترن وەکـو دەشـتی شـامات و شـارویران و دەشـتەکانی ناوچـەی سـەقزو بۆکان و نـەغەدە. رووباری لاوێن کە بە (زێ) ناسـراوە، لـە شـاخەکانی ناوچـەی شـنۆوە هەڵدەقوڵێ و دەشـتی لاجـان پـاراو دەکـاو لـە دەربەنـدی ئـالان دەپەڕێتـەوە بـۆ دیـوی

---

(٦) جغرافیای طبیعي کردستان موکریان: ١١.

(٧) سەرچاوەی پێشوو: ٦.

(٨) تاریخ وجغرافیای کردستان (سیر الاکراد): ٧٠.

کوردستانی عێراق‌و زێی بچوك پێکدەهێنێ، ناودارترین‌و مەزنترین رووباری ناوچەکەیە، لە پاڵ چەم‌و رووبارەکانی (جەغەتو – زەڕین رود) و (تەتەهو – سیمین رود)، رووباری مهاباد کە دەرژێنە نێو گولی ورمێوە.

موکریان ناوچەیەکی ئاپۆڕەو ئاوەدانە بە گوندو دێهاتی گەورەو بچووك کە لە ناوچە دەشتاییەکان‌و بناری شاخەکاندا هەڵکەوتوون. خەڵکی دێهاتی ناوچە شاخاوییەکان بە مەڕداری‌و پەروەردەکردنی رەزو باغاتەوە خەریکن لەمانە هەندێکیان نیوە کۆچەرن‌و بۆ مەڕداری کوێستان‌و گەرمیان دەکەن. خەڵکی دێهاتی ناوچە دەشتاییەکان بایەخی زیاتر بە کشتوکاڵ و بەرووبوومی دانەوێڵە دەدەن، ناوچەکە خاوەنی زەوی‌و زارو خاکێکی بە پیت‌و بە پرشتە، زۆربەی دانیشتوانی موسلمانن‌و لە پەیڕەوانی ئەهلی سونەو لەسەر مەزهەبی شافعین.

## ٢. ناوچەی موکریان – کورتەو پێشینەیەکی مێژوویی:

مێژوونووسانی کوردو بیانی لەو باوەڕەدان کە لە هەزارانساڵی بەر لە دایکبوونی عیسای مەسیحەوە ناوچەی موکریان ئاوەدان‌و شوێنی فەرهەنگ‌و شارستانیەت بووە[٩]. لە سەردەمی (ماد)ەکاندا بەو خاکەیان گوتووە (مادی بچووك) لەپاشان‌و لە سەدەی چوارەمی پێش زایین بووە بە خاکی (ئاتورپاتەگان – ئازەربایجان)و ئەمڕۆکە بە موکریان ناودەبرێ[١٠]. ناوی مادی بچووك‌و سەر زەمینەکەی لە ساڵنامەی (ئاشوری)دا هاتووە، (هیرۆدۆت)ی باوکی مێژوونووسانیش باس لە تیرەکانی گەلی ماد دەکات.

مێژوونووسان لەو باوەڕەدان کە (زەردەشت) لە خاکی موکریان‌و لە ناوچەی (سەردەشت)ی ئەمڕۆ هاتۆتە دنیاوە. ساڵی (٢)ی کۆچی (٦٦٣ز) ئەم ناوچەیە بۆ یەکەمجار کەوتۆتە ژێر باڵی فەتحی ئیسلامی‌و بەدرێژایی چەندین سەدە هەرێمی ئازەربایجان کە ناوچەی موکریانیش بەشێك بووە لەو هەرێمە، لەلایەن ئەمیرە

---

(٩) بڕوانە: ـ فەرمانڕەوایی موکریان: ١١.
ـ میدیا: ١٣٥- ١٤١.
ـ کوردو کوردستان، ب.نیکیتین: ٤٨٦.
ـ تاریخ وجغرافیای کردستان (سیر الاکراد): ١٧٢.

(١٠) ـ کوردستانی موکریان: ١٢.

موسلمانەکانەوە کە لە دەربارى خەلافەتى ئیسلام، راشدین، ئەمەوى‌و عەباسییەوە دەستنیشان دەکران بەڕێوە بردراوە. لە سەدەکانى سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەمى کۆچیدا ئازەربایجان هەر بەناو سەر بە خەلافەتى عەباسى بووە چونکە دەسەڵات‌و کاروبارى وڵات بەدەست ئەم میرنشینە کوردانەوە بووە کە یەك لە دواى یەك دامەزراون، (رەوادى، سالارى، شەدادى، هەزبانى‌و روادى).[11]

ناوچەى موکریان تارادەیەك ئارامى‌و ئاوەدانى بەخۆیەوە دیوە لەسەدەکانى شەشەم‌و حەوتەم‌و هەشتەمى کۆچییدا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتى سەلجوقى‌و خەواریزمى‌و مەغۆڵ‌و تاتارەکان. لەو ماوەیەدا سەردارانى ناوچەکە هەمیشە لەگەڵ دەسەڵاتدارانى بێگانەدا لەشەڕو کێشەدابوون[12]. بە بۆچوونى شەرەفخان سەردارانى موکرى بەڕەچەلەك دەچنەوە سەر عێلى موکرى کە لە ناوچەى شارەزوورەوە هاتوون‌و سەر بە بابانەکانن، (میر سەیفەدین) ناوێکیان لێ هەڵکەوتووە کە زرینگ‌و ژیرو ئازاو پیاوێکى سیاسى بووە، لە رۆژانى دوادوایى حوکمڕانى هۆزە تورکمانەکانى (قەرەقۆینلو ئاق قۆینلو) (سەدەى نۆیەمى کۆچى‌و پازدەیەمى زاینى) هێزێکى زۆر لە بابانەکان‌و هۆزەکانى دیکە لە دەورى خۆى کۆدەکاتەوەو هێزەکانى تورکمان لەو ناوەدا ڕادەماڵى‌و ناوچەکەیان لێ پاك دەکاتەوەو بەو شێوەیە بناغەو بنچینەى میرایەتى موکریانى دامەزراندوە[13].

شا ئیسماعیلى سەفەوى ( ١٤٨٧ - ١٥٢٤) لە رەگەزو مەزهەبەکەى خۆى هەڵگەڕاوەتەوەو بووە بە تورکمانێکى قزڵباشى شیعە گەراى توندڕەو، بەمەبەستى دامەزراندنى دەسەڵاتێکى ناوەندى بەهێزو، بە خەونى زیندووکردنەوەى سنوورو قەڵەمڕەوى دەوڵەتى ساسانى، هێرش‌و لەشکر کێشى بۆ ناوچەکانى رۆژئاواى ئێران دەست پێکردووە[14]، لە دواى چەندین شەڕو کوشتارى خوێناوى توانى لە ساڵى (٩٠٩) کۆچیدا میرایەتى صارم بەگى کوڕى میر سەیفەدین لە موکریان تێکبداو دەست بەسەر پایتەختەکەى (ورمێ)و شنۆ دابگرێت‌و تاڵان‌و برۆیەکى زۆرى تیادا بەرپابکات[15].

---

(١١) فەرمانڕەوایى موکریان: ٢٧ - ٣٠

(١٢) فەرمانڕەوایى موکریان: ٢٧ — ٣٠.

(١٣) سەرچاوەى پێشوو: ٣٤.

(١٤) کوردو عەجەم: ٢٥.

(١٥) کوردو کوردستان ، محمدامین زەکى: ١٥٩.

لەدوای یەکەمین شەڕی گەورەی نێوان عوسمانیو سەفەوی لە چاڵدێران (١٥١٤)، کوردستان بە گوێرەی سەنگو تەرازووی هێزەکانی ئەم دوو دەوڵەتە زلهێزە بۆ یەکەمین جار دابەش کراوە، میرنشینەکانی لای ڕۆژئاواو سەروو خوارووی کوردستان کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی رووکەشی دەوڵەتی عوسمانیو میرنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی وەکو، ئەردەلان، لورستان، موکریان کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عەجەم[١٦].

لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی کتێبی (فەرمانڕەوایی موکریان) ناوی یازدە پشت لە کوڕو نەوەو نەوەزاکانی میر سەیفەدین دەبات کە لەو ناوچەیەدا لەناو عێلو عەشیرەتەکانی موکریاندا دەسەڵاتدار بوونو میرو مەزنایەتیان کردووە[١٧]. بە کورتی مێژووی سەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی دەرحەق بە کورد، هەموو لاپەڕەکانی خوێنی لێدەتەکێ، محەمەد ئەمین زەکی لەو بارەوە دەڵێ: هەڵسوکەوتی شا ئیسماعیل دەرحەق بە کورد...هەڵسوکەوتێکی پڕ لە زوڵمو زۆرداری بوو، چونکە کوردەکان سونی مەزهەب بوون هەرگیز باوەڕو متمانەی پێنەدەکردن، لەهەر دەرفەتێکدا لە هەوڵی ئازاردانو فەوتاندنی کوردەکان دابووە.(١٨)

کردارو ڕەفتاری شا عەباسی یەکەم (١٥٨٧ — ١٦٢٩) لە ئاست کوردا لە هی ئەوانی پێشە خۆی باشتر نەبووە، هەر لە سەردەمانی ئەودابوو کە هێرشێکی بەربڵاو کرایە سەر ناوچەکانی کوردستانی موکریان کە خۆی سەرکردایەتی دەکردو بۆ ماوەی چەند مانگان قەڵای دمدمیان گەمارۆدا، خەڵکی ناوچەکە زۆر بە سەختی داکۆکیان لە خاكو ماڵو سامانو ئابرووی خۆیان کردو لاپەڕەیەکی زێڕینیان لە مێژووی نەتەوەکەیاندا تۆمارکردووە کە نموونەی خۆبەخت کردنو مەردایەتی بووە، ڕووداوەکانی قەڵای دمدم لەو ڕۆژەوە بۆتە وێردی سەر زمانی خەڵکی کوردو داستانێکی قارەمانانەی لێکەوتۆتەوە کە پشتاوپشت گوێزراوەتەوەو تا ئێستاش حیکایەت خوانو بەیت بێژەکان، بەتایبەتی لە ناوچەی موکریان بە زیندوویی پاراستوویانە، لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا (ئۆسکارمان) لە زمانی بەیت بێژێکی

---

(١٦) کوردو عەجەم: ١٥١.

(١٧) فەرمانڕەوایی موکریان: ٣٣-٥٧

(١٨) کوردو کوردستان ، محمدامین زەکی: ٦٠.

موکریان (ڕەحمان بەکری سابلاغی) تۆماری کردووە[19].

هێشتا دمدم خوێنی قوربانییەکانی لێ دەچۆڕا کە شا عەباس هەڵیکوتایە سەر خێڵی موکریو کەوتە کوشتاریان و بە هەزاران ژنو منداڵیشی لێ یەخسیرکردنو (15 هەزار) خێزانی کوردی لە دانیشتوانی ناوچەکانی باکوری موکریانیش بەرەو خۆراسان گواستەوە[20]. کەواتە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا سەرباری کوشتو بڕی چەند بارەی خێڵو هۆزەکانی موکریان کە لە کتێبە مێژووییەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە[21]. سیاسەتێکی تازە سەبارەت بە ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژئاوای ئێران پەیڕەو کراوە کە ئەمیش بریتی بووە لە ڕاگواستنو پەرتو دوورخستنەوەی خێڵە کوردەکانو، نیشتەجێکردنی عێڵو هۆزەکانی تورکو تورکمانو مەغۆڵو ئازەری لە ناوچەکەدا. بە واتەیەکی تر یەکەمین هەوڵەکانی گۆڕینی هەلومەرجی دیمۆگرافی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی سەفەویدا دەستی پێکردووە.[22] سیاسەتێك کە لە سەردەمی پاشایەتی قاجارو بنەماڵەی پەهلەویش لە ئێران هەر درێژەی پێدراوەو تا

---

(19) بڕوانە:

تحفة مظفرية، گرداری ئوسکارمان، پێشەکیو ساغکردنەوەی هێمن موکریانی، بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1975.

- بەو هۆیەی کە کارەساتی دمدم ڕووداوێکی گەورە بووە لە مێژووی نەتەوەی کوردا، بۆیە مامۆستا هێمن لە پێشەکی کتێبەکەدا گەڕانەوەی سەروو بەری گەمارۆدانو هەموو ڕووداوەکانی پاش گیرانی قەڵاکەی لە کتێبەکەی (ئەسکەندەر بەگی تورکمانی)، ( عالم آراى عباسي)دا وەرگێڕاوەتە سەر کوردیو تۆماری کردووە، چونکێ باشترین شایەدییە لەسەر ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە، لەکاتێکدا (ئەسکەندەر بەگ) خۆی کاتبو مێژوونوسی شا عەباس بووە لەو هێرشەشدا بۆ سەر دمدم خۆی هاوڕێیەتی شا عەباسی کردووە. نووسەرانی کورد بایەخی زۆریان بەم ڕووداوە مێژووییە داوەو چەند شاکارێکی ئەدەبییان لێداهێناوە، وەکو ڕۆمانی (قەڵای دمدم)ی عەرەب شامیلۆفو چیرۆکی (قەڵای دمدم)ی مصطفى صالح كريمو( قارەمانێتی کورد لە داستانی قەڵای دمدم)...ئامادەکردنی ئۆردوخانی جەلیل...تاد.

(20) دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر: 231.

(21) بڕوانە:

- مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: 356.

- کوردو عەجەم: 60 - 92.

- کوردو کوردستان، نیکیتین: 483.

(22) کورد و عەجەم: 24.

ئێستاش. هەر ئەم ناوچەیە بە هۆی هەڵکەوتی جیۆگرافییەوە کە دەکەوێتە سەر تخووبەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران‌و عوسمانی، ببوو بە یەکێك لە مەیدانەکانی جەنگی نێوان ئەو دوو هێزەو شارێگەی لەشکر کێشییەکانی رۆم‌و عەجەم بۆ سەریەکتری لە سەدەکانی ١٧ و١٨ کە بوو بە مایەی گەورەترین نەهامەتی‌و کاولکاری‌و ماڵوێرانی بۆ سەر ئەم مەڵبەندە لەمێژووی نوێدا، دوای ئەوەی رووسەکانیش هاتنە مەیدان‌و تێکەڵاوی ئەو شەڕو ململانەیە بوون کە لە نێوان هێزەکانی رۆم‌و عەجەمدا لەسەر دەسەڵات گرتنە دەستی ئەو ناوچانەدا لە ئارادابوو.

لە چارەگی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا دەرباری قاجاری میرنشینە ئۆتۆنۆمییەکانی کوردستانی ئێرانی لە بەینبرد، لەوانە میرنشینی موکریان‌و دەسەڵاتی ناوەندی عەجەمیان تێدا دامەزراند. دەسەڵاتی راستەوخۆی دەوڵەتی داگیرکەری بێگانە بەسەر کوردستانەوە کە بە زۆرو هێزی چەکداری سەرکوتکەریش پارێزگاری لێدەکرا، هیچ پێشوەچوونێکی لەباری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و فەرهەنگییەوە بۆ کوردستان پێنەبوو، بەڵکو باری زوڵم‌و چەوسانەوەی خەڵکەکەی قورستر کردو چەوسانەوەی نەتەوەیی‌و مەزهەبیش بە تایبەت لە سەردەمی قاجارەکاندا بوو بە سەرباری ئەو نەهامەتیانە.

لە سەدەی نۆزدەمین هەست‌و بیری نەتەوەیی لەلای کوردان روو لە بوژانەوەو پێگەیشتن بوو، لە کاتێکدا میرانی ئەردەلان چ لە رێگەی خزمایەتی‌و زەماوەندی سیاسییەوە بێت چ لە رێگەی خۆنزیك کردنەوەیان بێت لە ئاینزای شیعە کە ئاینزای دەرباری ئێران بوو، توانیان پێگەو هەڵکەوتی سیاسی خۆیان لە ئێراندا پتەوتر بکەن. گەورەو میرو مەزنەکانی موکریان بەهۆی لاوازی پەیوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتی مەرکەزی‌و پەیڕەوکردنیان لە ئاینزای سونە هەمیشە لە سیاسەتەکانی عوسمانی نزیکتربوون‌و تێکەڵاویان لەگەڵ ناوەندەکانی دەسەڵات لە کوردستانی عوسمانییدا لە برەوتر بوو. کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمیش بە چەرخی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی دەژمێردرێت بەتایبەتی لە ناوەندو ناوچەکانی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا، هەر بۆیە یەکێك لە مەزنترین راپەڕینەکانی کورد لە چارەگی دوایی سەدەی نۆزدەیەمدا کە کاریگەری زۆری بەسەر هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان‌و بەتایبەتی ناوچەی موکریانیش داهەبوو، شۆڕش‌و راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بوو لە ساڵانی (١٨٨٠ – ١٨٨٣ ) لە پێناوی ئازادی‌و سەربەخۆیی

کوردستان[٢٣]. بەو هۆیەوەش کە نەهری یەکێك لە گەورەترین مەڵبەندەکانی رابەرایەتیی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستان پێکدەهێناو ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی موکریان لە ریزی خەلیفەو موریدو مەحسوبەکانی شێخی نەهری دابوون، هەمیشەش خەلیفەو نێردراوەکانی لەو ناوچەیەدا دەسوڕانەوەو شێخ لە هەوڵی ئەوەدابوو کە هەموو هۆزە کوردەکان یەکبخاتو ناوچەیەکی فراوان لەسەر سنووری تورکیاو ئێرانو روسیا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[٢٤]. هۆزە کوردەکانی ناوچەی موکری رۆڵێکی مەزنیان پێ سپێردرابوو لە جێبەجێکردنی نەخشەو پلانی شێخ بۆ شۆڕشو راپەڕین لە دژی دەسەڵاتی ئێران. دوابەدوای کورت هێنانی راپەڕینەکەش هێزەکانی سوپای ئێران بە دەستێکی رەشو دەروونێکی رقاوی کەوتنە گیانی کوردەکانو بێ بەزەییانە تۆڵەیان لێ سەندنەوە. بە درێژایی ئەو رێگاوبانانەی پیادا دەڕۆیشتن گوندەکانی کوردیان تالان دەکردو دەسووتاند، هەر کوردێکیان بەدەست بکەوتایە دەیانکوشتو بەزەییان بە منداڵو ژنو پیرەکاندا نەدەهاتەوە[٢٥].

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا کورد لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران لە دژی زوڵمو زۆری کاربەدەستانی عەجەم هەمیشە لە بەرگریو بەرهەڵستی دابوون. هەستی رزگاریو بزووتنەوەی نیشتمانی هەموو کوردستانی داگرتبوو، فەرمانڕەوایانی حکومەتی شا لە ناوچەکانی موکریان ناچاربوون داخوازییەکانی گەلی کورد لەبەرچاوبگرن. هەروەها وڵاتانی ئەورووپاش لە وێنەی روسیاو بەریتانیاو ئەڵمانیاو ئەمریکا ناچاربوون بایەخێکی زیاتر بەم ناوچانەو بە کورد بدەن، بۆیە نێردراوو رابەرو مسیونێرەکانیان بەوناوەدا بڵاوکردەوە[٢٦] بەو مەبەستەی نفوزی خۆیان لە کوردستان بەهێزتر بکەن.

لەساڵانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا جولانەوەیەکی بەهێزی ریفۆرم خوازی، کە لە مێژووی نوێی ئێراندا بە (شۆرشی مەشروتە ١٩٠٥- ١٩١١) ناسراوە هەموو وڵاتی تەنیەوە، ئەم جولانەوەیە لە ناوچەکانی ئازەربایجاندا مەشخەڵو بڵێسەکەی بەهێزبوو بەجۆرێك کە دەسەڵاتو حوکمڕانی خەڵك بەرپابوو شوێنی دەسەڵاتی

---

(٢٣) الاكراد ، ملاحظات وانطباعات: ٢٧.

(٢٤) خەبات لە رێی کوردستان: ١٧٥.

(٢٥) راپەرینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠ : ١٣٨.

(٢٦) خەبات لە رێی کوردستان: ٢١٢

ناوەندی گرتەوە. لەو سەردەمەدا خەباتی خەڵکی کوردستان پێی نایە قۆناغێکی تازە، ئەویش بریتی بوو لە پێکهێنانی کۆمەڵەو کۆڕو کۆمەڵی سیاسیو رووناکبیریو کۆمەڵایەتی.

هەر لەو سەردەمەشدا بوو کە دەوڵەتانی بیانی وەکو روسیاو بەریتانیا هەریەك نفوزو دەسەڵاتی بەسەر بەشێکی وڵاتەکەدا گرتبوو، لەکاتی هەڵایسانی یەکەمین بڵێسەی جەنگی جیهانیشدا ناوچەکانی خۆرئاوای ئێران بوو بە مەیدانی شەڕو پێکدادانو کێشمەکێشی نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی. دەسەڵاتی ناوەندی وڵاتیش بە بیانووی بێ لایەنی لە شەڕدا هیچ تواناو دەسەڵاتێکی بەسەر هیچ لایەنێکی وڵاتەکەدا نەمابوو[٢٧].

## ٤. ژیانی خوێندەواریو رووناکبیری (کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم):

بارودۆخی سروشتی و جیۆگرافی، هەلومەرجی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی، لە ریزی ئەو هۆکارانە بوون کە ناوچەکانی موکریانیان وەکو ناوچەیەکی خێڵەکیو عەشایەری هێشتۆتەوە، هۆزەکان زیاتر بە ژیانی ئاژەڵداریو نیوە کۆچەریەوە خەریکبوون، بۆیە هەڵکەوتنی شارو بازێڕی ئاوەدانو دروستبوونی توێژی خەڵکی شارنشینو شارستانی لەم ناوچانە بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی میرنشینی ئەردەلان بە نموونە، تارادەیەك دواکەوتووە. شارو شارۆچکەکانی مەهاباد، شنۆ، سەردەشت، بۆکان، نەغەدە لە سەرەتادا وەکو بازاڕێك بۆ ئاڵوگۆڕو ساغکردنەوەی بەروبوومی ئاژەڵیو کشتوکاڵییەوە هاتنەکایەوە[٢٨].

گەورەترین کەسایەتی موکریان لە مێژووی نوێدا بوداغ سوڵتانی نەوەی میر سەیفەدین بەگی موکریانە، بوداغ سوڵتانی کوڕی شێرە بەگ (١٦٠٨ – ١٦٨٩) کە بە سەردارو بابە گەورەی زنجیرەی دووەمی میرانی موکری دادەنرێت، یەکەمین کەسێك بووە کە شاری (سابلاغ)ی کردۆتە پایتەختو بنکەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی میرایەتیەکەیو بۆ ماوەی ٦٠ ساڵ حوکمڕانی کردووە، هەر لەسەر دەستی ئەویش شارەکە ئاوەدان کراوەتەوەو چەند شوێنەوارێکی ناوداری ئەو سەردەمە تاوەکو ئەمڕۆ

---

(٢٧) کورد و عەجەم : ١٩٩.

(٢٨) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ٤٥.

له شارەکەدا ماون، لەوانە (مەسجدی جامع – یا مزگەوتی سوور)ی مهاباد کە بە یەکێك لە مەزنترین شوێنەواری ئاینیو ڕووناکبیری شارەکە دەژمێردریو ڕۆڵێکی مەزنی لەو بوارانەشدا گێڕاوە[29]. هەر لەو ڕۆژگارەدا (مەلاجامی) دەبێتە پێش نوێژو وتارخوێنو وانەبێژی زانستو زانیاریەکانی ئاینیو لە مهاباد جێگیردەبێت[30]. لەپاڵ کردنەوەی چەند مەدرەسەو خوێندنگاو کتێبخانەو مەنزلگای حەوانەوەی خەڵکی هەژارو بێ دەرامەت، لەپاڵ ئەوەشدا پردی سوورو پردی لوجو پردی دارەڵك لە ڕۆژگاری ئەودا دروست کراون. هەروەها ئەندازەیەکی زۆری موڵكو زەوی وەکو وەقف بۆ خەرجیو ئاوەدانی ئەو شوێنانە تەرخانکردبوو[31].

مهاباد کە هەر لەسەرەتاوە بنکەو پێگەی والی نشینی ناوچەی موکریان بووە لە ڕۆژگاری هێرشی مەغۆل بۆ ناوچەکەو بەخاتری هەبوونی سەرچاوەو کانیو ئاوێکی سازگار لە کەناری ئەو ئاواییەدا ناوەکەی لە نێو خەڵکدا بە (سوغ بلاغ – سابلاغ) ڕۆیشتووەو، لە نووسراوو موکاتەباتی میریدا بە (ساوجبۆلاغی موکری) ناوبراوە تا لەگەڵ ساوجبۆلاغی ناوچەی قەزوین تێکەڵ نەبێت. تا لە سەرەتای دەورەی پەهلەویو لەسەر پێشنیاری دکتۆر ڕەشید یاسمی (ئەندامی کۆڕی زانیاریو مامۆستای دانیشگای تاران) لە ساڵی (١٣١٥/١٩٣٦) ناوی (مهاباد)ی بۆ گێڕدراوەتەوە[32].

سەرانی هۆزو تایفەکانی دەوروبەری مهاباد ڕوویان کردۆتە شارەکەو بۆ بنیاتنانو ئاوەدانی شارەکەدا تێکۆشاونو چەندین کۆشكو سەراو مزگەوتو حەمامو باغاتو دوکانو قەیسەرییان تیادا دروست کردووە.[33] لە سەرەتای سەدەی بیستدا شاری

(٢٩) مهابادو کورتە مێژوویەك: ٢١ ، ٢٢.

(٣٠) ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی: ٨.

(٣١) خاطرات دکتر هاشم شیرازی: ٢٧.

(٣٢) گۆیا ئەم نازناوەش لە (مەئاباد، مادئاباد، مهاباد)ەوە هاتووە کەلە سەردەمی مادەکان باوبووە.

بڕوانە:

- تاریخ مهاباد: ١٢.

– مهاباد و کورتە مێژوویەك: ٧٤.

– خاطرات دکتر هاشم شیرازی: ٤

(٣٣) ئاغاو خانو سەرۆك هۆزەکانی دەوروبەری مهاباد هەر یەکێکیان لەپاڵ ئەوەدا کە خانووبەرەو کۆشكو سەرایەکی لە شارەکەدا بۆ خۆی دروست دەکرد، مزگەوتو مەدرەسەیەکی◄

سابلاغ (١٣) مزگەوتو (١٦) مەدرەسەو (٢) تەکیەو خانەقایەكو (٤) حەمامو کەنیشتەیەكو کلێسایەکی لێبووە، لەپاڵ (٦) کاروانسەراو (١٠) باغی گەورە.[٣٤] مهاباد ناوەندی تیجارەتو بازرگانی بووە لەگەڵ ناوەندە بازرگانییەکانی ئێرانو روسیاو عیراقو تورکیا پەیوەست بووە. لە دوای جەنگی یەکەم کونسولخانەی ئینگلیزو روسو ئەمریکا لە شارەکەدا هەبوون.[٣٥] کە ئەمەش بایەخی ئەو شارە لەرووی ئابووریو سیاسییەوە نیشاندەدات. لە هەموو دێهاتو شارۆچکەکانی لەلایەن خاوەن موڵكو دەستڕۆیشتووەکانەوە، مەدرەسەی ئاینیو قوتابخانە بۆ خوێندنو بەدەستهێنانی زانیاری دامەزرێندراوە، ناوچەکانی موکریان بەتایبەت شاری سابلاغ سەبارەت بە خوێندنو زانستەکانی ئیسلامەتی لە سەردەمی پێشوودا بە یەکێك لە مەڵبەندە ناودارەکانی عیلمو زانست لە کوردستاندا ناسراوە.[٣٦] کوردی موکریان لەباری خوێندنو زانستو شیعرو ئەدەبو هونەرو خەتخۆشیدا ئاشناو پسپۆڕن.

میرزا عبدالرحیمی وەفایی (١٨٤٤ – ١٩٠٢) کە یەکێك لە ناودارترین شاعیرانی کوردی ناوچەی موکریانە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، موریدو مەنسوبێکی هەرە لەپێشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بووەو بۆ ماوەی چواردە ساڵان میرزاو کاتبو رازگری شێخو مامۆستای منداڵەکانی بووە، شیعرو غەزەلە ناسكو پاراوەکانی ئاوێنەیەکی ئەو عەشقو ئەوینە بەسۆزەیە کە لە نێوان ئەوو شێخی نەهریدا هەبووە.

وەفایی لەپاڵ دەسەڵاتی هونەرو شیعرو ئەدەبدا مرۆڤێکی پایەبەرزو رووناکبیرێکی گەورە بووە، بیرەوەرییەکانی خۆیشی سەبارەت بە ژیانو رووداوەکانی ئەو سەردەمە تۆمارکردووە کە ئەمەیان رەنگە کارێکی بێ پێشینە بێت لە مێژووی ئەدەبی

---

◄◄ ئاینیشی بەناوی خۆیەوە دەکردەوەو کۆمەڵێك موڵكو ماڵو زەویشی دەکردە وەقف بۆ دابینکردنی خەرجیو مەسروفاتی مزگەوتو مەدرەسەکەی، لە نموونەی مزگەوتەکانی: هەباس ئاغا، رۆستەم بەگ، سەید بایەزید، قازی، سەید نیزامی...تاد.

ـ بڕوانە: تاریخ مهاباد: ١٣٧.

(٣٤) کوردستانی موکریان: ٣٤، ٣٥.

(٣٥) تاریخ مهاباد: ١٣٦.

(٣٦) کوردستانی موکریان: ٢٩.

کوردیدا.[٣٧] ئەوکاتەی کە لە مهاباد ژیاوە مەدرەسەیەکی هەبووەو شاگردەکانی تیادا فێری زمانو ئەدەبو ئاوازو خەتخۆشی کردووە.

لەسەرو بەندی سەدەی بیستەمدا مهاباد (٧٠٠) فەقێ یا خوێندکاری زانستی ئاینی هەبووە کە بەشی زۆریان هی ناوچەکانی موکریانو شوێنەکانی دیکەی کوردستان بوون، جگە لەوەی لەهەر گەڕەکێکی شارەکەدا قوتابخانەیەك هەبووە کە میرزایەك بەڕێوەی بردووەو دەرسی زمانو ئەدەبو خەتو خۆشنووسی تیادا گۆتراوەتەوە.[٣٨]

موکریان زێدگاو مەڵبەندی پێگەیشتنی سەدان مەلاو زاناو شاعیرو عاریفی نێودارە، هەر تەنیا لە مهاباد بە دەیان پیاوی ناوداری لێ هەڵکەوتووە لە وێنەی، مەلا جامی چۆڕی مەریوانی، مەلا عەلی پیرەبابی، مەلا حوسێنی مەجدی، سەیف ئەلقوزات، میرزا فەتاحی قازی، پێشەوا قازی محەمەد، مستەفا شەوقی، مەلا عەبدولقادری مەولەوی، داماو سەید حوسێنی حوزنی موکریانی، عەبدولڕەحمان گیوی موکریانی، میرزا سەلیمی موکریانی، حاجی مەلا عەبدوڵڵای ئەحمەدیان، مەلا سالحی ئیبراهیمی، مەلا قادری مودەڕیسی، هێمنو مەلا غەفووری حافزی مهابادی...تاد.

لە شارستانی سەردەشت زانایانی نێودارو پایەبەرزی وەکو ئیبنولحاج، مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی، مەلا عومەری سەردەشتی، مەلا کەریمی فیدایی، مەلا ئەحمەدو محەمەدی شەلماشی...لێ پێگەیشتوون. لە شنۆو خانێدا، مەلا عەبدولعەزیزی شنۆیی، سەید تاج ئەلدینی شێخی زەنبیلی، قازی محەمەد خزری، ئەمین شنۆیی، مەلا ڕەسولی ئەدیب، پێگەیشتوون. لە بۆکان دەیان شاعیرو زاناو دانای ناودار دەرکەوتوون لە وێنەی، قزلچییەکانو تورجانی زادەو وەلزییەکانو سەیدەکانی زەنبیلو شێخانی بورهانو شاعیرانی وەکو ئەحمەدی کۆرو مەلا مارفو ئەدەبو حەقیقیو هەژارو هێدیو ئیمامیو جەوهەریو سوارە...لەپاڵ دەیان هونەرمەندی خۆشنووسو خۆشخوانی بەهرەوەر.[٣٩] سەقزو بانە مەڵبەندی شاعیران وزانایانی وەکو، پاکی، تۆفیقی ئەمینیان، زاری، سولتانولعورەفا، شەیدا، سالح، عاشق، فاتحی مەجدی، فیدا، فەقیهی، کامل، کرمانج، کەوسەر، مەلیکوکەلامی مەجدی، موخلیس، مەفتون، نافع،

---

(٣٧) بیرەوەرییەکانی وەفایی: ٢٨.

(٣٨) تاریخ مهاباد: ١٣٨.

(٣٩) تاریخ فرهنگ وادب مکریان، جلد ١، ٢.

وەجدی، وەفا... هی دیکە بووە.[٤٠] سیماو خەسڵەتی دیارو ئاشکرای زانستو ئەدەبیاتو فەرهەنگی ئەم ناوچەیە ئەوەیە کە بە توندی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری کولتوور و ئەدەبیاتی ئێرانییەوە، بۆیە بەشی زۆری بەرهەمو شوێنەواری زانستیو ئەدەبی ئەم ناوچەیە بەتایبەت لەسەر دەمانی پێشوودا بە زمانی عەرەبی، یاخود فارسی تۆمارکراونو تەنها بەشێکیان بە زمانی کوردییە. تەنانەت نووسەرێکی وەکو سەید عەبدولحەمیدی سجادی لە کتێبی (شاعران کرد پارسی گوی)دا ناوی زیاتر لە (٩٠٠) شاعیرو ئەدیبو هونەرمەندی کوردی بردووە کە شیعرو بەرهەمەکانیان بە زمانی فارسی گوتووەو تۆمار کردووە.[٤١] ئەڵبەتە یەکێك لە هۆکارە هەرە بنەڕەتییەکانی ئەم حاڵەتە بۆ دابەشبوونی سیاسی کوردستانو کورد دەگەڕێتەوە، کە زمانو فەرهەنگێکی جیاواز لە زمانو فەرهەنگ سروشتی خۆی بەسەریدا سەپێندراوە.[٤٢] وەکو چۆن دابەشکردنو دابڕانی بەشەکانی خاکی کوردستان لەیەکتری کاریکردۆتە سەر باری خوێندەواری ئەو بەشەی لەگەڵیاندا دەژیاو زمانو ئەدەبی کوردی لەو وڵاتانەدا بوون بە فەرهەنگێکی پلەی دووەم.[٤٣] لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەستەیەك لە ڕێبەرانی ناسیۆنالستی کوردی کە نەوەی خانەدانو میرەکانی بەدرخانیو سۆرانو بۆتانو بابانو موکریان بوون، لەسەر بنەمایەکی تازە درێژەیان بە خەباتو تێکۆشان داوە کە ئەویش پەرەپێدانی بزووتنەوەی سیاسی – فەرهەنگی بوو لە کوردستاندا، بۆیە لەلایەك کۆڕو کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردی دروستبوونو لەلایەك خەباتی کولتووریو خوێندەواری کوردییان بووژاندۆتەوە. ئەوە بوو لە نیسانی ساڵی (١٨٩٨)دا یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بەناوی (کوردستان)ەوە بڵاوکرایەوە کە لەو ڕۆژگارەدا وەکو چرایەك بوو لە پێناو زیندووکردنەوەی زمانو کولتوورو گیانی نەتەوەیی[٤٤].

لە ڕۆژگاری شۆڕشی دەستووری (مەشروتە) لە ئێران (١٩٠٥ –١٩١١) لەگەڵ ئەوەشدا ناوچەکانی موکریان مەڵبەندی سەرەکی هۆزەکانی کوردو، سەرۆك هۆزەکانیش

---

(٤٠) گلزار شاعرانی کردستان، سید عبدالحمید حیرت سجادی.

(٤١) شاعران کرد پارسی گوی، سید عبدالحمید حیرت سجادی.

(٤٢) کوردو عەجەم: ١٥٧.

(٤٣) شیعری کوردی/ سیاسەت، کۆمەڵایەتی، کوردایەتی، گ/ڕۆشنبیری کوردستانی، ژ/ ١: ٥.

(٤٤) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ١٢٧.

سێبەری سیاسییان بەسەر خەڵکە بێ دەرەتانەکەوە خستو قورسو زیاتریش بە لایەنگیری لە دەوڵەتی مەرکەزی بوو، بەڵام لەناو شارە گەورەکانی موکریاندا وەکو مهابادو سەقزو بۆکان چەند ئەنجومەنێك لە دەستوورخوازان بەمەبەستی گۆڕان لە ستراکتووری دەسەڵاتداریەتیو چاکسازی سیاسیو کۆمەڵایەتی پێکهاتبوو، ئەڵبەتە لە کوردستانیش زانایانو رووناکبیران، تەبای شارەکانی دیکەی ئێران، رۆڵی سەرکردایەتیو رابەرایەتیکردنی ئەو ئەنجومەنانەیان لە ئەستۆوە گرتبوو. ئەم ئەنجومەنانە، کە لە شارەکانی کوردستان پێکهاتبوون رۆڵێکی گرنگیان لە هۆشیارکردنەوەی خەڵكو داکۆکیکردن لە وەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد لە ئێراندا دەبینی.[٤٥] ئەنجومەنی شاری سەقز کە لەژێر سەرپەرشتی شاعیرو دادوەری ناسراو مەلا محەمەدی کەریم بوو، رۆڵێکی گرنگی بینی لە هاندانی خەڵکی سەقز بۆئەوەی پێوەندی بکەن بە ئەنجومەنو هاریکاری دەستوورخوازان بکەن، هەروەها لە شاری سابلاغ قازی فەتاحی مامی باوکی قازی محەمەد، ئەنجومەنی دەستوورخوازانی بۆ ئەو شارە دامەزراندبوو.[٤٦] یەکێك لەرووە هەرە دیارەکانی خەباتی رووناکبیری کۆمەڵەو رێکخراوو پیاوانی ناوداری کوردستان لەو سەردەمەدا، بایەخدان بە بڵاوکردنەوەی خوێندنو خوێندەواری بووە لەناو گەنجانو لاوانی کورد لەپاڵ خزمەتکردنی زمانو ئەدەبی کوردی. لەو مەیدانەدا خەباتی عەبدولڕەزاق بەدرخان لەبەرچاوە کە لە سالانی بەر لەجەنگو لە (١٩١٣)دا یەکەمین قوتابخانەی لە شاری (خۆی) بۆ منداڵانی کورد کردۆتەوەو کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری دامەزراندووەو نیازیشی وابووە کە چاپخانەیەکیش بۆ کۆمەڵەکە دابنێو رۆژنامەیەکیش بەو ناوەوە دەربکات.[٤٧] لە دەستپێکی جەنگی جیهانیو تەنینەوەی یەکەمین بڵێسەی شەڕ لە ناوچەکانی موکریان، هەمدیسان پیاوانی زاناو رووناکبیری کورد بەئاشکراکردنی بوختانو فەندوفێڵی دەوڵەتی عوسمانی، کە پڕوپاگەندەی (جیهاد)یان لەناو خەڵکدا بڵاودەکردەوە، بەگژ دەستدرێژیو زۆرداری دەسەڵاتی عوسمانیو رووسەکاندا چوونەتەوە لەو ناوەدا شێخ بابا سەعیدی غەوسابادی ناسراو بە (شێخی شەهید/١٢٧٥ - ١٣٣٣ کۆچی) عارفو شاعیرو نیشتمانپەروەری کورد ئەو راستیەی ئاشکراکرد کە

---

(٤٥) دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر: ٢٤١.

(٤٦) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ١٤٣.

(٤٧) کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا: ٣٧ — ٣٨.

(ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام تـەنها بیانوویەکـە بەدەسـتی ئیمپراتـۆری نەخۆشـی عوسمانییەوەو تەنیا بۆ ماونەوەی خۆیو رزگاری بوونی کردوویەتی بە ئـالا).[48] شێخ بابا کۆمەڵەیەکیشی لە زاناو رووناکبیرو نیشتمانپەروەرانی ناوچەکەی لە دەوری خۆی کـۆ کردبـۆوە بـۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان لـە هـەوڵی بەدەسـتهێنانی پـشتیوانی رووسـەکانیش دابـووە.[49] ئینجا هـەر لەسـەر ئـەوەی کـە شـێخ بابـا فـەتوای جیهـادی عوسمانییـەکانی بـە فەنـدوفیڵو مـانۆڕێکی سیاسـی دەدایـە قەڵـەم، بـە پێـچەوانەی خواسـتی ئـەوان نێـوانو پەیوەنـدی باشیـشی لەگـەڵ مەسـیحییەکاندا هـەبوو، عوسمانییەکان گرتیانو لە زستانی (١٩١٦)دا لە داریان دا.[50]

لـەو رۆژگـاردا یـەکێك لـە نـاودارترین بنەماڵـە ناسـراوەکانی ناوچـەی موکریـان کـە بنەماڵەی(قازی)یە، لەسەر شانۆی رێبەرایەتیی نیشتمانیو ئایینیو کولتـووری خـەڵکی ئەو ناوچەیە بـەدیار دەکـەوێتو کەسایەتی ناسـراوی ئـەو بنەماڵەیـە لـەو رۆژگـارەدا (میرزا فەتاحی قازی) (١٨٣٢ - ١٩١٦) هەڵدەکـەوێت. ئـەم کەڵـە مێـردە بـەو هۆیـەی کـە هیچ کات لەگەڵ بەدرەفتاریو کـرداری شـاهانی قاجار دەرهـەق بـە خـەڵکی ناوچـەکە سازشی نەکردووەو نەگونجاوە، بۆیە بۆ مـاوەی دوازدە سـاڵان لـە رۆژگـاری حـوکمڕانی ناسرەدین شـاو موزەفـەر شـای قاجـاردا بـۆ تـاران دوور دەخرێتـەوەو لـەوی زینـدانیو دەست بەسەر دەکرێت. دوای گەڕانەوەشی لـە رۆژانـی گـەرمبوونی بلێسەی شـەڕو لـە ئـەنجامی داکـۆکیو بـەرگریکردنی لـە خـەڵکی شـاری مهابـاد لەبەرامبـەر هێـرشو دەسـتدرێژی لەشـکریانی رووس بـۆ سـەر شـارەکە لـە مەیـدانی نەبـەردو پێکدادانـدا شەهید دەبێت.[51]

لە ساڵانی یەکـەمین جـەنگی جیهانیـدا (١٩١٤-١٩١٨) شـۆڕشو راپـەڕینی سمکـۆی شـکاك (١٩١٨ – ١٩٣٠) ناوچـەکانی موکریـانیش دەخاتـە ژێـر رکێفـی دەسـەڵاتو کاریگـەریی خـۆیو لـەدوای بڕانـەوەی شـەڕو لـە سـاڵی ١٩٢١دا یەکـەمین رۆژنامـەی کـوردی لـە کوردستانی ئێران بەناوی (رۆژی کورد) لەشاری ورمێ چاپو بڵاو دەبێتەوە.[52]

---

(٤٨) شێخ بابا –شێخی شەهید، گ/ مهاباد، ژ/ ٩: ١٢.

(٤٩) صفحات من تاریخ ایران الحدیث والمعاصر: ٢٤٦.

(٥٠) ایرانی کە من شناختەام: ٢٣٣.

(٥١) تاریخچە خانوادە قاضی در ولایت موکری: ٦٢-٦٦.

(٥٢) پاشەرۆك: ٤٠.

باسی باری خوێندەواری‌و زانستی‌و ڕووناکبیری لە ناوچەی موکریان بەبێ ئاماژەکردن بە ڕۆڵی ڕێبەرایەتی‌و پەروەردەیی هەردوو ڕێبازو هەردوو خانەقای (شێخی بورهان لە دێی شەرەفکەندو شێخانی زەنبیل لەئاوایی زەنبیل) کارێکی ناتەواوە. ئەم دوو شوێنە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم‌و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لەناوچەی موکریاندا ڕۆڵێکی مەزن‌و کاریگەریان گێڕاوە لە بواری زانستی‌و ئایینی‌و کۆمەڵایەتیدا. پێگەی ڕێبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی مەلا یوسفی شێخ شەمسەدینی بورهانی لە ناوچەکەدا دامەزراوەو پەرەی سەندووە، ناوبراو یەکێکە لە شێخانی ناوداری کوردستان‌و خەلیفەی شێخ سیراجەدینی نەقشبەندی بووە، بەشێکی زۆری خەڵکانی ناوچەکانی کوردستانی موکریان تا دەگاتە سنوورەکانی ئارارات‌و خۆی‌و تاڵش‌و سەلماس پەیڕەویان لەو زاتە کردووە. خانەقای شێخی بورهان لە دێی شەرەفکەندی نێوان مهابادو بۆکان، بەدرێژایی ئەو ڕۆژگارە خزمەتێکی شایستەی لە پێناوی پەروەردەو ڕێبەریکردن بۆ کاری چاکەو ڕێگای ڕاست پێشکەش بە خەڵکی ناوچەکە کردووە.[٥٣] بەشی زۆری پیاوانی زاناو داناو ڕووناکبیرانی ئەو ناوچەیە یا لە ڕیزی هۆگرو هەوادارانی خانەقاو ڕێبازی شێخی بورهان بوون یا لە خانەقادا شاگردو فەقێ بوون‌و لەرێگای فێربوون‌و پێگەیشتندا لەوێ بەهرەیان وەرگرتووەو سوودمەندبوون. لەوانە بەشێك لە ئەدیب‌و شاعیرانی ناوداری ناوچەی موکریان لە ڕیزی موریدو مەنسوبانی ئەو زاتەبوون لەوێنەی: سەید محمد سعیدی نورانی، حەریق، میسباحودیوانی (ئەدەب)، عەلی بەگ سالار سەعیدی حەیدەری، میرزا سەلیمی موکری، سەیفولقوزات‌و...هی دیکەش.[٥٤]

ئەوەی دووەم خانەقاو مەدرەسەی شێخانی زەنبیلە، کە لەسەر دەستی سەید عەبدولکەریمی زەنبیلی بنیاتنەرو سەرداری سەرجەلەی شێخانی زەنبیل دامەزرێندراوە. ئەم بنەماڵەیە لە پەروەردەکردن‌و پێگەیاندنی خەڵکی ناوچەکە لەسەر ڕێگای هەق‌و ڕاستی‌و چاکە هەموو هەوڵ‌و کۆششێکیان بەخشیوە، شاعیرانی دیارو ناوداری ناوچەکە سەید محەمەد زەنبیلی‌و سەید کامیلی ئیمامی‌و سەید عەبدولقادری سیادەت لە ڕیزی کوڕو کوڕەزاکانی ئەو زاتەبوون.[٥٥]

---

(٥٣) تاریخچه خانواده قاضی: ٣١.

(٥٤) زندگینامەی عارف ربانی: ٢٧٠-٤٠٠.

(٥٥) تاریخ ادب فرهنگ مکریان، جلد اول: ٣٢١.

## باســـــی دووەم

### (١) بڵاوبوونەوەی شیعری کلاسیکی کوردی (قوتابخانەی کرمانجی خواروو) لە ناوچەی موکریان:

ئەدەبی کلاسیکی بەشێوەیەکی گشتی بەرهەمی شارو شارستانیەتو دروستبوونی قەوارەی سیاسیو پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتییە، زۆرجاریش لەپشت سەرهەڵدانو بووژانەوەو پەرەسەندنی جۆرەکانی ئەدەبی نەتەوەیەك، هۆکارێکی ئاینی یا مێژوویی یا سیاسی بەدی دەکرێت. بووژانەوەو پەرەسەندنی قوتابخانەی شیعری کرمانجی خواروو لە (سلێمانی) مەڵبەندی بابانەکان هەمان یاساو دەستوور دەگرێتەوە بەرەچاوکردنی جیاوازیی رووداوەکانو هەلومەرجی مێژوویی تایبەت بە نەتەوەی کورد. لە سەدەی نۆزدەیەمدا ناوچە کوردنشینەکانی ژێر قەڵەمڕەوی بابان جۆرێك لە یەکێتیو سەربەخۆیی بەخۆیەوە بینیوە. قەرەداغو شارەزوورو شارباژێڕ بەرەو گەشانەوەو پێشکەوتن‌و، ناوچەکانی کۆیەو سلێمانی وەکو پێگەو پایتەختی میرنشین روو لە ئاوابوون‌و پەرەسەندن بوون. گەلێك مزگەوتو تەکیەو خانەقاو مەدرەسەو دیوەخان ئاوابوون‌و مەلاو زاناو دانای زۆرو زەبەند لەو هەرێمەدا کۆدەبوونەوە، زانستو زانیاری‌و شیعرو ئەدەبو روناکبیری پەرەی سەندو پلەو پایەی بەرزی بەدەستهێنا. چەکەرەکردنی بیری نیشتیمان پەروەری‌و نەتەوەخوازی لەدەرباری ئاوەدانی هەندێ لە میرەکانی بابان‌و[٥٦] شانازی کردن بەزمان‌و دابو دەستوورو کەلتووری نەتەوەیی، بوونەتە هۆکارو بنەمای خولقان‌و سەرهەڵدان‌و

---

(٥٦) عەبدولڕەحمانی پاشای بابان کتێبێکی دەستنووسی ناوداری (صحيح البخاري) لە ساڵی (١٢١١ك-١٧٩٧ز) وەکو وەقفنامە لەدوای خۆی بۆ مەلاو زانایانی (کوردستان) بەجێهێشتووە، کەتیادا بە ئاشکرا سنووری قەڵەمڕەوی میرنشینی بابانی لە کوردستان دەستنیشان کردووە. بڕوانە:

- حاجی قادری کۆیی، ب١: ٢٠٧.

- هەروەها شاعیری میللی عەلی بەردەشانی بە شیعری رەوان‌و بەندو بەیتێکی نایاب باسی گیانی کوردایەتی‌و مێرخاسیی عەبدولڕحمانی پاشای بابانی کردووە.

بڕوانە:

- تحفه مظفرية ، ب٢: ٣٤٢.

رسكانی ڕێبازێكی ئەدەبی تازەو پێشكەوتوو، شان بەشانی فیكرو فەلسەفەو هونەرو ئەدەبیاتی گەلانی ڕۆژهەڵاتی دەورو دراوسێی كورد لە عەرەبو ڕۆمو عەجەم. كەڵە شاعیرانی بابان (نالی، سالم، كوردی) بەزمانی كوردی ئەو هونەرو ئەدەبەیان خستەڕوو، ئەمە لە ڕووی وریایی‌و هۆشیارییەوە بووە وەنەبێ هەر ڕووداوێكی ڕەمەكی بێ،[57] لە پێش ئەمانیشدا مەلای جزیری (١٥٦٧ — ١٦٤٠) لەژێر سێبەرو سایەی درەوشاوەی میرنشینی بۆتاندا هونەری غەزەل‌و قەسیدەی لەزمانی كوردیدا بە پۆپە گەیاندبوو. ئەم نەریت‌و میراتە ئەدەبییەی شاعیرانی بابان دایانهێنا لەباری مێژوویی‌و فەرهەنگییەوە بۆتە گەنجینەیەكی نەتەوەیی نەمرو لەبڕان نەهاتوو بۆ وەچەو نەوەكانی دوای خۆشیان. (ئەم ڕێنیسانسە مەزن‌و گرنگە لەدواییدا بووە سەرچاوەیەك بۆ گۆڕان‌و پێشكەوتنی ئەدەبی كوردی لە هەموو كوردستانی باشووردا).[58]

---

(٥٧) لەلای نالی و سالم‌و كوردی كۆمەڵێ بەیت‌و بابەتی شیعری هەن كە بە ئەنقەست پێ لەسەر ئەو مەسەلەی بە كوردی گوتنەی شیعرو هۆنراوەكانیان دادەگرن بۆ نموونە:

لای نالی:

- تەبعی شەكەرباری من كوردی ئەگەر ئینشادەكا

ئیمتحانی خۆیە مەقصودی، لەعەمدا وادەكا

- كەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ كوردییە، خۆكردییە

هەر كەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنادەكا

- ئیستیتاعەو قووەتی تەبعم بە كوردی‌و فارسی‌و

عارەبی، ئیزهاری چالاكی و چەسپانی دەكا

لای سالم:

- زێڕە، سەرمایەیە بۆ (سالم)و كرمانی دەبا

شیعری كوردی كەبدا جیلوە لەلای شێخی كەبیر

- مەهی فارس زبانەم گوفت (سالم) شەرحی حالت گۆ

گوتم جانا، بەلەد نیم ئیستیلاحی ئێوە، من كوردم

لای كوردی/

- دوڕو یاقوت دەبارێ لەم كەلامە شیرینەی كوردی

خوا ساكوا لە دنیادا قەدرزان‌و خەریدارێ

(٥٨) مێژووی ئەدەبی كوردی، د.مارف خەزنەدار، ب٣: ٣٦.

لەدوای یەکەمین شەڕی گەورەی نێوان عوسمانیو سەفەوی لە چاڵدێران (١٥١٤)، کوردستان بە گوێرەی سەنگو تەرازووی هێزەکانی ئەم دوو دەوڵەتە زلهێزە بۆ یەکەمین جار دابەش کراوە، میرنشینەکانی لای ڕۆژئاواو سەروو خوارووی کوردستان کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی رووکەشی دەوڵەتی عوسمانیو میرنشینەکانی رۆژهەڵاتی وەکو، ئەردەلان، لورستان، موکریان کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی عەجەم[١٦].
لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی کتێبی (فەرمانڕەوایی موکریان) ناوی یازدە پشت لە کوڕو نەوەو نەوەزاکانی میر سەیفەدین دەبات کە لەو ناوچەیەدا لەناو عێلو عەشیرەتەکانی موکریاندا دەسەڵاتدار بوونو میرو مەزنایەتیان کردووە[١٧]. بە کورتی مێژووی سەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی دەرحەق بە کورد، هەموو لاپەڕەکانی خوێنی لێدەتەکێ، محەمەد ئەمین زەکی لەو بارەوە دەڵێ: هەڵسوکەوتی شا ئیسماعیل دەرحەق بە کورد...هەڵسوکەوتێکی پڕ لە زوڵمو زۆرداری بوو، چونکە کوردەکان سونی مەزهەب بوون هەرگیز باوەڕو متمانەی پێنەدەکردن، لەهەر دەرفەتێکدا لە هەوڵی ئازاردانو فەوتاندنی کوردەکان دابووە.(١٨)
کردارو رەفتاری شا عەباسی یەکەم (١٥٨٧ – ١٦٢٩) لە ئاست کوردا لە هی ئەوانی پێشە خۆی باشتر نەبووە، هەر لە سەردەمانی ئەودابوو کە هێرشێکی بەربڵاو کرایە سەر ناوچەکانی کوردستانی موکریان کە خۆی سەرکردایەتی دەکردو بۆ ماوەی چەند مانگان قەڵای دمدمیان گەمارۆدا، خەڵکی ناوچەکە زۆر بە سەختی داکۆکیان لە خاکو ماڵو سامانو ئابرووی خۆیان کردو لاپەڕەیەکی زێڕینیان لە مێژووی نەتەوەکەیاندا تۆمارکردووە کە نموونەی خۆبەخت کردنو مەردایەتی بووە، رووداوەکانی قەڵای دمدم لەو رۆژەوە بۆتە وێردی سەر زمانی خەڵکی کوردو داستانێکی قارەمانانەی لێکەوتۆتەوە کە پشتاوپشت گوێزراوەتەوەو تا ئێستاش حیکایەت خوانو بەیت بێژەکان، بەتایبەتی لە ناوچەی موکریان بە زیندوویی پاراستوویانە، لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا (ئۆسکارمان) لە زمانی بەیت بێژێکی

---

(١٦) کوردو عەجەم: ١٥١.

(١٧) فەرمانڕەوایی موکریان: ٣٣-٥٧

(١٨) کوردو کوردستان ، محمدامین زەکی: ٦٠.

موکریان (رەحمان بەکری سابلاغی) تۆماری کردووە[19].

هێشتا دمدم خوێنی قوربانییەکانی لێ دەچۆڕا کە شا عەباس هەڵیکوتایە سەر خێڵی موکریو کەوتە کوشتاریان و بە هەزاران ژنو منداڵیشی لێ یەخسیرکردنو (15 هەزار) خێزانی کوردی لە دانیشتوانی ناوچەکانی باکوری موکریانیش بەرەو خۆراسان گواستەوە[20]. کەواتە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا سەرباری کوشتو بڕی چەند بارەی خێڵو هۆزەکانی موکریان کە لە کتێبە مێژووییەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە[21]. سیاسەتێکی تازە سەبارەت بە ناوچەکانی کوردستانی رۆژئاوای ئێران پەیڕەو کراوە کە ئەمیش بریتی بووە لە راگواستنو پەرتو دوورخستنەوەی خێڵە کوردەکانو، نیشتەجێکردنی عێڵو هۆزەکانی تورکو تورکمانو مەغۆڵو ئازەری لە ناوچەکەدا. بە واتەیەکی تر یەکەمین هەوڵەکانی گۆڕینی هەلومەرجی دیمۆگرافی رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی سەفەویدا دەستی پێکردووە.[22] سیاسەتێك کە لە سەردەمی پاشایەتی قاجارو بنەماڵەی پەهلەویش لە ئێران هەر درێژەی پێدراوەو تا

---

(19) بڕوانە:

تحفة مظفرية، گرداری ئوسکارمان، پێشەکیو ساغکردنەوەی هێمن موکریانی، بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1975.

- بەو هۆیەی کە کارەساتی دمدم رووداوێکی گەورە بووە لە مێژووی نەتەوەی کوردا، بۆیە مامۆستا هێمن لە پێشەکی کتێبەکەدا گەڕانەوەی سەروو بەری گەمارۆدانو هەموو رووداوەکانی پاش گیرانی قەڵاکەی لە کتێبەکەی (ئەسکەندەر بەگی تورکمانی)، ( عالم آرای عباسي)دا وەرگێڕاوەتە سەر کوردیو تۆماری کردووە، چونکێ باشترین شایەدییە لەسەر رووداوەکانی ئەو سەردەمە، لەکاتێکدا (ئەسکەندەر بەگ) خۆی کاتبو مێژوونوسی شا عەباس بووە لەو هێرشەشدا بۆ سەر دمدم خۆی هاوڕێیەتی شا عەباسی کردووە. نووسەرانی کورد بایەخی زۆریان بەم رووداوە مێژووییە داوەو چەند شاکارێکی ئەدەبییان لێداهێناوە، وەکو رۆمانی (قەڵای دمدم)ی عەرەب شامیلۆفو چیرۆکی (قەڵای دمدم)ی مصطفى صالح كريمو( قارەمانێتی کورد لە داستانی قەڵای دمدم)...ئامادەکردنی ئۆردوخانی جەلیل...تاد.

(20) دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر: 231.

(21) بڕوانە:

- مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: 356.

- کوردو عەجەم: 60 - 92.

- کوردو کوردستان، نیکیتین: 483.

(22) کورد و عەجەم: 24.

ئێستاش. هەر ئەم ناوچەیە بە هۆی هەڵکەوتی جیۆگرافییەوە کە دەکەوێتە سەر تخووبەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی، ببوو بە یەکێك لە مەیدانەکانی جەنگی نێوان ئەو دوو هێزەو شارێگەی لەشکر کێشییەکانی رۆم و عەجەم بۆ سەریەکتری لە سەدەکانی ۱۷ و ۱۸ کە بوو بە مایەی گەورەترین نەهامەتی و کاولکاری و ماڵوێرانی بۆ سەر ئەم مەڵبەندە لەمێژووی نوێدا، دوای ئەوەی رووسەکانیش هاتنە مەیدان و تێکەڵاوی ئەو شەڕ و ململانەیە بوون کە لە نێوان هێزەکانی رۆم و عەجەمدا لەسەر دەسەڵات گرتنە دەستی ئەو ناوچانەدا لە ئارادابوو.

لە چارەگی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا دەرباری قاجاری میرنشینە ئۆتۆنۆمییەکانی کوردستانی ئێرانی لە بەینبرد، لەوانە میرنشینی موکریان و دەسەڵاتی ناوەندی عەجەمیان تێدا دامەزراند. دەسەڵاتی راستەوخۆی دەوڵەتی داگیرکەری بێگانە بەسەر کوردستانەوە کە بە زۆرو هێزی چەکداری سەرکوتکەریش پارێزگاری لێدەکرا، هیچ پێشوەچوونێکی لەباری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەوە بۆ کوردستان پێنەبوو، بەڵکو باری زوڵم و چەوسانەوەی خەڵکەکەی قورستر کردو چەوسانەوەی نەتەوەیی و مەزهەبیش بە تایبەت لە سەردەمی قاجارەکاندا بوو بە سەرباری ئەو نەهامەتیانە.

لە سەدەی نۆزدەمین هەست و بیری نەتەوەیی لەلای کوردان روو لە بوژانەوەو پێگەیشتن بوو، لە کاتێکدا میرانی ئەردەلان چ لە رێگەی خزمایەتی و زەماوەندی سیاسییەوە بێت چ لە رێگەی خۆنزیك کردنەوەیان بێت لە ئاینزای شیعە کە ئاینزای دەرباری ئێران بوو، توانیان پێگەو هەڵکەوتی سیاسی خۆیان لە ئێراندا پتەوتر بکەن. گەورەو میر و مەزنەکانی موکریان بەهۆی لاوازی پەیوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتی مەرکەزی و پەیڕەوکردنیان لە ئاینزای سونە هەمیشە لە سیاسەتەکانی عوسمانی نزیکتربوون و تێکەڵاویان لەگەڵ ناوەندەکانی دەسەڵات لە کوردستانی عوسمانییدا لە بڕەوتر بوو. کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمیش بە چەرخی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی دەژمێردرێت بەتایبەتی لە ناوەندو ناوچەکانی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا، هەر بۆیە یەکێك لە مەزنترین راپەڕینەکانی کورد لە چارەگی دوایی سەدەی نۆزدەیەمدا کە کاریگەری زۆری بەسەر هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان و بەتایبەتی ناوچەی موکریانیش داهەبوو، شۆڕش و راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بوو لە ساڵانی (۱۸۸۰ — ۱۸۸۳ ) لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی

کوردستان[٢٣]. بەو هۆیەوەش کە نەهری یەکێك لە گەورەترین مەڵبەندەکانی رابەرایەتیی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستان پێکدەهێناو ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی موکریان لە ریزی خەلیفەو موریدو مەحسوبەکانی شێخی نەهری دابوون، هەمیشەش خەلیفەو نێردراوەکانی لەو ناوچەیەدا دەسوڕانەوەو شێخ لە هەوڵی ئەوەدابوو کە هەموو هۆزە کوردەکان یەکبخاتو ناوچەیەکی فراوان لەسەر سنووری تورکیاو ئێرانو روسیا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[٢٤]. هۆزە کوردەکانی ناوچەی موکری رۆڵێکی مەزنیان پێ سپێردرابوو لە جێبەجێکردنی نەخشەو پلانی شێخ بۆ شۆڕشو راپەرین لە دژی دەسەڵاتی ئێران. دوابەدوای کورت هێنانی راپەرینەکەش هێزەکانی سوپای ئێران بە دەستێکی رەشو دڕوونێکی رقاوی کەوتنە گیانی کوردەکانو بێ بەزەییانە تۆڵەیان لێ سەندنەوە. بە درێژایی ئەو رێگاوبانانەی پیادا دەرۆیشتن گوندەکانی کوردیان تالان دەکردو دەسووتاند، هەر کوردێکیان بەدەست بکەوتایە دەیانکوشتو بەزەییان بە منداڵو ژنو پیرەکاندا نەدەهاتەوە[٢٥].

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا کورد لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران لە دژی زوڵمو زۆری کاربەدەستانی عەجەم هەمیشە لە بەرگریو بەرهەڵستی دابوون. هەستی رزگاریو بزووتنەوەی نیشتمانی هەموو کوردستانی داگرتبوو، فەرمانڕەوایانی حکومەتی شا لە ناوچەکانی موکریان ناچاربوون داخوازییەکانی گەلی کورد لەبەرچاوبگرن. هەروەها وڵاتانی ئەورووپاش لە وێنەی روسیاو بەریتانیاو ئەڵمانیاو ئەمریکا ناچاربوون بایەخێکی زیاتر بەم ناوچانەو بە کورد بدەن، بۆیە نێردراوو رابەرو مسیونێرەکانیان بەوناوەدا بڵاوکردەوە[٢٦] بەو مەبەستەی نفوزی خۆیان لە کوردستان بەهێزتر بکەن.

لە ساڵانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا جولانەوەیەکی بەهێزی ریفۆرم خوازی، کە لە مێژووی نوێی ئێراندا بە (شۆرشی مەشروتە ١٩٠٥- ١٩١١) ناسراوە هەموو وڵاتی تەنیەوە، ئەم جولانەوەیە لە ناوچەکانی ئازەربایجاندا مەشخەڵو بڵێسەکەی بەهێزبوو بەجۆرێك کە دەسەڵاتو حوکمڕانی خەڵك بەرپابوو شوێنی دەسەڵاتی

---

(٢٣) الاکراد ، ملاحظات وانطباعات: ٢٧.

(٢٤) خەبات لە رێی کوردستان: ١٧٥.

(٢٥) راپەرینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠ : ١٣٨.

(٢٦) خەبات لە رێی کوردستان: ٢١٢

ناوەندی گرتەوە. لەو سەردەمەدا خەباتی خەڵکی کوردستان پێی نایە قۆناغێکی تازە، ئەویش بریتی بوو لە پێکهێنانی کۆمەڵەو کۆڕو کۆمەڵی سیاسیو رووناکبیریو کۆمەڵایەتی.

هەر لەو سەردەمەشدا بوو کە دەوڵەتانی بیانی وەکو روسیاو بەریتانیا هەریەك نفوزو دەسەڵاتی بەسەر بەشێکی وڵاتەکەدا گرتبوو، لەکاتی هەڵایسانی یەکەمین بڵێسەی جەنگی جیهانیشدا ناوچەکانی خۆرئاوای ئێران بوو بە مەیدانی شەڕو پێکدادانو کێشمەکێشی نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی. دەسەڵاتی ناوەندی وڵاتیش بە بیانووی بێ لایەنی لە شەڕدا هیچ تواناو دەسەڵاتێکی بەسەر هیچ لایەنێکی وڵاتەکەدا نەمابوو[٢٧].

## ٤. ژیانی خوێندەواریو رووناکبیری (کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم):

بارودۆخی سروشتی و جیۆگرافی، هەلومەرجی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی، لە ریزی ئەو هۆکارانە بوون کە ناوچەکانی موکریانیان وەکو ناوچەیەکی خێڵەکیو عەشایەری هێشتۆتەوە، هۆزەکان زیاتر بە ژیانی ئاژەڵداریو نیوە کۆچەریەوە خەریکبوون، بۆیە هەڵکەوتنی شارو بازێڕی ئاوەدانو دروستبوونی توێژی خەڵکی شارنشینو شارستانی لەم ناوچانە بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی میرنشینی ئەردەلان بە نموونە، تاڕادەیەك دواکەوتووە. شارو شارۆچکەکانی مەهاباد، شنۆ، سەردەشت، بۆکان، نەغەدە لە سەرەتادا وەکو بازاڕێك بۆ ئاڵوگۆڕو ساغکردنەوەی بەروبوومی ئاژەڵیو کشتوکاڵییەوە هاتنەکایەوە[٢٨].

گەورەترین کەسایەتی موکریان لە مێژووی نوێدا بوداغ سوڵتانی نەوەی میر سەیفەدین بەگی موکریانە، بوداغ سوڵتانی کوڕی شێرە بەگ (١٦٠٨ – ١٦٨٩) کە بە سەردارو بابە گەورەی زنجیرەی دووەمی میرانی موکری دادەنرێت، یەکەمین کەسێك بووە کە شاری (سابلاغ)ی کردۆتە پایتەختو بنکەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی میرایەتیەکەیو بۆ ماوەی ٦٠ ساڵ حوکمڕانی کردووە، هەر لەسەر دەستی ئەویش شارەکە ئاوەدان کراوەتەوەو چەند شوێنەوارێکی ناوداری ئەو سەردەمە تاوەکو ئەمڕۆ

---

(٢٧) کورد و عەجەم : ١٩٩.

(٢٨) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ٤٥.

له شارەکەدا ماون، لەوانە (مەسجدی جامع – یا مزگەوتی سوور)ی مهاباد کە بە یەکێك لە مەزنترین شوێنەواری ئاینیو رووناکبیری شارەکە دەژمێردرێو رۆڵێکی مەزنی لەو بوارانەشدا گێراوە[29]. هەر لەو رۆژگارەدا (مەلاجامی) دەبێتە پێش نوێژو وتارخوێنو وانەبێژی زانستو زانیاریەکانی ئاینیو لە مهاباد جێگیردەبێت[30]. لەپاڵ کردنەوەی چەند مەدرەسەو خوێندنگاو کتێبخانەو مەنزلگای حەوانەوەی خەڵکی هەژارو بێ دەرامەت، لەپاڵ ئەوەشدا پردی سوورو پردی لوجو پردی دارەلك لە رۆژگاری ئەودا دروست کراون. هەروەها ئەندازەیەکی زۆری موڵكو زەوی وەکو وەقف بۆ خەرجیو ئاوەدانی ئەو شوێنانە تەرخانکردبوو[31].

مهاباد کە هەر لەسەرەتاوە بنکەو پێگەی والی نشینی ناوچەی موکریان بووە لە رۆژگاری هێرشی مەغۆل بۆ ناوچەکەو بەخاتری هەبوونی سەرچاوەو کانیو ئاوێکی سازگار لە کەناری ئەو ئاواییەدا ناوەکەی لە نێو خەڵکدا بە (سوغ بلاغ – سابلاغ) رۆیشتووەو، لە نووسراوو موکاتەباتی میریدا بە (ساوجبۆلاغی موکری) ناوبراوە تا لەگەڵ ساوجبۆلاغی ناوچەی قەزوین تێکەڵ نەبێت. تا لە سەرەتای دەورەی پەهلەویو لەسەر پێشنیاری دکتۆر رەشید یاسمی (ئەندامی کۆڕی زانیاریو مامۆستای دانیشگای تاران) لە ساڵی (١٣١٥/١٩٣٦) ناوی (مهاباد)ی بۆ گێڕدراوەتەوە[32].

سەرانی هۆزو تایفەکانی دەوروبەری مهاباد روویان کردۆتە شارەکەو بۆ بنیاتنانو ئاوەدانی شارەکەدا تێکۆشاونو چەندین کۆشكو سەراو مزگەوتو حەمامو باغاتو دوکانو قەیسەرییان تیادا دروست کردووە.[33] لە سەرەتای سەدەی بیستدا شاری

---

(٢٩) مهابادو کورتە مێژوویەك: ٢١ ، ٢٢.

(٣٠) ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی: ٨.

(٣١) خاطرات دکتر هاشم شیرازی: ٢٧.

(٣٢) گۆیا ئەم نازناوەش لە (مەئاباد، مادئاباد، مهاباد)ەوە هاتووە کەلە سەردەمی مادەکان باوبووە.

بڕوانە:

- تاریخ مهاباد: ١٢.

– مهاباد و کورتە مێژوویەك: ٧٤.

– خاطرات دکتر هاشم شیرازی: ٤

(٣٣) ئاغاو خانو سەرۆك هۆزەکانی دەوروبەری مهاباد هەر یەکێکیان لەپاڵ ئەوەدا کە خانووبەرەو کۆشكو سەرایەکی لە شارەکەدا بۆ خۆی دروست دەکرد، مزگەوتو مەدرەسەیەکی◄

سابلاغ (١٣) مزگەوتو (١٦) مەدرەسەو (٢) تەكیەو خانەقایەكو (٤) حەمامو كەنیشتەیەكو كلێسایەكی لێبووە، لەپاڵ (٦) كاروانسەراو (١٠) باغی گەورە.[٣٤] مهاباد ناوەندی تیجارەتو بازرگانی بووە لەگەڵ ناوەندە بازرگانییەكانی ئێرانو روسیاو عیراقو توركیا پەیوەست بووە. لە دوای جەنگی یەكەم كونسولخانەی ئینگلیزو روسو ئەمریكا لە شارەكەدا هەبوون.[٣٥] كە ئەمەش بایەخی ئەو شارە لەرووی ئابووریو سیاسییەوە نیشاندەدات. لە هەموو دێهاتو شارۆچكەكانی لەلایەن خاوەن موڵكو دەستڕۆیشتووەكانەوە، مەدرەسەی ئاینیو قوتابخانە بۆ خوێندنو بەدەستهێنانی زانیاری دامەزرێندراوە، ناوچەكانی موكریان بەتایبەت شاری سابلاغ سەبارەت بە خوێندنو زانستەكانی ئیسلامەتی لە سەردەمی پێشوودا بە یەكێك لە مەڵبەندە ناودارەكانی عیلمو زانست لە كوردستاندا ناسراوە.[٣٦] كوردی موكریان لەباری خوێندنو زانستو شیعرو ئەدەبو هونەرو خەتخۆشیدا ئاشناو پسپۆڕن.

میرزا عبدالرحیمی وەفایی (١٨٤٤ – ١٩٠٢) كە یەكێك لە ناودارترین شاعیرانی كوردی ناوچەی موكریانە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، موریدو مەنسوبێكی هەرە لەپێشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بووەو بۆ ماوەی چواردە ساڵان میرزاو كاتبو رازگری شێخو مامۆستای منداڵەكانی بووە، شیعرو غەزەلە ناسكو پاراوەكانی ئاوێنەیەكی ئەو عەشقو ئەوینە بەسۆزەیە كە لە نێوان ئەوو شێخی نەهریدا هەبووە.

وەفایی لەپاڵ دەسەڵاتی هونەرو شیعرو ئەدەبدا مرۆڤێكی پایەبەرزو رووناكبیرێكی گەورە بووە، بیرەوەرییەكانی خۆیشی سەبارەت بە ژیانو رووداوەكانی ئەو سەردەمە تۆماركردووە كە ئەمەیان رەنگە كارێكی بێ پێشینە بێت لە مێژووی ئەدەبی

---

◄◄ ئاینیشی بەناوی خۆیەوە دەكردەوەو كۆمەڵێك موڵكو ماڵو زەویشی دەكردە وەقف بۆ دابینكردنی خەرجیو مەسروفاتی مزگەوتو مەدرەسەكەی، لە نموونەی مزگەوتەكانی: هەباس ئاغا، رۆستەم بەگ، سەید بایەزید، قازی، سەید نیزامی...تاد.

ـ بڕوانە: تاریخ مهاباد: ١٣٧.

(٣٤) كوردستانی موكریان: ٣٤، ٣٥.

(٣٥) تاریخ مهاباد: ١٣٦.

(٣٦) كوردستانی موكریان: ٢٩.

کوردیدا.[٣٧] ئەوکاتەی کە لە مهاباد ژیاوە مەدرەسەیەکی هەبووەو شاگردەکانی تیادا فێری زمانو ئەدەبو ئاوازو خەتخۆشی کردووە.

لەسەرو بەندی سەدەی بیستەمدا مهاباد (٧٠٠) فەقێ یا خوێندکاری زانستی ئاینی هەبووە کە بەشی زۆریان هی ناوچەکانی موکریانو شوێنەکانی دیکەی کوردستان بوون، جگە لەوەی لەهەر گەڕەکێکی شارەکەدا قوتابخانەیەك هەبووە کە میرزایەك بەڕێوەی بردووەو دەرسی زمانو ئەدەبو خەتو خۆشنووسی تیادا گۆتراوەتەوە.[٣٨]

موکریان زێدگاو مەڵبەندی پێگەیشتنی سەدان مەلاو زاناو شاعیرو عاریفی نێودارە، هەر تەنیا لە مهاباد بە دەیان پیاوی ناوداری لێ هەڵکەوتووە لە وێنەی، مەلا جامی چۆڕی مەریوانی، مەلا عەلی پیرەبابی، مەلا حوسێنی مەجدی، سەیف ئەلقوزات، میرزا فەتاحی قازی، پێشەوا قازی محەمەد، مستەفا شەوقی، مەلا عەبدولقادری مەولەوی، داماو سەید حوسێنی حوزنی موکریانی، عەبدولڕەحمان گیوی موکریانی، میرزا سەلیمی موکریانی، حاجی مەلا عەبدوڵڵای ئەحمەدیان، مەلا ساڵحی ئیبراهیمی، مەلا قادری مودەڕیسی، هێمنو مەلا غەفووری حافزی مهابادی...تاد.

لە شارستانی سەردەشت زانایانی نێودارو پایەبەرزی وەکو ئیبنولحاج، مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی، مەلا عومەری سەردەشتی، مەلا کەریمی فیدایی، مەلا ئەحمەدو محەمەدی شەلماشی...لێ پێگەیشتوون. لە شنۆو خانێدا، مەلا عەبدولعەزیزی شنۆیی، سەید تاج ئەلدینی شێخی زەنبیلی، قازی محەمەد خزری، ئەمین شنۆیی، مەلا ڕەسولی ئەدیب، پێگەیشتوون. لە بۆکان دەیان شاعیرو زاناو دانای ناودار دەرکەوتوون لە وێنەی، قزلچییەکانو تورجانی زادەو وەلزییەکانو سەیدەکانی زەنبیلو شێخانی بورهانو شاعیرانی وەکو ئەحمەدی کۆرو مەلا مارفو ئەدەبو حەقیقیو هەژارو هێدیو ئیمامیو جەوهەریو سوارە...لەپاڵ دەیان هونەرمەندی خۆشنووسو خۆشخوانی بەهرەوەر.[٣٩] سەقزو بانە مەڵبەندی شاعیران وزانایانی وەکو، پاکی، تۆفیقی ئەمینیان، زاری، سولتانولعورەفا، شەیدا، ساڵح، عاشق، فاتحی مەجدی، فیدا، فەقیهی، کامل، کرمانج، کەوسەر، مەلیکوکەلامی مەجدی، موخلیس، مەفتون، نافع،

---

(٣٧) بیرەوەرییەکانی وەفایی: ٢٨.

(٣٨) تاریخ مهاباد: ١٣٨.

(٣٩) تاریخ فرهنگ وادب مکریان، جلد ١، ٢.

وەجدی، وەفا... هی دیکە بووە.[٤٠]. سیماو خەسڵەتی دیارو ئاشکرای زانستو ئەدەبیاتو فەرهەنگی ئەم ناوچەیە ئەوەیە کە بە توندی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری کولتوور و ئەدەبیاتی ئێرانییەوە، بۆیە بەشی زۆری بەرهەمو شوێنەواری زانستیو ئەدەبی ئەم ناوچەیە بەتایبەت لەسەر دەمانی پێشوودا بە زمانی عەرەبی، یاخود فارسی تۆمارکراونو تەنها بەشێکیان بە زمانی کوردییە. تەنانەت نووسەرێکی وەکو سەید عەبدولحەمیدی سجادی لە کتێبی (شاعران کرد پارسی گۆی)دا ناوی زیاتر لە (٩٠٠) شاعیرو ئەدیبو هونەرمەندی کوردی بردووە کە شیعرو بەرهەمەکانیان بە زمانی فارسی گوتوەو تۆمار کردووە.[٤١] ئەڵبەتە یەکێك لە هۆکارە هەرە بنەڕەتییەکانی ئەم حاڵەتە بۆ دابەشبوونی سیاسی کوردستانو کورد دەگەڕێتەوە، کە زمانو فەرهەنگێکی جیاواز لە زمانو فەرهەنگ سروشتی خۆی بەسەریدا سەپێندراوە.[٤٢] وەکو چۆن دابەشکردنو دابڕانی بەشەکانی خاکی کوردستان لەیەکتری کاریکردۆتە سەر باری خوێندەواری ئەو بەشەی لەگەڵیاندا دەژیاو زمانو ئەدەبی کوردی لەو وڵاتانەدا بوون بە فەرهەنگێکی پلەی دووەم.[٤٣] لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەستەیەك لە رێبەرانی ناسیۆنالستی کوردی کە نەوەی خانەدانو میرەکانی بەدرخانیو سۆرانو بۆتانو بابانو موکریان بوون، لەسەر بنەمایەکی تازە درێژەیان بە خەباتو تێکۆشان داوە کە ئەویش پەرەپێدانی بزووتنەوەی سیاسی – فەرهەنگی بوو لە کوردستاندا، بۆیە لەلایەك کۆڕو کۆمەڵەو رێکخراوی سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردی دروستبوونو لەلایەك خەباتی کولتووریو خوێندەواری کوردییان بووژاندۆتەوە. ئەوە بوو لە نیسانی ساڵی (١٨٩٨)دا یەکەمین رۆژنامەی کوردی بەناوی (کوردستان)ەوە بڵاوکرایەوە کە لەو رۆژگارەدا وەکو چرایەك بوو لە پێناو زیندووکردنەوەی زمانو کولتوورو گیانی نەتەوەیی[٤٤].

لە رۆژگاری شۆڕشی دەستووری (مەشروتە) لە ئێران (١٩٠٥ –١٩١١) لەگەڵ ئەوەشدا ناوچەکانی موکریان مەڵبەندی سەرەکی هۆزەکانی کوردو، سەرۆك هۆزەکانیش

---

(٤٠) گلزار شاعرانی کردستان، سید عبدالحمید حیرت سجادی.

(٤١) شاعران کرد پارسی گوی، سید عبدالحمید حیرت سجادی.

(٤٢) کوردو عەجەم: ١٥٧.

(٤٣) شیعری کوردی/ سیاسەت، کۆمەڵایەتی، کوردایەتی، گ/رۆشنبیری کوردستانی، ژ/ ١: ٥.

(٤٤) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ١٢٧.

سێبەری سیاسییان بەسەر خەڵکە بێ دەرەتانەکەوە خستو قورسو زیاتریش بە لایەنگیری لە دەوڵەتی مەرکەزی بوو، بەڵام لەناو شارە گەورەکانی موکریاندا وەکو مهابادو سەقزو بۆکان چەند ئەنجومەنێك لە دەستوورخوازان بەمەبەستی گۆڕان لە ستراکتووری دەسەڵاتداریەتیو چاکسازی سیاسیو کۆمەڵایەتی پێکهاتبوو، ئەڵبەتە لە کوردستانیش زانایانو رووناکبیران، تەبای شارەکانی دیکەی ئێران، رۆڵی سەرکردایەتیو رابەرایەتیکردنی ئەو ئەنجومەنانەیان لە ئەستۆوە گرتبوو. ئەم ئەنجومەنانە، کە لە شارەکانی کوردستان پێکهاتبوون رۆڵێکی گرنگیان لە هۆشیارکردنەوەی خەڵكو داکۆکیکردن لە وەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد لە ئێراندا دەبینی.[45] ئەنجومەنی شاری سەقز کە لەژێر سەرپەرشتی شاعیرو دادوەری ناسراو مەلا محەمەدی کەریم بوو، رۆڵێکی گرنگی بینی لە هاندانی خەڵکی سەقز بۆئەوەی پێوەندی بکەن بە ئەنجومەنو هاریکاری دەستوورخوازان بکەن، هەروەها لە شاری سابلاغ قازی فەتاحی مامی باوکی قازی محەمەد، ئەنجومەنی دەستوورخوازانی بۆ ئەو شارە دامەزراندبوو.[46] یەکێك لەرووە هەرە دیارەکانی خەباتی رووناکبیری کۆمەڵەو رێکخراوو پیاوانی ناوداری کوردستان لەو سەردەمەدا، بایەخدان بە بڵاوکردنەوەی خوێندنو خوێندەواری بووە لەناو گەنجانو لاوانی کورد لەپاڵ خزمەتکردنی زمانو ئەدەبی کوردی. لەو مەیدانەدا خەباتی عەبدولرەزاق بەدرخان لەبەرچاوە کە لە ساڵانی بەر لەجەنگو لە (١٩١٣)دا یەکەمین قوتابخانەی لە شاری (خۆی) بۆ منداڵانی کورد کردۆتەوەو کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری دامەزراندووەو نیازیشی وابووە کە چاپخانەیەکیش بۆ کۆمەڵەکە دابنێو رۆژنامەیەکیش بەو ناوەوە دەربکات.[47] لە دەستپێکی جەنگی جیهانیو تەنینەوەی یەکەمین بڵێسەی شەڕ لە ناوچەکانی موکریان، هەمدیسان پیاوانی زاناو رووناکبیری کورد بەئاشکراکردنی بوختانو فەندوفێڵی دەوڵەتی عوسمانی، کە پڕوپاگەندەی (جیهاد)یان لەناو خەڵکدا بڵاودەکردەوە، بەگژ دەستدرێژیو زۆرداری دەسەڵاتی عوسمانیو رووسەکاندا چوونەتەوە لەو ناوەدا شێخ بابا سەعیدی غەوسابادی ناسراو بە (شێخی شەهید/١٢٧٥ - ١٣٣٣ کۆچی) عارفو شاعیرو نیشتمانپەروەری کورد ئەو راستیەی ئاشکراکرد کە

---

(٤٥) دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر: ٢٤١.

(٤٦) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ١٤٣.

(٤٧) کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا: ٣٧ – ٣٨.

(ئاینی پیرۆزی ئیسلام تەنها بیانوویەکە بەدەستی ئیمپراتۆری نەخۆشی عوسمانییەوەو تەنیا بۆ ماونەوەی خۆیو رزگاری بوونی کردوویەتی بە ئالا).[48] شێخ بابا کۆمەڵەیەکیشی لە زاناو رووناکبیرو نیشتمانپەروەرانی ناوچەکەی لە دەوری خۆی کۆ کردبۆوە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان لە هەوڵی بەدەستهێنانی پشتیوانی رووسەکانیش دابووە.[49] ئینجا هەر لەسەر ئەوەی کە شێخ بابا فەتوای جیهادی عوسمانییەکانی بە فەندوفیڵو مانۆڕێکی سیاسی دەدایە قەڵەم، بە پێچەوانەی خواستی ئەوان نێوانو پەیوەندی باشیشی لەگەڵ مەسیحییەکاندا هەبوو، عوسمانییەکان گرتیانو لە زستانی (۱۹۱٦)دا لە داریان دا.[50]

لەو رۆژگاردا یەکێك لە ناودارترین بنەماڵە ناسراوەکانی ناوچەی موکریان کە بنەماڵەی(قازی)یە، لەسەر شانۆی رێبەرایەتیی نیشتمانیو ئاینیو کولتووری خەڵکی ئەو ناوچەیە بەدیار دەکەوێتو کەسایەتی ناسراوی ئەو بنەماڵەیە لەو رۆژگارەدا (میرزا فەتاحی قازی) (۱۸۳۲ - ۱۹۱٦) هەڵدەکەوێت. ئەم کەڵە مێردە بەو هۆیەی کە هیچ کات لەگەڵ بەدرەفتاریو کرداری شاهانی قاجار دەرهەق بە خەڵکی ناوچەکە سازشی نەکردووەو نەگونجاوە، بۆیە بۆ ماوەی دوازدە ساڵان لە رۆژگاری حوکمڕانی ناسرەدین شاو موزەفەر شای قاجاردا بۆ تاران دوور دەخرێتەوەو لەوی زیندانیو دەست بەسەر دەکرێت. دوای گەڕانەوەشی لە رۆژانی گەرمبوونی بلێسەی شەڕو لە ئەنجامی داکۆکیو بەرگریکردنی لە خەڵکی شاری مهاباد لەبەرامبەر هێرشو دەستدرێژی لەشکریانی رووس بۆ سەر شارەکە لە مەیدانی نەبەردو پێکداداندا شەهید دەبێت.[51]

لە ساڵانی یەکەمین جەنگی جیهانیدا (۱۹۱٤-۱۹۱۸) شۆڕشو راپەرینی سمکۆی شکاك (۱۹۱۸ – ۱۹۳۰) ناوچەکانی موکریانیش دەخاتە ژێر رکێفی دەسەڵاتو کاریگەریی خۆیو لەدوای بڕانەوەی شەڕو لە ساڵی ۱۹۲۱دا یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە کوردستانی ئێران بەناوی (رۆژی کورد) لەشاری ورمێ چاپو بڵاو دەبێتەوە.[52]

---

(٤٨) شێخ بابا –شێخی شەهید، گ/ مهاباد، ژ/ ٩: ١٢.

(٤٩) صفحات من تاريخ ايران الحديث والمعاصر: ٢٤٦.

(٥٠) ايرانى كه من شناختەام: ٢٣٣.

(٥١) تاريخچه خانواده قاضى در ولايت موكرى: ٦٢-٦٦.

(٥٢) پاشەرۆك: ٤٠.

باسی باری خوێندەواری‌و زانستی‌و ڕووناکبیری لە ناوچەی موکریان بەبێ ئاماژەکردن بە ڕۆڵی ڕێبەرایەتی‌و پەروەردەیی هەردوو ڕێبازو هەردوو خانەقای (شێخی بورهان لە دێی شەرەفکەندو شێخانی زەنبیل لەئاوایی زەنبیل) کارێکی ناتەواوە. ئەم دوو شوێنە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم‌و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لەناوچەی موکریاندا ڕۆڵێکی مەزن‌و کاریگەریان گێڕاوە لە بواری زانستی‌و ئاینی‌و کۆمەلایەتیدا. پێگەی ڕێبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی مەلا یوسفی شێخ شەمسەدینی بورهانی لە ناوچەکەدا دامەزراوەو پەرەی سەندووە، ناوبراو یەکێکە لە شێخانی ناوداری کوردستان‌و خەلیفەی شێخ سیراجەدینی نەقشبەندی بووە، بەشێکی زۆری خەڵکانی ناوچەکانی کوردستانی موکریان تا دەگاتە سنوورەکانی ئارارات‌و خۆی‌و تالش‌و سەلماس پەیڕەویان لەو زاتە کردووە. خانەقای شێخی بورهان لە دێی شەرەفکەندی نێوان مهابادو بۆکان، بەدرێژایی ئەو ڕۆژگارە خزمەتێکی شایستەی لە پێناوی پەروەردەو ڕێبەریکردن بۆ کاری چاکەو ڕێگای ڕاست پێشکەش بە خەڵکی ناوچەکە کردووە.[٥٣] بەشی زۆری پیاوانی زاناو داناو ڕووناکبیرانی ئەو ناوچەیە یا لە ڕیزی هۆگرو هەوادارانی خانەقاو ڕێبازی شێخی بورهان بوون یا لە خانەقادا شاگردو فەقێ بوون‌و لەرێگای فێربوون‌و پێگەیشتندا لەوێ بەهرەیان وەرگرتووەو سوودمەندبوون. لەوانە بەشێك لە ئەدیب‌و شاعیرانی ناوداری ناوچەی موکریان لە ڕیزی موریدو مەنسوبانی ئەو زاتەبوون لەوێنەی: سەید محمد سعیدی نورانی، حەریق، میسباحودیوانی (ئەدەب)، عەلی بەگ سالار سەعیدی حەیدەری، میرزا سەلیمی موکری، سەیفولقوزات‌و...هی دیکەش.[٥٤]

ئەوەی دووەم خانەقاو مەدرەسەی شێخانی زەنبیلە، کە لەسەر دەستی سەید عەبدولکەریمی زەنبیلی بنیاتنەرو سەرداری سەرجەلەی شێخانی زەنبیل دامەزرێندراوە. ئەم بنەماڵەیە لە پەروەردەکردن‌و پێگەیاندنی خەڵکی ناوچەکە لەسەر ڕێگای هەق‌و ڕاستی‌و چاکە هەموو هەوڵ‌و کۆششێکیان بەخشیوە، شاعیرانی دیارو ناوداری ناوچەکە سەید محەمەد زەنبیلی‌و سەید کامیلی ئیمامی‌و سەید عەبدولقادری سیادەت لە ڕیزی کوڕو کوڕەزاکانی ئەو زاتەبوون.[٥٥]

---

(٥٣) تاریخچە خانوادە قاضی: ٣١.

(٥٤) زندگینامەی عارف ربانی: ٢٧٠-٤٠٠.

(٥٥) تاریخ ادب فرهنگ مکریان، جلد اول: ٣٢١.

## باســـــی دووەم

### (١) بڵاوبوونەوەی شیعری کلاسیکی کوردی ( قوتابخانــەی کرمـانجی خـواروو ) لــە ناوچەی موکریان:

ئــەدەبی کلاسـیکی بەشـێوەیەکی گـشتی بەرهــەمی شـارو شارسـتانیەتو دروسـتبوونی قەوارەی سیاسیو پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتییە، زۆرجاریش لەپـشت سـەرهەڵدانو بووژانــەوەو پەرەسـەندنی جۆرەکـانی ئــەدەبی نەتەوەیــەك، هۆکـارێکی ئـاینی یـا مێـژوویی یـا سیاسـی بـەدی دەکرێـت. بووژانــەوەو پـەرەسـەندنی قوتابخانــەی شـیعری کرمــانجی خــواروو لــە (ســلێمانی) مەڵبەنــدی بابانــەکان هــەمان یاســاو دەســتوور دەیگرێتەوە بەرەچاوکردنی جیاوازیی رووداوەکانو هەلومەرجی مێژوویی تایبەت بـە نەتەوەی کورد. لە سەدەی نۆزدەیەمدا ناوچە کوردنشینەکانی ژێر قەڵەمڕەوی بابان جۆرێك لە یەکێتیو سەربەخۆیی بەخۆیەوە بینیوە. قەرەداغو شـارەزوورو شـاربازێڕ بەرەو گەشانەوەو پێشکەوتنو، ناوچەکانی کۆیــەو سلێمانی وەکـو پێگـەو پایتــەختی میرنشین روو لـە ئـاوابوونو پەرەسـەندن بـوون. گـەلێك مزگـەوتو تەکیـەو خانـەقاو مەدرەســەو دیوەخــان ئــاوابوونو مــەلاو زانــاو دانــای زۆرو زەبەنــد لــەو هەرێمــەدا کۆدەبوونــەوە، زانـستو زانیـاریو شـیعرو ئـەدەبو رووناکبیری پـەرەی سـەندو پلـەو پایەی بەرزی بەدەستهێنا. چـەکەرەکردنی بیری نیشتیمان پـەروەریو نەتـەوەخوازی لـەدەربارى ئـاوەدانی هەنـدێ لـە میرەکـانی بابـانو[٥٦] شـانازی کـردن بـەزمانو دابو دەسـتوورو کـەلتووری نەتـەوەیی، بوونەتـە هۆکـارو بنــەمای خوڵقـانو سـەرهەڵدانو

---

(٥٦) عەبـدولڕەحمانی پاشـای بابـان کتێبێکـی دەستنووسـی نـاوداری (صـحيح البخـاری) لـە ساڵی (١٢١١ك-١٧٩٧ز) وەکو وەقفنامە لەدوای خۆی بۆ مەلاو زانایانی (کوردستان) بەجێهێشتووە، کـەتیادا بە ئاشکرا سنووری قەڵەمڕەوی میرنشینی بابانی لە کوردستان دەستنیشان کردووە. بڕوانە:

– حاجی قادری کۆیی، ب١: ٢٠٧.

– هەروەها شاعیری میللی عەلی بەردەشانی بە شیعری رەوانو بەندو بەیتێکی نایاب باسی گیانی کوردایەتیو مێرخاسیی عەبدولڕحمانی پاشای بابانی کردووە.

بڕوانە:

- تحفه مظفرية ، ب٢: ٣٤٢.

رسکانی ڕێبازێکی ئەدەبی تازەو پێشکەوتوو، شان بەشانی فیکرو فەلسەفەو هونەرو ئەدەبیاتی گەلانی ڕۆژهەڵاتی دەورو دراوسێی کورد لە عەرەبو ڕۆمو عەجەم. کەڵە شاعیرانی بابان (نالی، سالم، کوردی) بەزمانی کوردی ئەو هونەرو ئەدەبەیان خستەڕوو، ئەمە لە رووی وریایی‌و هۆشیارییەوە بووە وەنەبێ هەر ڕووداوێکی رەمەکی بێ،[57] لە پێش ئەمانیشدا مەلای جزیری (١٥٦٧ – ١٦٤٠) لەژێر سێبەرو سایەی درەوشاوەی میرنشینی بۆتاندا هونەری غەزەل‌و قەسیدەی لەزمانی کوردیدا بە پۆپە گەیاندبوو. ئەم نەریت‌و میراتە ئەدەبییەی شاعیرانی بابان دایانهێنا لەباری مێژوویی‌و فەرهەنگییەوە بۆتە گەنجینەیەکی نەتەوەیی نەمرو لەبڕان نەهاتوو بۆ وەچەو نەوەکانی دوای خۆشیان. (ئەم ڕێنیسانسە مەزن‌و گرنگە لەدواییدا بووە سەرچاوەیەك بۆ گۆڕان‌و پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی لە هەموو کوردستانی باشووردا).[58]

---

(٥٧) لەلای نالی و سالم‌و کوردی کۆمەڵێ بەیت‌و بابەتی شیعری هەن کە بە ئەنقەست پێ لەسەر ئەو مەسەلەی بە کوردی گوتنەی شیعرو هۆنراوەکانیان دادەگرن بۆ نموونە:

لای نالی:

- تەبعی شەکەرباری من کوردی ئەگەر ئینشادەکا
  ئیمتحانی خۆیە مەقصودی، لەعەمدا وادەکا
- کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە، خۆکردییە
  هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنادەکا
- ئیستیتاعەو قوومتی تەبعم بە کوردی‌و فارسی‌و
  عارەبی، ئیزهاری چالاکی و چەسپانی دەکا

لای سالم:

- زێڕە، سەرمایەیە بۆ (سالم)و کرمانی دەبا
  شیعری کوردی کەبدا جیلوە لەلای شێخی کەبیر
- مەهی فارس زبانەم گوفت (سالم) شەرحی حالت گۆ
  گوتم جانا، بەلەد نیم ئیستیلاحی ئێوە، من کوردم

لای کوردی/

- دوڕو یاقوت دەبارێ لەم کەلامە شیرینەی کوردی
  خوا ساکوا لە دنیادا قەدرزان‌و خەریدارێ

(٥٨) مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، ب٣: ٣٦.

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا لەدوای ئەوەی خۆری میرنشینە کوردییەکان، لە (ئەردەلان، بابان، سۆران، موکریان) بەرەو ئاوابوون چوون، ژیلەمۆی ئەم بزووتنەوە ئەدەبیو رۆشنبیرییەی لە ناوچەی سلێمانی (مەڵبەندی بابان) هەڵایسابوو نەکوژایەوە، بەڵکو لە رێڕەوی شیعرو ئەدەبیاتدا لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم نالیو هاورێکانی لەمەسەکی ئەشعاردا گیانی کوردایەتیو کوردەواریان زیندوو کردەوەو[59] ئەو زمانەی کە ئەوان شیعرو بەرهەمەکانیان پێ تۆمارکردبوو لە سۆنگەی رەسەنایەتی قوتابخانەکەوە بەردەوامیی وەرگرتو لەم رەوتەدا بوو بە زمانێکی ئەدەبی باوو شێوە رەسمیو،[60] پەیتا پەیتاش هەموو ناوچەکانی کوردستانی باشووری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەم زاڵ بوونو پەرەسەندنەی شێوەی بابان لەهەندێ ناوچەدا لەژێر حیسابی شێوەی گۆرانی بوو[61] بەتایبەت لە ناوچەکانی کەرکوكو گەرمیان. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە نەوەی دووەمی شاعیرانی قوتابخانەی نالی لەناوچە جیاجیاکانی کوردستانی باشوور (سلێمانی، گەرمیان، سۆران، ئەردەلان، موکریان) لەوێنەی (مەحوی، شێخ رەزا، حاجی قادر، سالمی سنە، وەفایی) پەیدابوون، کە هەریەکەیان بە ئاڵا هەڵگرو بەردەوامیو تەواوکەری ئەو قوتابخانەیە لە ناوچەکانی خۆیان حیساب دەکرێن.[62] لێرەدا هۆکاری یارمەتیدەری یەکەم، بۆ پەل هاویشتنو بڵاوبوونەوەی بزووتنەوەی شیعری نالی لە ناوچەکانی موکریان، بۆ ئەو پەیوەندییە مێژووییە بەهێزە دەگەڕێتەوە کە لە نێوان بابانو موکریاندا هەبووە، هەم لەباری یەکێتی بنەچەو رەگەزو تیرەو تایفەوە، هەم لە رووی دیالێکتی زمانو ئاخاوتنەوە.[63] سەرچاوە مێژووییەکان پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشن کە میرانی بابانو موکریان لە بنەچەو خانەوادەوە لەیەك تیرەو تایفە بوون،[64] هەروەها زمانو دیالێکتی قسەکردنی هەردوو هەرێمو میرنشینەکە لە زەمانی زوودا وەکو یەك بوون،

---

(٥٩) عیبرەتە گ/ رۆژی کورد، ژ/ ٢، ل٢٣.

(٦٠) لە ساڵی ١٨٦٩ یەکەمین قوتابخانەی (روشدیە)ی عوسمانی لە سلێمانی کراوەتەوە، کە زمانی دەرسو خوێندن تیایدا بەشێوەی سلێمانی (بابان)ی بووە. بڕوانە:

ـ سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بـ١: ١٤٧.

(٦١) مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، ب٣: ٣١، ٢٠٠.

(٦٢) مێژووی ئەدەبی کوردی، دمارف خەزنەدار، ب٤: ٢٣

(٦٣) مێژووی ئەدەبی کوردی، دمارف خەزنەدار، ب٤: ٢٣

(٦٤) شەرەفنامە: ٥٣.

تەنانەت شێوەی ئاخاوتنی بابانەکانو شیعری (نالی)یش هەندێ جار بە موکری دەدرێتە قەڵەم.[٦٥] بەو هۆیەش کە هیچ لەمپەرو سنوورێکی خەتکێشراو لەنێوان ئەم دوو هەرێمەو میرنشینە کوردییەکەدا لە نێواندا نەبووە،[٦٦] ئەنجا چەپەری مزگەوتو گەڕانو سووڕان بەدوای خۆپێگەیاندنو فێربوونی زانستە ئاینییەکان روویەکی دیکەی ئەو تێکەڵاویو ئاشنایەتییە بووە، بۆ نموونە شێخ مارفی نۆدێ رابەرو دامەزرێنەری تەریقەتی قادری لەسەردەستی هەردوو زانای ناوداری خەڵکی موکریان، ئیبن الحاج و بێتووشی زانستەکانی ئاینی ئیسلامەتیو ئیلهامی شیعرو ئەدەبیاتی وەرگرتووە.[٦٧] هەروەها سەرچاوەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی ئاماژە بۆ چەند بەرهەمێکی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا دەکەن که پێش رۆژگاری (نالی)ش دەکەون،[٦٨] بۆیە کارێکی زۆر ئاساییە کە بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی لەسەدەی نۆزدەیەمدا لە موکریان رەنگبداوەتەوەو لەیەکچوونی زمانو هامشۆو تێکەڵاویو لەیەك نزیکیو نەریتی کۆمەڵایەتی، ببێتە هۆی ئەوەی کە رووناکبیرانی موکریان ئەو ئەدەبەی لە ناوچەی سلێمانی سەریهەڵداوە بەهی خۆیانی بزاننو لاسایی بکەنەوە.[٦٩] بەم جۆرە غەزەلو قەسیدەکانی نالیو سالمو کوردی لە کەشکۆڵو بەیازو حاشیەو پەراوێزی کتێبە ئاینییەکاندا، لەپاڵ شیعری حافزو مەولاناو جامی لە گۆشەی مزگەوتو حوجرەو مەدرەسەو خانەقاکانی سابلاغو بانەو سەقزو بۆکاندا لەناو فەقێو مەلاو موستەعیدو رۆشنبیراندا دەستاو دەستی دەکردو زەوقو سەلیقەو چێژی ئەدەبی هۆگرانی شیعری کوردی پێ ئاودەدرا.

**( ٢ ) شیعرو بەرهەمی نەوەی یەکەمی شاعیرانی موکریان ( نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست ) :**

أ. **سەرەتاو سەرهەڵدان/** ئەو بزووتنەوە ئەدەبییەی نالیو هاوڕێکانی لە سلێمانی پایتەختی میرنشینی باباندا رەنگرێژیان بۆ کردو دایان مەزراند، بڵێسەکەی هەر لە سنورو چوارچێوەی موڵکی باباندا نەمایەوە، بەڵکو بوو (بەو مەشخەڵەی کە ئاگرێکی

---

(٦٥) مێژووی ئەدەبی کوردی، علاءالدین سجادی: ١٦٧.

(٦٦) مێژووی ئەدەبی کوردی، دکتۆر مارف خەزنەدار، ب٤: ١١.

(٦٧) البیتوشی: ٣٠.

(٦٨) تاریخ فرنگ وادب مکریان، ج٢: ٣١٩.

(٦٩) مێژووی ئەدەبی کوردی، دکتۆر مارف خەزنەدار ب ٣: ٢٣.

وای داگیرساند کە لە ماوەیەکی کەمدا هەموو ئەو ولاتەی "بابان‌و سۆران‌و موکریان‌و ئەردەلان‌و دەشتی گەرمیانی کوردستانی ناوەراست" رووناك بکاتەوە).[70]

زمان‌و شێوازو هونەرەکانی شیعری ئەو قوتابخانەیە بوو بە مۆدێلی شیعرو ئەدەب لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی خوارووداً. بەتایبەتیش لە ناوچەی موکریان. لە سۆنگەی گەلێ هۆکاری یارمەتیدەرو هاوبەش، لەوانە یەکێتی شێوە زاری ئاخاوتن‌و یەك رەچەڵەکی‌و خانەوادەیی لەنێوان میرانی بابان‌و سەردارانی موکری‌و هاوتایفەیی هۆزو تیرەو خێڵەکانی سنووری قەڵەمرەوی هەردوو هەرێمەکە... پێشوازیەکی گەرموگوڕی لێکرا لەلایەن ئەدیب‌و زاناو شاعیرانی ئەو مەڵبەندەوە، کە لەوەو پێش زیاتر دامەنگیری رووناکبیریی ئیسلامەتی‌و زمان‌و ئەدەبیاتی فارسی‌و عەرەبی بوون. جا بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم دەستەیەك بوێژو شاعیری ناودار لە موکریان هەڵکەوتوون کە بەچاولێکەری‌و دووبارە کردنەوەو لاسایی قوتابخانەی شیعری بابان سامان‌و ئەزموونێکی شیعری رازاوەیان لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی پێکەوەناوە.دیارە بەر لەو مێژووە واتە لەسەدەی هەژدەیەم لەو ناوچەیە شیعری کوردی لە قاڵبی ئەدەبێکی کلاسیکی بەرزو پتەوو هونەریدا نەمەیبوو، ئەوەی کە هەبوو بریتی بوو لە:

١. گەنجینەیەکی بەهادارو دەوڵەمەندی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی لەنموونەی بەیت وگۆرانی‌و حەیران‌و چیرۆك‌و داستان‌و پەندو مەتەڵۆکە....کە لە راستیدا موکریان یەکێکە لەمەڵبەندە بە پیت‌و برشت‌و دەوڵەمەندەکانی کوردستان لەو مەیدانەدا.

٢. ئەدەبی میللی کوردی، یاخود شیعری ئاینی کە لە شێوەو قاڵبی ئەدەبێکی میللیدا خۆ دەنوێنێت‌و، بە زمانێکی ساکارو شێوازێکی رەوان هۆنراوەتەوە لەشێوەی پەندو ئامۆژگاری ئاینییدا لەناوەوە بووە[71] تاوەکو زۆربەی خەڵك بەئاسانی تێی بگات لە نموونەی چوارینەکانی (مەهدی نامە)ی ئیبنولحاج.[72]

---

(٧٠) نالی‌و زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی: ٤.

(٧١) سەرچاوەی پێشوو: ١٩.

(٧٢) لە پێشەکی‌و شەرحی دیوانی شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانیدا بیروڕایەکی جیاواز سەبارەت بە دانەری (مەهدی نامە) خراوەتە روو. بڕوانە:

– دیوان‌و شەرحی حالی شێخ ئەحمەدی کۆر: ٧.

لە نیوەی دووەمـی سـەدەی نـۆزدەوە سـەداو زایەڵەی بزووتنـەوەی شـیعریی ناوچـەی سلێمانی باشووری کوردستان لـە ناوچـەی موکریـان دەنگـی داوەتـەوەو شـاعیرانی ئـەو مەڵبەنـدە لەسـەرەتاوە بـوون بـە شـاگردو موریـدی ئـەم قوتابخانـەیە. لەپاشـاندا لـە مەڵبەندەکـەی خۆیانـدا بـوون بـە رێبـەرو ئـاڵا هـەڵگری رێبازەکـەو ئەوەنـدەی لـە توانایاندا بووبێت تاویان پێسەندووەو پەرەیان پێداوەو گەشەیان پێکردووە، تا ئەوەی لەدواییـدا بـووە بـە رێبـازو رێـچکەیەکی شـیعری دەوڵەمەنـدو رژاوەتـە نێـو سـامان و دەریـای ئـەدەبیاتی کوردییـەوە. بـەم پێیـە وەکـو دیـار دەکـەوێت دەورەی یەکـەمی شـاعیرانی موکریـان، لەوێنـەی ئەحمـەدی کـۆری موکریـانی (؟ - ١٨٨٦)، مـیرزا عبدالرحیمی وەفایی (١٨٤٤ - ١٩٠٢)، مەجدی مەلیکولکەلام (١٨٤٩ - ١٩٢٥)، حەریق (١٨٥٦ - ١٩٠٩)، ئـەدەب (١٨٥٩- ١٩١٦)، ئـەدیب (١٨٧٤-١٩٣٢) لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی نـۆزدەو سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا کـاروانی شـیعرو ئـەدەبیاتی کلاسـیکی کوردییـان لـە مەڵبەندی موکریان وەرێ خستووەو رێرەوەکەیان رەنگرێژ کردووە.

ب. قاڵب و رووخسـارو شـێواز/ شـەقڵ و ئـەدگارە گـشتییەکانی بەرهـەمی ئـەدەبیی شـاعیرانی ئـەو دەورەیـە هـەم لـە رووی روخسـارو هـەم لـە رووی ناوەرۆکـەوە بەشـێوەیەکی گـشتی هـەر درێژبوونـەوەی قوتابخانـە شـیعرییە عەرووزییەکـەی (کرمانجی خواروو) بووەو چ لەباری فەرهەنگی زمان و زاراوەوە چ لەباری ستراکتوورو تـەکنیکی دارشـتنی شـیعرو چ لـەباری واتـاو مەبەسـتی شـیعرییەوە خۆیـان لـەو قوتابخانەیە دانەبڕیوە.[٧٣] لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئەزموونە ئەدەبییە هـەر لـە رۆژگـاری بەراییـەوە خـاوەنی (جۆرێـك لـە تایبەتمەنـدی و نیـشانەی تایبـەت بەخۆشـیەوە بووە).[٧٤] لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێ خاسیەت و لایـەنی تایبەتمەنـدی بەرهـەمی ئـەدەبی نەوەی یەکەمی شاعیرانی موکریان کارێکی پێویستە:

١. واقیعی دابڕان و دابەشبوونی خـاکی کـورد لەیـەکتری کـارێکی وایکـردووە کـە ژیـانی ئەدەبی و رۆشنبیری هەر بەشێك بکەوێتـە ژێـر بـاری خوێنـدەواری رووناکبیریی ئـەو وڵاتانەو گەلانی سەردەستەوە کە لەگەڵیانـدا دەژیان، (ئەمە بۆتە هۆی ئـەوەی هەنـدێ خاسـیەتی هـەرێمیی لـە ئـەدەبی کـوردی ئـەم هەرێمـە جیاوازانـەدا پەیـدابێ، واتـە ئەدەبی هەر لایەك شێوەو ناوەرۆکی تایبەتی خۆی هەبێ و لە ئـەوانی تـر جیابێتـەوە،

---

(٧٣) هێمن – لە بارەی ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی شیعرەکانی: ١٠.

(٧٤) هەڵوەستەیەك لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی رۆژهەڵاتی کوردستان، گ/ بیری نوێ، ژ/١٨: ٦٦.

ئەگەر چی لە بنچینەشدا دیارە هەمووی هەر یەك ئەدەبە).[٧٥] بۆیە لەم لایەنەوە ئەزموونی شیعری موکریان بە چڕی کەوتۆتە ژێر کاریگەری رووناکبیری و ئەدەبیاتی فارسییەوە بەشێوەیەکی وا کە بەرهەمی شاعیرانی دەورەی یەکەم سێبەری بەرهەمە کلاسیکی و ئەفسانەییەکانی ئەدەبی فارسی بەئاشکرا پێوە دیارە.[٧٦]

٢. لەبارەی زمانی ئەدەبییەوە شاعیرانی ئەم دەورەیە تێکۆشاون خۆیان توند بە زمان و فەرهەنگی شیعری بابانەوە گرێ بدەن و تەنانەت وەکو زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی پەیڕەویان کردووە،[٧٧] وەلێ لەپاڵ ئەوەشدا کە هەر یەکێك لەم شاعیرانە کەسایەتی و خسووسیاتی ئەدەبی و هونەریی تایبەت بەخۆی رەنگڕێژ کردووەو پاراستووە، هەر هەموشیان لە هەڵبژاردنی وشەو زمانی شیعری و لیکسکیۆنی ئاخاوتن و دارشتنی شێوازی ئەدەبیدا، لەژێر تاوی شێوە زارو بەشە دیالێکتی ناوچەی موکریاندا بەهرەی هونەرییان پژاوەو بەرهەمی ئەدەبییان داهێناوە، واتە رەگەزێکی تایبەت بەخۆیان ئاوێتەی ئەم زمانە ئەدەبییە کردووە، ئەمەش بە یەکێك لە رواڵەت و تایبەتمەندییەکانی شیعری ئەو ناوچەیەی کوردستان دەژمێردرێت.

٣. لە رووی قاڵبی هونەری و تەکنیك و ستراکتووری دارشتنی شیعرەوە هەردوو فۆرمە ناودارەکەی (غەزەل و قەسیدە) کە قاڵبی هونەریی هەرە باوو بڵاوی شیعری کلاسیکی کوردییەو لەبەرهەمی شاعیرانی دەورەی یەکەمی موکریانیش پانتاییەکی بەرچاوی داگیرکردووەو بە فراوانی رەنگی داوەتەوە، لەوەش بەولاوە ئەوەی لەبەرهەمی شیعریی ئەم دەورەیەی موکریاندا مایەی سەرنجە بایەخ دانە بە قاڵبی هونەری (پێنجین)و (تەرجیع بەندە) کە بەرهەمی هونەریی نایاب و ناوازەیان لەو فۆرمە پێداهێناوە. لەو بوارەدا شوێن پەنجەی (وەفایی، شێخ ئەحمەدی کۆر، ئەدەب) روون و دیارە، جگە لەوەش شاعیرانی ئەم دەورەیە لایان لە هونەرەکانی دیکە تەکنیك و قاڵبی شیعری کردۆتەوە، لە وێنەی (تەرکیب بەند)، (تێکهەڵکێش — تەزمین)، (پێنج

---

(٧٥) شیعری کوردی/ سیاسەت-کۆمەڵایەتی-کوردایەتی- نێوان هەردوو جەنگی گێتی: گ/ رۆشنبیری کوردستانی، ژ/١: ٥.

(٧٦) بڕوانە:

- شاعیرانی کوردو ئەدەبیاتی فارسی: ٥.

- تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبی کوردی: ٧٢.

(٧٧) نالی و زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی: ٥٥.

خشتەکی)و[٧٨] هەروەها بایەخیان بە هونەری (چوارین)، (مولەمەع) و (مەسنەوی)یش داوە.

ج. بابەتی شیعری/ زۆر لە راستیو هەقیقەت لانادەین کە بڵێین بابەتی شیعری ناوچەی موکریان بەشێوەیەکی گشتی لیریکە، بەو پێیەش ئەو پێناسەیەی ئەوروپاییەکان بۆ ئەم جۆرە شیعرەیان پەسەندکردووە کە ئەدەبێکی خودییەو تەعبیر لە سۆزو هەستو ناخو دەروونی شاعیر دەکات لە بەرامبەر هەموو دیاردەکانی سروشتو ژیان.[٧٩] ئەو کاتانەی شاعیر هەڵدەچێو بەخۆیەوە دەنازێو شانازی دەکات، یا ستایشی کەسێك دەکات یا دەکەوێتە زەمو داشۆرینی یەکێك، یا ئەوەتا لەناو شینو لاواندنەوەو وەسفو جوانیو ئەوینو دڵداریدا دەتلێتەوە.. لە هەموو ئەم بابەتانەدا، لەسنووری لیریك دەرناچێتو تەنانەت کاتێك بەشی هەرە زۆری هۆنراوەکانی (وەفایی)و (ئەدەب)و شاعیرانی تر بە گۆرانی دەگوترێنەوە ئەوا رێك لەگەڵ بنەماکانی شیعری لیریکی یۆنانی یا گریگی رۆژئاوا تێك دەکاتەوە.[٨٠]

د. مەبەستو ناوەرۆك/ بە پێودانگی شیعری کلاسیکی کوردی لە سەدەی نۆزدەیەمدا هەموو دیوانو بەرهەمی شیعری شاعیرانی ئەو دەورەیە بەشێوەیەکی گشتی لە رووی ناوەرۆکەوە لە دەوری چەند بابەتو مەبەستێکی شیعریدا دەخولێنەوە، کە دەکرێ لەژێر ئەم چەند ناونیشانانەدا کۆبکرێنەوە:

١. شیعری ئاینی:

أ. موناجات ب. نەعت ج. سۆفیزم

٢. ئەوینداری ٣. وەسف ٤. ستایش ٥. ماتەمنامە ٦. فەلسەفەی کۆمەڵایەتی

مەبەستو بابەتی ئاینی بەهەر سێ لقەکەیەوە لە سەرجەمی بەرهەمی شیعری شاعیرانی دەورەی یەکەمی ناوچەی موکریاندا بە بەراورد بە مەبەستەکانی دیکە ئەوا لە هەموویان زیاترەو پشکی شێری بەردەکەوێت. دوای ئەوە شیعری عیشقو

---

(٧٨) بڕوانە:

- مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، ب١: ١٦٦،١٧٦.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار ب٤: ٣٤٨.

(٧٩) موسوعة نظرية الادب، الشعر الغنائي: ٦.

(٨٠) تاريخ الادب العربي، العصر الجاهلي: ١٩٠.

ئەویندارى بە پلەى دووەم دێتو شاعیرانى موکریان لە مەیدانى داهێنانو تۆمارکردنى پارچەى ناسكو پاراوو جوانى غەزەلیاتدا، گۆى هونەریان لەمەیدانى ئەدەبیاتى کوردیدا بۆ خۆیان بردۆتەوە.[٨١] دواتریش بەرهەمى هونەرى لە بابەتى وەسفو ستایشو ماتەمنامەو بوارەکانى دیکەى فەلسەفەى کۆمەڵایەتى لە دیوانى شیعرو بەرهەمەکانى ئەو دەورەیەدا بەروونى بەدیار دەکەوێت.[٨٢]

## ٣. ئەزموونى شیعرى ناوچەى موکریان

پێکهاتنو پەرەسەندن/ دەستەى یەکەمى شاعیرانى موکریان، لە رێگەى شیعرو بەرهەمەکانیانەوە پێرەوێکى کولتوورىو هونەرییان لە نیوەى دووەمى سەدەى نۆزدەیەمەوە لەم پارچەیەى کوردستان دامەزراند. ئەم سامانو گەنجینە هونەرییە بوو بەو بەستێنو بنچینەیە کە پاشان لەگەڵ رەوتى رۆژگاردا کۆشكو تەلارى ئەدەبیاتى ناوچەى موکریانى لەسەر دامەزرا. لە سەردەمانێکدا شیعر گوتن بە زمانە رۆژهەڵاتیەکانى بێگانە، بەتایبەت (فارسى) لەو بەشەى کوردستانیشدا باوبووەو بەرهەمێکى زۆرى بوێژو زاناو رووناکبیرانى کورد بەو زمانە لەئارادا هەبوون، وەکو

---

(٨١) لە دوایین چاپى دیوانى (ئەدەب)داو لە کۆى (١٣٢) پارچە هۆنراوەو شیعرى کوردى کە لە دیوانەکەدا هاتووە تەنها (٢) پارچە شیعرى ئایینى لە خوا پاڕانەوەى تێدایە کە لە سەرەتاى دیوانەکەدا هاتووە، لەگەڵ (٢) پارچەى پێنجین، کە ئیدى لەوە بەولاوە هەموو شیعرە کوردییەکانى کە (١٢٩) پارچەیە هەموو لیریکى دڵدارین، واتە (غەزەل)ن، بۆیە جێى خۆیەتى کە میسباحودیوانى (ئەدەب) بە شاسوارى غەزەلى کوردى لەو ناوچەیە بێتە ناسین.

بڕوانە:

- دیوانى ئەدەب، محەمەد حەمە باقى، دەزگاى چاپو بڵاوکردنەوەى ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.

(٨٢) شاعیرانى ئەو سەردەمە وەکو لە لاپەڕەکانى پێشوودا باسى لێوەکراوە زۆر بە خەستى کەوتونەتە ژێر کاریگەریى شاعیرانى سێ کوچکەى بابان( نالى و سالمو کوردى) بەتایبەت (نالى) رابەرى بزووتنەوەکە. لە مەیدانى چاولێکەرىو لاسایى کردنەوەیدا بەتایبەت لە بەرهەمە شیعرییەکانى (وەفایىو حەریقو ئەدەب)دا بابەتى هەمەچەشنەمان بەرچاو دەکەوێت کە لە ژێر کاریگەریى بەرهەمەکانى ئەواندا داهێندراون. لە وێنەى (نەقیزەدژ) یا (وەڵامە شیعر – جوابە جەنگ) یا لاسایىو لە چاوکردنەوە، وەك لە (مەستوورەى – نالى)و (شیرین تەشى دەرێسێ – وەفایى)و (پێنجینەکەى نوسرەت خانمى – ئەدەب)دا دیارە، یا وەکو وەڵامدانەوەى (حەریق)و (ئەدەب) بۆ شیعرى (عیشقت کە ماجازى بێ)ى نالى و زۆر بابەتى تریش، بەڵام ئەوان لە چاولێکەرىو لاسایى کردنەوەدا بەرگى ناوچەیى خۆیان لەبەر وەڵامەکانیان کردووە.

ڕەنگدانەوەیەکی سروشتیو بابەتی باری ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە.[٨٣] بەلاّم ئەم بابەتو بەرهەمە ئەدەبییە ناچێتە ناو خانەی سامانو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە تا ئەو کاتەی شاعیرانی وەکو (وەفایی)و (حەریق)و (ئەدەب) هاتوون ڕێچکەکەیان شکاندووەو زمانی کوردیان کردۆتە زمانی شیعرو بەرهەمی ئەدەبیو داهێنانو، کارێکیان کردووە کە لە چوارچێوەی بزووتنەوە تازەکەی شیعری کوردی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، هەوارگەیەك بۆ شیعری کوردی لەو ناوچەیە بنیاتبنێن، کە دواتر بوو بە سەرچاوەو بنەمای بزووتنەوەیەکی ئەدەبیی تازەو باو لەو هەرێمەداو ئەنجا توانی کاروانێکی بێپسانەوە لە شیعرو شاعیران بۆ ماوەی سەدەو نیوێك بەرێ بخاتو سامانو ئەزموونو تاقیکردنەوەیەکی ئەدەبیی تایبەت بەو ناوچەیە پێك بهێنێت.[٨٤] ئەم ئەزموونە لەفرەییو بەرزیو ڕەنگاو ڕەنگیدا بوو بە کەلەپوورێکی پێشکەوتووی داهێنەرانەو[٨٥] مایەی گۆڕانو پێشکەوتنێکی مەزن لەباری رووناکبیریو خوێندەواری لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستاندا.

لە موکریان کە باس لە شیعری کوردی بکرێت لەپێش (وەفایی)یدا شاعیرێك بەدی ناکەین کە زمانی کوردی بەم فراوانییە کردبێتە زمانی شیعرو بەرهەمو داهێنانی، تەنانەت وەفایی لە قوتابخانەو مەدرەسە تایبەتیەکەشیدا هونەرەکانی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی فێری شاگردەکانی کردووە.[٨٦] هەواو ئاوازی شیرینو دلّڕفێنیشی بۆ شیعرەکانی خۆی داناوە کە بەو هۆیەوە شیعرو هەلّبەستەکانی لەرێگای ئاهەنگو گۆرانییەوە بەهەموو شارو دێهاتەکانی کوردستاندا بلاّوبۆتەوە.[٨٧] ئەم مەسەلەی بە ئاوازکردنی شیعرەکانی ناچاری کردووە کە هەندێ لە بەرهەمەکانی لەسەر کێشی شیعری میللی کوردی بهۆنێتەوەو[٨٨] هەروەکو لە هەلّبژاردنی وشەی بەسۆزو ناسكو خۆمالّی پەتیدا شیعرو بەرهەمەکانی بە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی وشەی کوردی دادەندرێت لەکاری زمانو فەرهەنگ نووسیدا.[٨٩]

---

(٨٣) دیداری شیعری کلاسیکی کوردی: ٧٦.

(٨٤) هێمن- لە بارەی ناوەرۆکی سیاسیو کۆمەلاّیەتی ناوەرۆکی شیعرەکانی: ٩.

(٨٥) مؤسس الادب الکردي الحدیث في کردستان الجنوبیة، مجلة شمس کردستان، ع/ ٥، ٦: ١٣.

(٨٦) (٨٧) دیوانی وەفایی، چاپخانەی کوردستان: ١٤٥.

(٨٨) مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەدار، ب٤: ٣٧٥

(٨٩) دیوانی وەفایی، محەمەد عەلی قەرەداغی: ٣٤.

(٩٠) مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، ب٤: ٤٣٦، ٤٣٧.

شیعرو بەرهەمی مەلا سالحی حەریق تایبەتمەندی هونەریو جوانکاری خۆی هەیە، سۆفیزم وەکو چەمكو تێگەیشتن لەلای ئەو شوێنی ئایدیۆلۆجیای گرتۆتەوەو بەتەواوی باوەڕی پێی هەبووەو هەر بەو چاوەش وەکو (سالیکی ڕێگای هەقیقەت) سەیری هەموو دیاردەیەکی کردووە.[٩٠] ئەگەر وەفایی لە مەیدانی قوتابخانەی شیعری کوردیدا لە موکریان پێش کاروانو ڕچەشکێن بێت، ئەوا لەو هەرێمەدا ڕێبازی شیعری کوردی لەسەر دەستی حەریق بڵاوبۆتەوەو باوی سەندووەو[٩١] بە یەکێك لە شاعیرە مەزنو گەورەکانی ئەو مەیدانە سەیردەکرێت.[٩٢] میسباحودیوانی (ئەدەب) شاعیری غەزەلی واقیعیو شاگردی قوتابخانەکەی وەفایی بووە،[٩٣] (هۆنراوەکانی ئەدەب نرخێکی ئێستاتیکی تایبەتییان هەیە لە ئەدەبی کوردیدا، وە هۆیەکی گرنگ بوون بۆ بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنو گۆڕانی ئەدەبی کوردی لەناوچەی موکریان)[٩٤] جوانی لە گوزارشتو ڕەوانی لە زمانو ڕەنگدانەوەی خۆشگوزەرانیو بەختەوەری لەژیاندا، بەرهەمەکانی ڕازاندۆتەوە، بەو پێیە بەئاسانی دەچێتە ناو دڵانەوە.
وەفاییو حەریقو ئەدەب شوێنی سێ قۆنگرە، یاخود سێ هەرەمیان لە شیعری ناوچەی موکریان پێکهێناوە لەتەك ئەوانەشدا شاعیرانی لەوێنەی شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی کە خاوەنی گوڵزارێکی ناوازەیە لەلالە زاری شیعری کوردی لە ناوچەی موکریانو.[٩٥] (مەجدی – مەلیکولکەلامی سەقزی)و ئەدیبو مەجدی

---

(٩١) هەواری خالی ، سەرجەمی نووسینی هێمن: ٣٥ ،٧٢
(٩٢) نووسەرانی مێژووی ئەدەبی کوردی مەلا سالحی حەریقیان لەریزی شاعیرانی ناوچەی بابان (سلێمانی) ریز بەندی کردووە. راستە حەریق شاگردو موریدی بلیمەتی قوتابخانەی شیعری بابان بووەو هەر لەو دەڤەرەش هاتۆتە جیهانو پێگەیشتووە،، بەڵام ژیانی ئەدەبی ئەو زاتە لە موکریان دەست پێدەکاتو هەر لەوێش تەواو دەبێت، بۆیە لەریزی شاعیرانی ئەو مەڵبەندە دەژمێردرێت.
بڕوانە:
- شیعرو ئەدەبیاتی کوردی: ١١٩.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سجادی: ٤٢١.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، ب٤: ٤٢٥.
(٩٣) دیوانی وەفایی، چاپخانەی کوردستان: ١٤٥.
(٩٤) عەبدوڵڵا بەگی میسباح - دیوان: ١٣.
(٩٥) بڕوانە:
- دیوانی شێخ ئەحمەدی کۆر، ناشر- سەید نەجمەدینی ئەنیسی "بەهار"، ١٣٧١.
- دیوانو شەرحی حالی شێخ ئەحمەدی کۆر، عەزیز موحەممەد پور، تاران، ١٣٧٨.

مهابادیو سەید رەشیدو عەلی بەگ سالار سەعیدی حەیدەری هەر لە ڕێڕەوانی ئەم کاروانە بوونو هەریەکەیان دەستە چیلەیەکی لە بەهرەو هونەرو داهێنانی ئەدەبی خستۆتە سەر ئەو خەرمانەو بەمە سامانو گەنجینەیەکی ئەدەبی دەوڵەمەندو رازاوە لەو ناوچەیە پێکهاتووەو پەرەی سەندووە.[٩٦]

لەسەرەتای سەدەی بیستەمو سەروبەندی جەنگی جیهانیی یەکەم (١٩١٤ — ١٩١٨) شاعیرانی دەستەی یەکەمی موکریان بەهرەو بەخشینی هونەریان دەوەستیو قۆناغەکەیان بەسەردەچێ، کۆمەلگەی کوردەواری لەو بەشەی کوردستاندا ژانی قۆناغێکی تازە لە گۆڕانکاری مێژوویی- کۆمەلایەتیو سیاسی دەگوزەرێنێو لە ئاکامیدا دەستەیەکی دیکە لە شاعیرانی ناوچەی موکریان لە سالانی نێوان هەردوو جەنگدا پێڕادەگەن، لە وێنەی مەلا مارفی کۆکەییو ئەبولحەسەنی سەیفی قازیو مستەفا شەوقی کە لەسەر بنچینەو بەستێنی بەرهەمی شیعرو ئەدەبیاتی قۆناغی پێش خۆیانو بەزۆریش لەسەر هەمان شێوەو رووخساری شیعری دێرین، گۆڕانو تەکانێکی دیکە لەو رەوتە بەرپا دەکەنو شەقڵی مەبەستو ناوەرۆکێکی تازە لە کاروانی شیعری موکریانی ماوەی هەردوو جەنگدا (کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە) بەرپادەکەن.[٩٧] هەر لەسەر دەستی ئەمانەو لەدوای ئەمانەوەش کە دەشێ بە شاعیرانی قۆناغی گواستنەوەیان بناسێنین، نەوەی دووەمی شاعیرانی موکریان لەنێوەڕاستو نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە پێدەگەن، کە هەرە دیارترینیان عەباسی حەقیقی، خالەمین، سەید کامیلی ئیمامی، عەتری گلولانی (نووری)، هەژارو هێمنو هێدی دەبنو...پەرە بە قوتابخانە شیعرییەکەی موکریان دەدەن. تا ئەوەی بزووتنەوە تازەکەی شیعری کوردی (نوێخوازیو تازەکردنەوە) لە دەیەی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا لەسەر دەستی نەوەیەکی بزۆزو چالاك لەوێنەی (عەلی حەسەنیانی، فاتحی شێخ الاسلامی، سوارەی ئیلخانی زادەو عومەری سوڵتانی و عابدی سیراجەدینی...) دێتە ئاراوە.[٩٨]

---

(٩٦) نوسکارمان دەڵێ لەماوەی مانەوەمدا لە سابلاغ کە چەند مانگێك بووە (٢٠٠ قەسیدەو غەزەل)ی شاعیرانی کوردم کۆکردۆتەوە.

بڕوانە:

- تحفة مظفرية، ب: ١٦٧.

(٩٧) ڕەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان، گ / گزینگ، ژ/ ١٣: ٦٣.

(٩٨) پێشڕەوانی شیعری نوێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، گ/ پەیام، ژمارە/ ٣، ٤.

لەكۆتاييدا وەكو دەور كردنەوەيەكى مەبەستەكانى پێشوو دەتوانين بە راشكاوى پەنجە بۆ ئەوە رابكێشين‌و بڵێين كە ئەزمونى نزيك بەسەدو پەنجا ساڵەى شيعرو ئەدەبياتى كوردى لەناوچەى موكريان وەكو دياردەيەكى هونەرى لەرەوتێكى پڕ لە داهێناندا لەو ماوەيە بێ پسانەوەو پچڕان بەردەوام بووە . بە لەبەرچاو گرتنى خەسڵەت‌و تايبەتييەكانى، بەفرە رەنگى لە داهێنان‌و سيماى رەسەنايەتى و قووڵى رەگداكوتان‌و پەرەگرتن‌و بلاوبوونەوەى، دەشێ لەشێوەى تاقيكردنەوەو رێبازێكى ئەدەبى سەير بكرێت‌و لەژێر ناوى ئەزموون‌و رێنيسانسێكى ئەدەبى لە ناوچەى موكريان لە مێژووى ئەدەبى كورديدا ناودێر بكرێت.[99] ئەم رێنيسانسە ئەگەر حيسابى بنەما دێرين‌و مێژووييەكەى بۆبكەين ئەوا ئەو حەقيقەتەمان بەو شێوەيە بۆ روون دەبێتەوە:

ـ لە بنەڕەتدا لقێكە لە قوتابخانەى شيعرى كرمانجى خواروو لەوێوە سەرچاوەى هەلگرتووە.

ـ بناغە داڕێژەرەكەى ميرزا عبدولرەحيمى وەفاييەو ئەو بە يەكەمين نوێنەرى ئەم قوتابخانەيە لە ديوى كوردستانى ئێران دەناسرێت‌و هەر لەسەردەستى ئەويش‌و هەردوو مەزن شاعيرانى وەكو حەريق‌و ئەدەب لە موكريان باوى سەندووەو چەسپاوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەى يەكەم شاعيرانى وەكو شێخ ئەحمەدى كۆرى موكريانى، مەجدى (مەليكولكەلام)و مەلا رەسولى ئەديب‌و مەجدى مهاباديش دەگرێتەوە. ئەم قۆناغە ئەگەر ناوى بنێين قۆناغى يەكەم‌و دێرينى ئەدەبياتى ناوچەى موكريان ئەوا لەسەرووبەندى يەكەمين جەنگى جيهانيدا دەبڕێتەوە.

ـ بەهۆى شاعيرانى دەورەى دووەم كە ژمارەيان نزيك بە ژمارەكانى پەنجەى هەردوو دەست دەبێت‌و لەناوەراستى سەدەى بيستەمەوە لە مەيدانەكەدابوون، ئەم ئەزموونە ئەدەبيە پڕ رەنگتر دەبێت‌و خەسلەت‌و تايبەتييەكانيشى بەتەواوى بۆ پێكدى‌و مەوداى تەواوى خۆشى وەردەگرێت.

---

(٩٩) رووناكبيرى كورد (كاك سەلاحەدينى موهتەدى) لە وتارێكدا بۆ يادەوەرى سوارەى ئيلخانى زادە بەناوى (دە ساڵ دواى كاكە سوار) كە لە گۆڤارى (پێشەنگ)دا بلاويكردۆتەوە، ئامازەيەكى تايبەتى بۆ ئەم دياردەو ئەزموونەى شيعرى ناوچەى موكريان كردووە.

بڕوانە:

– سوارەو پەخشانى كوردى: ٧٧.

ـ لە نێوان هەردوو نەوەداو لەماوە ساڵانی (١٩٢٠ - ١٩٤٠) کۆمەڵێ نووسەرو شۆڕە سواری مەیدانی ئەدەب لە موکریان هەڵکەوتوون کە ئەڵقەی پێکەوە گرێدانی زنجیرەی ئەو دوو دەورەیە پێکدەهێنن.

ـ لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا نەوەیەکی نوێو شۆڕشگێڕ لە شاعیرانی ناوچەی موکریان پێدەگەن کە ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی لە بنیاتو پێکهاتەی شیعری کوردی لەو هەرێمە بەدی دەهێنن.

ـ بەم شێوەیە ئەم ئەزموونە ئەدەبییەی ماوەی سەدەو نیوێك لە تەمەنی پڕ لە بڕشتی خۆی تێدەپەڕێنێت، لەژێر ئاڵای ئەزموونی شیعری ناوچەی موکریان دەڕژێتە نێو دەریای مێژووی ئەدەبیاتی کوردییەوە.[١٠٠]

---

(١٠٠) هێمن لە بارەی ناوەرۆکی سیاسیو کۆمەڵایەتی شیعرەکانی: ٩، ١٠.

# بـــــاسی ســــێیەم

## راچەنین و گۆڕانکاری و پێشکەوتن (سەرەتاکانی سەدەی بیستەم)

ناوچـەکانی کوردسـتانی ئێـران بەتایبـەتی مەڵبەنـدی موکریـان بـەهۆی هەڵکـەوتی جیۆگرافییەوە بۆ ماوەیەکی درێژ مـەیدانی دەسەڵاتو ململانـەی نێوان هـەردوو هێـزە تـەقلیدییەکەی رۆژهەڵات (ئێرانی – عوسمانی) بووە، بۆیە هەر گۆڕانکاری و ئاڵوێرێك کـە لـە هـەناوو پەیکـەری ئـەم دوو هێـزەدا بـەرپا بووبێـت بەهـەردوو دیـوی چاکەو خراپەیـەوە ئـەوە راسـتەوخۆ لـەو دەڤـەرە دەنـگو رەنگـی داوەتـەوە. لێـرەدا زیـاتر مەبەست ئەو جولانەوەو گۆڕانو هەژانـە بنەڕەتییـە هەمـە لایەنەیـە کـە لـە ئاکامی شۆڕشی دەستووری لە سەرەتای سەدەی بیست لەهەردوو دەوڵەتی ئێرانـی – عوسمـانی بـەرپابوون. ئەمانـە بـوون بـەماکی قۆنـاغێکی نـوێ لـە هۆشیاری و بێداربوونـەوەی کۆمەڵگـەی کـوردەواری لـەباری سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و فەرهەنگییـەوە. ئـەوەی پەیوەندی بە بارودۆخی کوردستانی ئێران و ناوچەی موکریانـەوە هـەبێت دەکـرێ لـە چەند خاڵێکدا دەستنیشان بکرێت:

### ١. پەرەسەندنی هەستو هۆشی نەتەوەیی:

ناوچـە کوردنـشینەکانی ئازەربایجـانی ئێرانـی بـەهۆی پـەیڕەوی کردنیـان لـە ئـاینزای سونەو هاوسنوور بوونیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بـۆ ماوەیـەکی درێـژ کەوتبوونـە ژێـر نفـوزو دەسـەڵاتی دروشمـی پـان ئیسلامیزمی عوسمـانی.[101] بـەڵام لـەدوای هەڵگیرسـانی شۆڕشـی (١٨٨٠)ی نەهرییـەوە بـەهۆی فراوانـی شۆڕشـەکەوە بەشـداری کردنی فراوانی خـەڵکی ناوچـە جیاجیاکانی کوردسـتانو، بەتایبـەتیش موکریـان کـە شانۆیەکی سەرەکی بەڕێوەچوونی راپەڕینەکە بوو، لەدوای ئـەوەش ئـەو زوڵـمو زۆرو ناڕەواییانـەی لەلایـەن دەسـەڵاتدارانەوە دەرهـەق بـە خـەڵکی کـورد لـە ناوچـەکە لـە هـەنگاوی سـەرکوتکردنی شۆڕشـگێران ئەنجامـدرا هەسـتو هۆشـێکی نـوێو ئازادیخوازانەی لەلای دانیشتوانی ناوچەکە بەجێ هێنابوو.[102] دوای ئـەوەش شۆڕشـی

---

(101) کێشەی کورد، ب١: ٢٠٥.

(102) ناسیونالیزمی کوردی (١٨٨٠ – ١٩٣٩): ٧٨.

دەستووری عوسمانی (١٩٠٨) بوو بە زەمینە خۆشکەرێك بۆ کوردەکانی ئەوێ کە داوای گەیشتن بە ماف‌و ئازادی بکەن‌و هەستی نەتەوەیی ناسیۆنایزمی لەناویاندا چەکەرەی کردو بەتین تر بوو.[103] لە رۆژگاری مەشروتیەتی ئیران (١٩٠٥ – ١٩١١) لە شارەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان وەکو کرماشان، سنە، سەقز، بۆکان، مهاباد چەند ئەنجومەنێکی دەستورخوازی پێکهاتبوو کە ئەنجومەنی سەقز لە مەیدانی خواستە نەتەوەییەکانی کوردی ئێران لە هەمووان چالاکتر بوو.[104] ئەم ئەنجومەنە لەژێر چاودێری شاعیر، خۆشنوس‌و دادوەر مەلا محەمەدی کەریم کە نازناوی (کەوسەر)ی وەرگرتبوو پێکهاتبوو، کە رۆڵێکی بەرچاوی بینی لە هاندانی خەڵکی سەقز بۆ ئەوەی پێوەندی بکەن بە ئەنجومەن‌و هاریکاری دەستورخوازان بکەن، هەروەها لەشاری سابلاغ قازی فەتاحی مامی باوکی قازی محەمەد ئەنجومەنی دەستوورخوازانی بۆ ئەو شارە دامەزراند.[105] بەڵام بەو هۆیەوە کە موکریان ناوچەیەکی خێڵەکی‌و مەڵبەندی سەرەکی هۆزە کوردەکان بوو، سەرەك خێڵەکانیش زیاتر وابەستەی بەرژەوەندی پێکەوە گرێداوی خۆیان بە دامودەزگای دارزیوی دەوڵەتی قاجارەوەبوون، بۆیە خواستی ئەنجومەن‌و دەستورخوازەکان لەچوارچێوەی هەندێ ریفۆرمی سیاسی‌و ئیداری‌و دادوەری تێپەڕی نەکرد.[106]

لە رۆژانی هەڵایسانی ئاگری شەڕی یەکەم تورکەکان لە رێگای پڕوپاگەندەو بانگهێشتی جیهادەوە لە هەوڵی راکێشانی خەڵکیدابوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی رووسەکان لە ناوچەکەدا. ئەم باوەڕە لە رێگەی پیاوانی خۆیان بەناو رەشە خەڵکەکەدا بڵاودەکردەوە، لێرەدا مەسەلەی مەزهەبیش دەورێکی گرنگی گێڕاوە، بەڵام بەشێك لە مەلاو زاناو رووناکبیرانی کورد کە لە بەندو باوی سیاسەتی دەربارو سەڵتەنەت ئاگاداربوون لە وێنەی شێخ باباو سەرداری موکری‌و میرزا فەتاحی قازی لە دژی ئەم بوختان‌و فیشالە وەستان‌و دەیانزانی مەسەلەکە نەوەکو لە پێناوی ئاینی

(103) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ١٢٤.

(104) دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر: ٢٤١.

(105) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ١٣٤.

(106) سەرچاوەی پێشوو: ١٤٤.

پیرۆزی ئیسلام، بەڵکو بۆ هەریسەکەیە. ئینجا لەو نێوەدا (لە پاشخانی بیروباوەڕی مەزهەبییەوە مەسەلەی نەتەوەی کوردیش هاتە ناوەوە).[107]

لە سەردەمی رەزا شادا لە بەرانبەر سیاسەتی راگواستنی هۆزە کوردەکانو لە رووی زمان ئامانو یاساغکردنی جلوبەرگو رێورەسمی کوردەواری زنجیرەیەك راپەڕین لە کوردستاندا بەرپابوون، وەکو بزوتنەوەکانی سمایل ئاغای شکاك، مەلا خەلیلی گۆرەمەری، حافز سوڵتانی هەورامیو حەمە هەتیو.[108] لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیو ساڵانی دواتردا بزووتنەوە سیاسییەکەی سمکۆ سەریهەڵدا، راپەڕینی سمکۆی شکاك (١٩١٨-١٩٣٠) لە ناوچەکانی ورمێو لە مەڵبەندی موکریاندا کۆمەڵێك گۆڕانکاری مەزنی لەباری سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ خۆیدا هێنا، بۆ یەکەمجار بیری ئازادیو سەربەخۆیی (خودموختاری) لە کوردستانی ئێران هێنایە ناوەوە،[109] تەنانەت هەندێ لە مێژوونووسان سمایل خان بە یەکێك لە رێبەرەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لە قەڵەم دەدەن.[110]

لە ساڵانی ١٩٢٨-١٩٣٠ خەڵکی موکریان لە دژی سیاسەتەکانی رەزا شادا بەرێبەرایەتی مەلا خەلیل راوەستان هەموو زانایانی موکریان پشتیوانیان لەو راپەرینە دەکردو خەباتو بەرینگاری لە دژی سیاسەتە نوێباوەکانی رێژیمی پەهلەوی پەرەیسەندو هەموو لایەکی گرتەوە.[111] بەم شێوەیە دەتواندرێت کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتایی سەدەی بیست بەقۆناغی هۆشیاربوونەوەو گەشەکردنی بیری نەتەوایەتیو پەرەستاندنی راپەڕینو بزووتنەوەکانی کورد لەو پارچەیەی کوردستان بدرێتە قەڵەم.

## ٢. پەیدابوونی کۆڕو کۆمەڵی سیاسیو رۆشنبیری

بەو هۆیەی ناوچەی موکریان مەڵبەندی هۆزو عەشیرەتە کوردەکانە، ئەوانیش بەزۆری یا گوندنشین یاخود کۆچەرو نیوەکۆچەرن، بۆیە سیستێمی -دەرەبەگی- خێڵەکی عەشیرەتی بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا زاڵ بووە هەتا

---

(107) ئیرانی کە من شناختەام: ٢٣٤.

(108) کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان: ١٩.

(109) کردها: ٦٥.

(110) مێژووی کورد لەسەدەی نۆزدەو بیست دا: ٩١.

(111) بارودۆخی سیاسی کوردستان: ٣٣٦.

بەشارەکانیش ڕادەگات، (لەگەڵ ئەوەی شارنشینی لە کوردستاندا مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەڵام شارەکان لەنێو دەریای پەیوەندییە ئابوری، سیاسی، کولتورییە فئۆدالییەکاندا نقوم ببوون). [112] زۆربەی خەڵك هەم نەخوێندەواربوون هەمیش شارەکان بە گوندو دێهات گەمارۆ درابوون، بۆیە دامەزران و هاتنەکایەی کۆڕو کۆمەڵی سیاسیو فەرهەنگی لە موکریان وەدواکەوتووە. هەندێ لە پیاوانی هوشیارو ناوداری موکریان و کوردستانی ئێران لەسەرەتای سەدەی بیستەم لەتەك هەڵبژاردەیەك لە سیاسەتوان و ڕووناکبیرو ڕۆڵەی خانەدانەکانی گەلی کورد لە بەشەکانی کوردستان لە ئەستەمبوڵی پایتەختی عوسمانی کۆوەببوون، ئەستەمبوڵی ئەو سەردەمە ناوەندێکی گرنگی سیاسیو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی بوو بۆ چینی هەڵبژاردەی هەموو گەلانی ژێر قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریا، نەخاسمە دوای ڕیفۆرمەکانی دەستووریساڵی (١٩٠٨) کە کەشوهەوایەکی ئازادی داهێنابوو بۆ زاناو دڵسۆزان و خوێندەوارە کوردەکانی ئەوێ تاوەکو بیری نیشتمان پەروەریو کوردایەتی پەرەپێبدەن و بڵاوی بکەنەوە. ئەوە بوو کاتێك (کۆمەڵەی (هێڤی) لە ساڵی ١٩١٢ لە ئەستەمبوڵ دامەزرا، قازی زادە مستەفا (شەوقی) مهابادیو قازی لەتیفی باوکیو محەمەد موفتی زادەی (میهری) سنەییش لە ڕیزی ئەندام و دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە بوون. (وەکو چۆن لە ڕیزی ئەندامە چالاكو کاراو خەباتکارەکانی "کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان"یش بوون کە لە ساڵی ١٩١٨دا دامەزراوە). [113] هەروەها هەندێ لە سەرکردە کوردە ناسیونالستە ناودارەکانی ئەودەمەی دەوڵەتی عوسمانی، لە وێنەی ڕۆڵەکانی بنەماڵەی نەهری لە ساڵی ١٩١٢ (کۆمەڵەی ئیستخلاسی کوردستان)یان لە ئازەربایجان دامەزراند، کە ئامانجی یەکێتیو ئازادیو سەربەخۆیی کوردستان بوو. [114] هەر لەو وەختەدا عەبدولرەزاقی بەدرخانیش لە سەرەتایی ساڵی ١٩١٣ بە هاوکاری سمکۆی شكاكو کونسولی روسی (چاریکۆف) کۆمەڵەیەکیان لە شاری (خۆی) دامەزراندوە کە مەبەستی برەو پێدانی زانستو خوێندەواری بووە لەناو ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە ناوچەکە، کۆمەڵەی کوردیی کولتووری ڕۆشنگەری (گیخاندی) لە کۆتایی ١٩١٢و سەرەتای ١٩١٣ بە هەوڵو تەقەلای سمکۆو عەبدولرەزاق لە شاری (خۆی) دامەزراو،

---

(112) ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی: ٢٢.

(113)ژین، کۆڤارا کوردی – ترکی: ٢٩.

(114) ایرانی کە من شناختەام: ٢٣٠.

گەلێك دەوڵەمەندی كوردی دەستڕۆی تێچوو.[115] هەر لەو دەوروبەرەشدا لە ساڵی ١٩١٢ لەلایەن ژمارەیەك لە كوردی ئازەربایجان كۆمەڵەی (جیهاندانی) دامەزرێندرا كە ئامانجی ڕێبەرایەتی یەكێتی تێكۆشانی خەباتی كوردان بووە لەو ناوەدا.[116]

لە ساڵەكانی جەنگی جیهانیی یەكەمدا پێگەی كۆمەڵایەتی‌و سیاسی پیاوانی ئاینی كورد لە موكریان پتەوتر بوو بە تایبەت بنەماڵەی قازییەكان كە بۆ ماوەی یەك سەدەو لە نێوان ساڵانی (١٨٥٠ – ١٩٥٠) ڕۆڵێكی شەرەفمەندانەیان لە مێژوویی سیاسیی موكریاندا گێڕاوە، پیاوانی ئەم بنەماڵەیە لەپاڵ ڕۆڵە ئاینی‌و كۆمەڵایەتی‌و نیشتمانییەكەیاندا ڕۆڵێكی كولتووری‌و ڕووناكبیریی مەزنیشیان لەم ناوچەیەدا گێڕاوە.[117] تەنانەت پیاوێكی وەكو (سەیفولقوزات)ی مامی قازی محەمەد، خەتیبی نوێژی هەینی مهاباد، لە ساڵی ١٩١٥و لە كاتی جولانەوە ئازادیخوازەكەی شێخ محەمەدی خیابانی لە تەورێز ڕێكخراوێكی نهێنی بەناوی (بزووتنەوەی موحەمەد) لە نیشتمانپەروەرانی موكریان پێكهێناوە بەمەبەستی پشتگیری‌و پشتیوانیكردن لەو ڕاپەڕینە، سەیفولقوزات پشتیوانی لە بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازەكەی سمكۆش كردووە.[118] دوابەدوای شۆڕشی ئۆكتۆبەرو كشانەوەی لەشكری ڕوس لە ناوچەكانی باكوورو خۆرئاوای ئێرانیش زەمینەی جموجۆڵی ئازادیخوازی لای ئازەری‌و ئاشووری‌و كوردەكان زیاتر پەرەی سەند.

لە ساڵەكانی (١٩٢٧ – ١٩٣٠) كۆمەڵەیەكی بچووك لە پیاوانی نیشتمانپەروەری موكریان پێكهاتبوو، چالاكییان دەنواندو لەگەڵ ڕێكخراوی (خۆیبوون)و شۆڕشی (ئارارات)دا لە پەیوەندی دابوون‌و هاوكاریان دەكردن‌و جارجاریش پەیوەندییان بە كوردستانی عێراقیشەوە دەكرد. لە ڕێبەرە ناسراوەكانی ئەو كۆمەڵەیە قازی محەمەدو شێخ ئەحمەدی سریلاواو قازی كاكە حەمەی بۆكان‌و (مەلا محەمەد سادقی قزلچی‌و مەلا ئەحمەدی فەوزی بوون).[119]

---

(115) بوژانەوەی ڕۆشنبیری‌و نەتەوەیی كورد: ١٤٠.

(116) كوردستان لە ساڵەكانی شەڕی یەكەمی جیهانیدا: ٣٦.

(117) بارودۆخی سیاسی كوردستان: ١٦٣.

(118) مێژووی كورد لە سەدەی نوزدەو بیست دا: ٢٤٦.

(119) قافلة من شهداء كردستان ايران: ١٣-١٤.

هێمن لەوبارەوە گوتویەتی: (فەوزی بە بڕوای من یەکێکە لە گەورە پیاوانی مێژووی کوردستان، ئەو لاوە کوردانەی لە سەردەمی پاشایەتی ڕەزاخانی پەهلەویدا، کە بە تەقلیدی ئەتاتورك خەریك بوو گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بتوێنێتەوە، کوردایەتییان دەکرد یا ڕاستەوخۆ شاگردی فەوزی بوون یا شاگردی شاگردەکانی ئەو، بەتایبەتی پێشەوا قازی موحەمەدی شەهید شانازی بەوەوە دەکرد کە شاگردی فەوزی بووە).[120] هەروەها باس لەوە دەکرێت کە کۆمەڵەی (خۆیبوون) لە ساڵی ١٩٢٩دا، مستەفا شەوقی وەکو نوێنەر دەنێرێتە شاری مهاباد، بەو مەبەستەی لقی ڕێکخراوەکە لە موکریان دابمەزرێنێ‌و نیشتمانپەروەرانی ناوچەکە لە دەوری ئاڵای (خۆیبوون) کۆبکاتەوە کە ئامانجی ڕزگاری کوردستان بووە. شەوقی (٣) ساڵێك لە مهاباد بەناوی پزیشکی دەمێنێتەوەو لەو ماوەیەدا بە هاوکاری قازی‌و خەڵکانی دی، پێگەیەکی قایم لەناو خەڵکدا پێك دەهێنێت تا ئەوەی پۆلیسی ڕەزاخان پێی دەحەسێ، ئەنجا بە ناچاری بەرەو ئەستەمبوڵ دەگەڕێتەوە.[121]

لە کۆتایی سیەکانیشدا ڕێکخراوێکی سیاسی بچووك بەناوی (پارتی ئازادیخوازانی کوردستان) بە سەرۆکایەتی (عەزیز زەندی) دامەزراوە، کە لە بەیاننامەیەکیدا مزگێنیی هاتنی لەشکری سوڤیاتی‌و ڕزگاربوون لە کۆت‌و بەندی فاشیزم بە خەڵك ڕادەگەیەنێ، هەروەها خەڵك بۆ خەباتکردن هان دەدات بەمەبەستی بەدیهێنانی مافە ڕەواکانی گەلی کورد.[122]

بەم جۆرە بۆمان بەدیار دەکەوێت کە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم سەرەتای خەباتێکی ڕێکخراوەیی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕووناکبیریی ڕێك‌وپێك‌و ئۆرگانیزەکراو بووە لەڕێگەی کۆڕو کۆمەڵ‌و ڕێکخراوە جیاجیاکانەوە، کە بە دەستپێکی سەردەمی گۆڕانکاری‌و بەرەو پێشەوەچوونێکی ڕیشەیی دەژمێردرێت لە ژیانی خەڵکی ناوچەکانی کوردستانی ئێراندا. بەتایبەت مەڵبەندی موکریان، باری سیاسی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی ئەو دەڤەرە چۆتە قۆناغێکی نوێوە، موکریان ببووە لانەی گەشەکردنی بیری ناسیۆنالیزم‌و هۆش‌و ئاگایی نەتەوەیی‌و ئازادیخوازانە.

---

(120) تاریك‌و ڕوون: ١١.

(121) لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە: ١٤٧.

(122) الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية: ٢١٢.

هەروەها باری خوێندەواریو زانستو شیعرو ئەدەبیات لە سییەکانی سەدەی بیستو ماوەی نێوان هەردوو جەنگدا پێشکەوتنێکی بنەڕەتی بەخۆیەوە بینی.

**٣. بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەریو چاپو قوتابخانە**

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەپاڵ خەباتی سیاسیو کۆمەڵایەتی، ڕۆڵەکانی گەلی کورد پێیان نایە بوارو مەیدانی خەباتێکی تازەوە کە ئەویش خەباتی فەرهەنگیو ڕووناکبیریو ڕۆشەنگەری بوو، ئەوان پێیان وابوو کە بووژاندنەوەو گەشەپێدانی ژیانی ئەدەبیو ڕووناکبیری ڕۆڵێکی هەرە مەزن دەگێڕێ لە ڕزگارکردنی کوردان. دەستە چیلەی یەکەمی مەشخەڵو بلێسەی ئەم خەباتە ڕۆژنامەی کوردستان (١٨٩٨) بوو کە لەلایەن ڕۆڵەکانی بنەماڵەی بەدرخانەوە بەڕێوەبردراوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆژنامەوانی کوردی لەچاو هی گەلانی دیکە درەنگ وەڕێ کەوتووە، ئەوا لە کوردستانی ئێرانیش زیاتر وەدواکەوتووە.[123]

لە ڕۆژگاری مەشروتەدا ڕۆژنامەکانی ئێران بەتایبەتی لەتارانو لە تەورێز ڕۆڵێکی گەورەیان لە وروژاندنی هەستو هۆشی خەڵکدا دەگێڕا، لەو سەردەمانەدا تەنها لە شاری تەورێز نزیکەی (٣٠) ڕۆژنامە چاپو بڵاودەکرایەوە کە بۆ ئەو ڕۆژگارە شتێکی کەم نەبوو.[124] نۆبەرەی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە کوردستانی ئێران گۆڤارێکی مانگانە بووە بەناوی (کوردستان) کە لە ساڵی ١٩١٢دا لەشاری ورمێ چاپو بڵاوبۆتەوە، ئەم گۆڤارە ماوەی دوو ساڵ ژیاوەو[125] لەلایەن مسیونێرە ئەوروپییەکان لە ژێر چاودێریو سەرپەرشتی عەبدولڕەزاق بەدرخانو بەهاریکاریو هەماهەنگی هەریەکە لە سەید تەهای شەمزینیو سمکۆی شکاك تا ڕۆژگاری هەڵایسانی جەنگی یەکەم بڵاوبۆتەوە.[126] لە ساڵی ١٩١٣دا عەبدولڕەزاق سەرۆکایەتی کۆمەڵەیەکی کولتووریو ڕووناکبیریشی دەکرد لە (خۆی) بەناوی کۆمەڵەی (گیخاندی) کە ئامانجەکانی بریتی

---

(123) کوردو عەجەم: ٣٥٣.

(124)تاریخچە روزنامەهای تبریز در صدر مشروطیت: ١٤.

(125) ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی: ١٩.

(126) بڕوانە:

- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سجادی: ٦١٠.
- ڕۆژنامەگەری کوردی لە عیراقدا: ٥٢، ١٨٣.
- عەبدولڕەزاق بەدرخان: ٥١.

بوون له: کردنەوەی قوتابخانە، دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامەی کوردی، دانانی ئەلفوبێی تازەی کوردیو ناردنی لاوانی کورد بۆ دەرەوە بەمەبەستی خوێندن.[127]

له پاش کۆتایی هاتنی جەنگ هەردوو لاوی رووناکبیرو ئازادیخواز مستەفا شەوقیو محەمەد میهری له ئەستەمبوڵ تێکەڵ بە کۆمەڵی رووناکبیرو شۆڕشگێڕو ئازادیخوازانی کوردی دانیشتووی ئەوێ دەبنو له خزمەتکردنی زمانو ئەدەبو بڵاوکردنەوەی رووناکبیری کوردی رۆڵێکی چالاکیان گێراوە.[128] مستەفا شەوقی بە هۆنراوە پڕ له سۆزو کولو پاراوەکانی که لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری (ژین ١٩١٨ – ١٩١٩)دا (کوردستان ١٩١٩-١٩٢٠)دا بڵاوی کردونەتەوە، هەستو هۆشی لاوانی کوردی هێناوەتە جۆشو خرۆش، ئەو مرۆڤە رووناکبیرە رۆڵێکی ئەدەبیو کولتووریو کۆمەڵایەتی تەنانەت سیاسی مەزنیشی هەبووە لەو سەردەمو رۆژگارەدا.

کەسی دووەم محەمەد میهرییە، کە له بزووتنەوەی رۆشنگەریو رۆشنبیریو رۆژنامەوانی کوردیدا سەرەتای سەدەی بیست ئەستێرەیەکی دیارو مرۆڤێکی ناودار بووە. میهری کوڕی مەلا عەبدوڵلای دشەیی موفتی شاری سنە بووە، ساڵی ١٩١٢ دەچێتە ئەستەمبوڵو دەبێت بە یەکێك له زاناو پارێزەرە هەرە گەورەکانی ئەو شارە،[129] تێکەڵاوی کۆڕی رووناکبیرو شۆڕشگێرە کوردەکانی ئەوێ دەبێت، جگە لەوەی خاوەن ئیمتیازو مودیری مەسئولی گۆڤاری کوردستان بووە کە گۆڤارێکی نیوە مانگانەی (سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبیو زانستی) بووە لەماوەی ساڵانی (١٩١٩ – ١٩٢٠) له ئەستەمبوڵ بڵاوبۆتەوە، میهری بەردەوام بەهەر چوار زمانەکەی رۆژهەڵات وتارو بابەتی جۆراوجۆری تیادا بڵاوکردۆتەوە، نووسەر هاوکارێکی سەرەکی گۆڤاری (ژین)یش بووە، له زۆربەی کۆمەڵە رۆشنبیریو سیاسییەکانی ئەستەمبوڵدا چالاکانە خەباتی کردووە، بایەخی بە زمانو رێزمانی کوردی داوەو لەم بوارەدا دوو کتێبی نوسیووە بە ناوی (مقدمە العرفان)و (ئەساس). ناوبراو تا پەنجاکانی سەدەی بیست لەسەر نووسینو خەباتی رۆشنبیری بەردەوام بووە چەندین وتاری بایەخداری لەبارەی زمانی کوردییەوە له گۆڤاری (هەتاو)ی هەولێردا بڵاوکردۆتەوە[130]، لێرەدا

---

(127) بووژانەوەی رۆشنبیریو نەتەوەیی کورد: ١٤٠.

(128) ژین، کۆڤارا کوردی – ترکی: ٢٩.

(129) مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سجادی، چ٢: ٥٩٩.

(130) گۆڤاری کوردستان (١٩١٩ – ١٩٢٠): ١٣.

وەکو روونکردنەوەی لایەنێکی پرشنگدار لە مێژووی رۆژنامەوانی کوردستانی ئێران پێویستە ئاماژە بە رۆژنامەی (کورد) بکەین، کە وەکو یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە کوردستانی ئێراندا باسی کراوە. ئەم رۆژنامەیە هەواڵنامەیەکی حەفتانە بووە بەهەردوو زمانی کوردیو فارسی لەچاپخانەی (غیرەت) لەشاری ورمێ لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٢١ یەکەمین ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوە. ئەم ژمارەیە زمانحاڵو ئۆرگانی بزووتنەوەکەی سمایلخانی شکاك بووە. بە گوێرەی سەرچاوەکان ئەم ڕۆژنامەیە سێ جار ناوی گۆڕدراوە، سەرەتا بە ناوی (ڕۆژی کورد - شەوی عەجەم) بووە، پاشان بۆتە (ڕۆژی کورد)و ئەنجا (کورد). سەرنووسەرو بەڕێوەبەرەکەی مەلا محەمەدی تورجانی (قزلجی) بووەو تەنها ژمارەیەکی لێ بڵاوکراوەتەوە.(131)

لە سەربردەی چاپو بڵاوکردنەوەی رۆژنامەکە بەدیار دەکەوێت کە سمکۆ زۆر مەبەستی بووە رۆژنامەیەك دەربکات لە وێنەی زمانحاڵی بزووتنەوەکەی بێتو سووریش بووە لەسەر ئەوەی زمانی کوردی بکات بە زمانی رەسمیو سەرەکی رۆژنامەکە. وەکو چۆن پەتەو بەڵگەی ئەو باجو گومرگەی کە لە بازرگانانیان سەندووە هەم بە زمانی کوردی بووە هەم چاپکراویش بووە.(132) بەو هۆیەوەش نە ژمارەکانی گۆڤاری (کوردستان) کە لە ساڵی ١٩١٢ نە ژمارەکانی رۆژنامەی (کورد)ی سەردەمی سمکۆ کە لە ورمێ چاپو بڵاوکراونەتەوە، هیچ ژمارەیەکیان تاوەکو ئەمڕۆ لەبەردەستدانین بۆیە ناتواندرێ تیشك بخرێتە سەر ناوەرۆكو باسو بابەتەکانیان، تەنها ئەوەندە هەیە کە دەرچوونی بڵاوکراوە گەلێکی لەو شێوەیە لە هەلّو مەرجی رۆژگارێکی وەهادا بە زمانی کوردی خۆی لە خۆیدا بە کارێکی گرنگو کاریگەر دەژمێردرێت سەبارەت بە بارودۆخی ژیانی سیاسیو فەرهەنگی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بەتایبەت بۆ سنوورو قەڵەمڕەوی ناوچەی موکریان.

لەم برگە زەمانیەدا دیسان ئاماژە بۆ رۆڵی کاریگەری قازی محەمەد دەکەین کە ئەو لە ساڵی ١٩٢٢ بەدواوە بەردەوام خەریکی وانەبێژیو دەرس گوتنەوە بووە، تا لە ساڵی ١٩٢٦ دەبێت بە بەڕێوەبەری (مەعاریف) لە مهابادو لەم پێناوەدا گەلێك فێرگەو قوتابخانەی لە ناوچەکە دامەزراندووە، لەوانەش یەکەمین قوتابخانە بۆ کچان لەو

(131) هەواری خاڵی (سەرجەمی نووسینی هێمن): ١٣.

(١٣٢) سەرچاوەی پێشوو: ١٥.

مەڵبەندەدا، لەپاشان لەساڵی ١٩٣١ دەبێت بە قازی هەموو موکریان‌و تاوەکو ساڵانی جەنگی دووەم لەو پایەدا ماوەتەوە.(133)

هێمن لە باسی ساڵانی ١٩٣٠ سەردەمی رەزا شادا وێنەیەکی زیندووی لە ژیانی سیاسی‌و رۆشنبیری لە موکریاندا وەبەرچاو خستووە: (لەو سەردەمە تاریك تنوك‌و ئەنگوست لە چاوەدا لە مەڵبەندی موکریان بۆ بەرەبەرەکانی دەگەڵ سیاسەتی تواندنەوەی کورد، کۆمەڵێکی نهێنی لە زانایان‌و رووناکبیران‌و گەورە پیاوانی کورد بەرابەرایەتی مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوای نەمر، قازی بۆکان، شێخ ئەحمەدی سریلاوا، گەلێکی تر لە رووناکبیرانی ئەو سەردەمە پێکهاتبوو کە ئامانجی ئەساسی‌و هەرە گەورەیان پاراستن‌و پەرەپێدانی زمان‌و ئەدەبی کوردی بوو، کتێب‌و رۆژنامەی کوردی کە لە عێراق بڵاودەبوونەوە بە زەحمەت پەیدایان دەکردو بە ئیحتیاتەوە بەسەر لاوانی بڕواپێکراودا بڵاویان دەکردنەوە تا فێری کوردی خوێندنەوە بن، ئەوان بە تایبەتی مامۆستا فەوزی، دەستەیەك لاوی رووناکبیری پێگەیاند کە لە دوا رۆژدا شاعیرو نووسەری زۆر خزمەتکارو بەناوبانگیان لێ هەڵکەوت).(134) دیارە هەنگاوی لەم بابەتە بەدەرکردنی گۆڤارو رۆژنامەو دامەزراندنی چاپخانەو کردنەوەی قوتابخانەو بە زیندوویی هێشتنەوەی زمان‌و ئەدەب‌و کولتووری کوردەواری ئەگەر چی سەرەتایی‌و تاك‌و تەراو لەم مەلاو لەولاش بووبێت، ئەوا وەکو بەشێك لە پرۆژەیەکی ستراتیژی سەیر دەکرێت کە کورد لە بواری فەرهەنگ‌و رۆشنگەریدا پێی هەڵساوە، لەئاکامدا رەنگدانەوەی قووڵی بەسەر پێشکەوتن‌و ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری گەلی کورد لە مەڵبەندی موکریاندا هەبووە کە وەکو لانکێکی بیری سەربەستی‌و ئازادیخوازی لە مێژووی کوردستاندا حیسابی بۆ دەکرێت.

---

(١٣٣) دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر: ٢٥٨.

(١٣٤) پێکەنینی گەدا: ٦ — ٧.

# بەشی دووەم

# شاعیرانی ناوچەی موکریان
## نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم

# باسی یەکەم

## ١. مەلا مارفی کۆکەیی

أ. کورتەیەکی ژیاننامەو ناساندن:

شاعیر وەرە قوربانی قەریحەو قەڵەمت بم
بینووسە لە بۆ ئاکرەوو ئامێدو لورستان
بۆ میللەتی بێچارەیی بێ ساحێبو سەردار
بەخسوس تەبەقەی کوردی عیراق‌و عەجەمستان
بۆ ئاتییە فکرێکی بکەن فرسەتە ئەورۆ
تاکەی دەبنە چاو لەبەرو ئالەتی دەستان

گ/ نیشتمان، ژ/ ١: ٢٤

ئەگەر لە دەروازەی ئەم بانگو هاوارەی (شاعیر)، کە هەندێ جار وەکو نازناو یا تەخەلووسی شاعیر خۆیەوە لە شیعرەکانیدا هاتووە، بچینە نێو دنیای هونەرو داهێنانی شیعرو ئەدەبیاتی ناوچەی موکریان، ئەوا شوێنی بڵند گۆی رێنیسانسی شیعری ناوچەی موکریان لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بۆ شاعیری جەربەزەو بلیمەت مەلا مارفی کۆکەیی دەبێت. ماوەی ژیانی ٧١ی سالە مەلا مارف (١٨٧٤ — ١٩٤٥)ماوەیەکی مێژوو سازو پڕ کارەسات بووە، کە مەلا مارف کۆکەیی نەتەوەکەی خۆی هەستپێکردووە، بۆیە دەنگی خۆی لێهەڵبڕیوەو هاوار دەکا:

بۆ بێ خەبەرن دەوری جەهاڵەت سوپەری بوو
بێ نووورە چرای جامیعەیی با دەپەرستان
ئەورۆکە لە فەن‌و هونەرو عیلم‌و سەناییع
هەر کوردە کە بێ حیسسەیە، باقی هەموو وەستان

گ/نیشتمان، ژ/ ١ :٢٠

کۆکەیی لە ساڵی ۱۸۷٤ لە گوندی (حاجی خۆش)ی محالی شارویرانی مهاباد لە دایك بووە، لە تەمەنی ۱۲ ساڵیدا بۆ خوێندن روو دەکاتە سلێمانی و لە خانەقای (مەحوی) ماوەی دوو ساڵو نیو دەمێنێتەوە، پاشان بۆ دەڤەری خۆیان دەگەڕێتەوەو لای زانایانی نێوداری موکریان (مەلا محمدو مەلا عەلی تورجانی زادە) خوێندن تەواو دەکات. لە گوندو دێهاتی ئەو ناوە، (قاجری، سەید ئاوا، شاریکەند، قەرەکەند، زەنبیل، قەرەگوێز، دەروێشان) بە مەلایەتیو پێشنوێژیو تەدریسەوە ساڵانێك دەباتە سەر. لە ساڵی ۱۹۲٤ رووداوی کوژرانی کوڕە گەورەکەی (مەلا عەلی) بە دەسیسەی نۆکەرانو شاپەرستان، دەبێتە هۆی ئاوارەبوونی مەلا مارفو بەناچاری روو دەکاتە شاری مهابادو لە مزگەوتی (شادەروێش) دەگیرسێتەوە.

لە موکریان کە باس لە مەلا مارف بکرێ، یەکەم شت باس لەو هەژاریو نەداریو دەست تەنگیو کلۆڵیو نەگبەتییە کە ئاڵقاوی سەرتاپای ژیانی بووەو یەخەی بەرنەداوە. هێمن لەو بارەیەوە دەڵێ:(بەڵێ من پیاو بووم کە "شاعیرێك" بە کوێری لە برسانو لە خەمان عەمری خوای بە جێ هێنا. دیبووم‌و دەمزانی چەند زاناو خوێندەوارە چەند کۆمەڵناسە).[1] هاواری شاعیر شەرحو زبانحاڵی باری ناهەمواری خۆیەتی، ئەگەر بزانین لەدوا ساڵانی تەمەنیدا لە بینایی چاوانیش بێ بەش بووە:

لە سەربانی سەرم ڕاوەستە، تاوێکی تەماشاکە
کە پیریو فەقرو بێ چاوی چڵۆنم پێ دەکەن بازی
بەسەرماندا دەرێژن گێژە لووکەی نەگبەتو میحنەت
غوباری ئیفتیقارو تۆزی دەردو گەردی بێ وازی
غەمو دەردو بەڵا، چین چینو سەف سەف دەورەیان داوم
وەکو ساڵلاتو ساحێب مەنسەبانی شوورەوی و تازی
لەبەر هەیوانو نێوحەوشو حەساری مەسجیدی جامیع
بە تەنیا دێو دەچم وەك لەگلەگی مەشهوری دەریازی

**دیوانی مەلا مارفی کۆکەیی:۲۰.**

مەلا مارف شاعیرێکی بلیمەتو زرینگ بووە، پێش سەردەمی خۆی کەوتووە، لەکاتێکدا ئەو لە کۆمەڵێکی خێڵەکیو نەخوێندەوارو دواکەوتوودا هەڵکەوتووە،

(۱) هەواری خاڵی: ۹۸.

کەچی هەستو هۆشی لەسەروەی ئاستی تێگەیشتنی دەوروبەرەکەی بووە، بەگوێرەی ئەو هێماو ئاماژانەی لە ناوەرۆکی بەرهەمەکانیدا دەخوێندرێنەوە:
- شاعیر ئاگاداری تەواوی لە پێشکەوتنەکانی زانستو تەکنیکو سەنعەت لە دونیادا هەبووە، بۆیە میللەتەکەی هانداوە کە خۆ لە باوەڕو ئیعتیقادی کۆنو تەقلیدی دەربازکەنو لە هەوڵی پێڕاگەیشتنی هونەرو سەنعەتەکانی ژیانو دونیای هاوچەرخ دابن:

ئەورۆ لە فنونو هونەرو عیلمو سەنایع
هەر کوردە کە بێ حیسسەیە، باقی هەموو وەستان
بڕوانە لە نووری هونەرو شەمعی مەعاریف
تاریکە شەویش ڕۆشنە بۆتە قەمەرستان
گوێ بگرە لە رادیۆ کە بەیەك سانیە دێنێ
باسو خەبەری لەندەنو پاریسو لەهستان
بێ عیلمی سەبەب بوو کە بەخۆڕایی لەدەس چوو
میسرو حەبەشو شامو عیراقو عەرەبستان

دیوان: ١٨.

- هەستو هۆشی نەتەوەخوازیو میللەت پەروەری شاعیر لە ئاستێکی گەشاوەو پێشکەوتوودا بووە، بۆیە (مەلا مارف لە دەورانی خۆیدا بە شاعیری پێشکەوتوو ناسرابوو)،(٢) لە کاتێکدا دەبینین مانۆرە سیاسییەکان بەنهێنیو بە ئاشکرا لەنێوان زلهێزەکانی دونیاو وڵاتانی ئیستعمارگەر لە ئارادابوو بۆ بەشینەوەی میراتی وڵاتانی رۆژهەڵات، بێ ئەوەی حیسابو کتابێك بۆ گەلانی ژێر دەستەو بەشخوراوی ناوچەکە بکەن، لە کاتێکدا لە رۆژێکدا دەیان پەیمانو بەڵێن دەبەستڕانو رادەگەیەندرانو لەژێرەوەش پایماڵ دەکران، لە رۆژگارێکدا کە هێشتا هاتنە ئارای قەوارەیەکی سیاسی بۆ کوردو پێکهاتنی سیستمێکی حوکمڕانی لە شێوەی جەمهوریەتێکدا (لە وێنەی کۆماری دیموکراتی کوردستان)، لە دڵی مێژوودا نووستبوو، مەلا مارف مانیفێستی سیستمێکی سیاسی بۆ گەلی کورد پێشنیار دەکات (دامەزراندنی جمهوریەتێك لە کوردستان) کە رەنگە کەم کەس بەخەیاڵیش پەی پێ بردبێت!

---

(٢)مەلا مارفی کۆکەیی، گ/ سروە، ژ/٢٥ : ١٩.

بـــرا بـــیری چـــراییّکی بکـــەن، تاریکـــە شـــەودادیّ
قیـــامیّکی بکـــەن تـــا فرســـەتە بیکـــەن بـــە جمهـــوری

گ/ نیشتمان، ژ/٥: ١٩.

- مەلا مارف زاتیّکی حەق گۆو خاوەنی هەلّویّستی بویّرو ئازایانەبووە،[٣] لەوەش نەپرینگاوەتەوە کە رەنگبێ بەیانی باجی ئەو هەلّویّستانەی بدا، یا کردارو رەفتاری دوو فاقیو ناپەسەندی ئاغاو خانو سەرەك خیّلّەکانی ناوچەکە لەبەرامبەر دەسەلاّتدارانی بیّگانە لەلایەكو، دەرحەق بە جوتیارو رەشو رووتو رەعیەتەکانیان لەلایەنیّکی دیکە قبوول بکات. ئەو هاتووە زۆر بە تووڕەیی شۆڕشو لەشکرکیّشی سمایلائاغای شکاکی بۆ سەر شاری سابلاغ ریسواو شەرمەزار کردوە:

شـــاعیر عمـــوومی کەوتنـــە مـــەقالاّتو بۆلّـــە بـــۆلّ
مـــەتحی وەتـــەن دەکـــەن، بـــە قەســـیدەی شـــڕو شـــڕۆلّ
تـــەعریف دەکـــەن لـــە میللـــەتی کـــوردی بـــە ســـەد زمـــان
پـــاك بوونـــە چاووشـــیّکی بـــەبیّ دەمبـــەگو دەهـــۆلّ
کـــوردیش چ کـــوردە، میللـــەتی خـــۆ خـــۆرە پیّکـــەوە
بـــۆ گیـــانو مـــالّی یـــەکتری سمکـــۆل دەکـــەن لـــە خـــۆلّ

تا لە کۆتاییدا دەلّیّ:

مەیرپیّـــسە بەســـیە شـــاعیری چـــەپرەك بلّـــیّ بلّـــیّ
رەبـــبی ولاّتـــی کـــوردی ببینیـــن بـــە چـــۆلّو هـــۆلّ

دیوان: ٤٨ .

مەلا مارف شاعیریّکی واقیعی بووە، پیّی لەسەر عەرزو لە هەناوی کۆمەلّەکەی خۆیدا ژیاوەو ژیانی لەگەلّ گیّرەو کیّشەی زۆر تیّکەلاّو بووە. گرفتاریو نەداریو کویّریو نابینایيو سەرباری ئەمانەش، گیّچەلّ و هەراسانی لە چنگ ژاندارمو پۆلیسی رەزا شا، لە شیعریّکی جوانداا بە وردی ئەم هەلّومەرجەی دەوری ژیانی داوە باس دەکات:

---

(٣) ناودارانی موکریان، عبدالله سمەدی، www.dengekan.com

مودەتێکـــە نەفـــسی حیـــز حـــوکمی خـــراوم لێـــدەکا
هــــەر بەقـــەهرو کینــــە دەڕوانێـــتو چـــاوم لێـــدەکا
هەرچـی فیکـری لێدەکــەم ڕێگــای خەلاسـیم بـۆ نییــە
بــــەو چــــلەی زســــتانە داوای تـــاوو ســـاوم لێـــدەکا
دەچــــمەوە مــــاڵ، مــــاڵو منــــداڵ دێــــنو دەورەم لێــــدەدەن
یــەك تەمــەنناى قەنــدو چــا، یــەك نــانو ئــاوم لێــدەکا
ڕوو لــــە بــــازاڕی دەکــــەم ئــــەمجارە ئــــەڕبابی تەلــــەب
هــــەر کەســــێ تووشــــی دەبم داوای دراوم لێــــدەکا
دەچــمە ســەر چــۆمو خیابــان، یــەك نەفــەس ئاســوودەبم
شــــارەبانی حــــازرەو داوای کــــڵاوم لێــــدەکا
دەردی بــــەدتر لــــەم هــــەموو دەردانــــە دەردی پیرییــــە
جــەرگی لــەت لــەت کــردووم، داوای هــەناوم لێــدەکا
ســەیری خۆشــتر مــن کــە (مــەعروف)م لــەنێو ئــەو شــارەدا
تــــازە ئیحــــسائییە داوای ئیــــسمو نــــاوم لــــێدەکا

دیوان: ٣٤.

کۆکەیی وەك لەمەیدانی بیری سیاسیو نەتـەوەخوازیو نیشتمان پەروەریـدا شاگردی بلیمـەتی حـاجی قـادری کـۆیی بـووە، لـە مەیـدانی وەسـفو ستایشی سروشتی پـاکی نیشتمانیـشدا قەسـیدەیەکی بـەهاری ڕازاوەی هۆنیوەتــەوە کــە لەگــەڵ قەســیدە بەهارییەکەی حاجیدا بەرامبەرن، لەگەڵ ئـەوەدا کە باسی خێـوەتی گوڵو گـوڵزارو شەونمی سەر ڕووی لالەزار دەکات لە دەشتو دەر، بـە پـلارو لاقرتـێ سەرو پۆتـەلاکی وشکە سۆفیش دەکوتێتەوە:

ســــۆفی وەرە هــــەنگامی گــــوڵ و فەســــڵی بــــەهارە
وەختــــی تــــەرەب و عــــەیشو دەمــــی گەشــــتو گــــوزارە
پیــــشەو عەمــــەلت حیلەیــــە، تــــەزویرو ڕیایــــە
تــۆ بەشــقی خــوا دا پــێم بڵــێ ئــەم کــارە چــە کــارە
بــــەم ڕیــــشەوە تاکــــەی دەبــــڕی ڕیــــشەیی عــــومرت
ئــــەم ڕیــــشە مەگــــەر تیــــشەیە یــــا شــــەققە مــــشارە

- تێفکــــره تەماشـــاکە لـــە کووچـــەو لـــە خیابـــان
سـوزی نەیـــە نەشـــئەی مەیـــە ئـــاوازەیی تـــارە
پـۆل پـۆل سـەفی مەحبووبـە لـە گـوڵزارو چـەمەندا
تـــۆ دێـــوی مەگـــەر مـــەنزڵی تـــۆ هـــەر لـــە موغـــارە
رایخـــستووە فەرڕاشـــی ســـەبا فەرشـــی زومـــەڕەد
وەك ئەتڵەســـی یەکرەنگـــە بـــەبێ گـــەردو غوبـــارە

دیوان: ۱٥.

کۆکـەیی بـەوە ناسـراوە کـە بـەهۆی نـەداریو دەسـت تـەنگییـەوە رووی کردۆتـە پیـاو چاكو خواپێداوەکانی موکریانو شیعرو قەسیدەی ستایشو پیاهـەلگوتنی لـە شێوەی (سـواڵنامە)دا بـۆ نووسـیون، هـەژار لـەو بارەیـەوە دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: نیزامـیو فیردەوسـیو...زۆربـەیان لـەو شـاعیرە گەورانـە بـە سوالکەری ژیـاون، ئەوانـەی خـۆم دیتمنو زۆر لە خـۆم شـاعیرتر بـوون، وەك مـەلا مـارفی کۆکـەیی، قەسـیدەیەکی سـەد بەیتی بۆ تاجرێك دەنووسی دەیگەیاندە تەشقی عاسمان، نیـو کیلـو گۆشـتی دووتمـەن بایی بۆ دەنـارد....یـا ئـەوەتا سواڵنامـەی بـۆ هـەرە پیاوی خـوێرپیش دەنووسـیو ئیـوا هـەبوو پـارەی دە نـانی بـۆ نـەدەنارد.[٤] بـەڵام نێـوانی لەگـەڵ سـەیفی قـازی شـاعیری هاوتەمـەنی خـۆش بـووەو وا هـەبووە بـە نامـەی شیعری پریاسـکەی دڵـی خـۆی بـۆ کردۆتەوە:

رایـــەڵو پـــۆی تێکـــچووە ماشـــێنەکەی چـــەرخی فەلـــەك
هـــەروەکو ئـــەوزاعی مـــن ئـــاڵۆزو دەرهـــەم بەرهەمـــە
چـون بەهـەر شـکڵێ لـە مـەزووعات و مـەحمولاتی خـۆم
هـەر قیاسـێ هەڵدەبەسـتم بـێ نەتیجـەو ئەعقەمـە
مەسـلەحەت وایـە کـە شـەرحی حـاڵی خۆمـت پـێ بڵـێم
تـا بزانـــی زەخـــمو دەردم بـــێ دەواوو مەرهەمـــە
هـیچ درۆ ناکـەم جـەنابی (سـەیف) ئەگـەر بـاوەڕ نەکـەی
بـەو خودایـەی خـالقی کورسـیی و عەرشـی ئـەعزەمە

دیوان: ۳۳.

---

(٤) چێشتی مجێور: ۳، ٤٥.

کۆکـەیی بەهـەر چوار زمـانی کـوردی، فارسـی، عـەرەبی‌و تـورکی شـیعرو هـۆنراوەی داناوە، جگە لە دیوانی شیعرە کوردییەکانی، دیوانێکی فارسی چاپکراویشی هەیە کە لـە سـاڵی ١٩٦٢ لـە پاکـستان لـە ٢٠٨ لاپـەڕەدا لەلایـەن محمـد ئـەمینی میـسری (سەیدیان)ەوە لە چاپ دراوە. شیعرە فارسییەکانی چی لەبەر شیعرە کوردییـەکانی کـەمتر نییـە، یـەکێك لـە گـرنگترین بەرهەمـە فارسـییەکانی پارچـە پێنجینێکـی (٢٤) بەندییـە کـە چ لـە بـواری کۆمەڵناسی کۆمـەڵی کـوردەواری بێ، چ وەکـو لاپـەڕەیـەکی مێژووی موکریان بەرهەمێکی ئەدەبیی گـرنگ‌و بایەخـدارە.[٥] هـەروەها پێنجینێکـی فارسـی ناوداریـشی لـە بۆنـەی مـەرگی ناکـامی مـەلا عـەلی کـوڕی دانـاوە، کـە بـەندی دەسـتپێکی زۆر ناوبـانگی پەیـداکردووەو لـەناو خەڵکیـدا بڵاوبۆتـەوەو بـووە بـە ناسنامەی مەلا مارف، کە دەڵێ:

مـنم آن شـاعر معـروف بهـر شـهرُ بلـد
مرکـز دایـره بخـت بـدو گـالع بـد
برسـرم تاختـه یـك لـشکر بیحـدُ عـدد
نقـراتش همـه خـون خـوارتر از بـبرو أسـد
افـسرانش همـه داو الـسرگان انـدو کێبـه[٦]

کۆکەیی لە کۆتایی قەسیدەی (سێلاوی بەدبەختی) کـە لـە بۆنـەی کارەساتی لافاوی شاری مهابادا گوتویەتی لۆمەی خۆی دەکات‌و دەڵێ:

مـەقامی تـۆ نییـە وەعـزو نەسـیحەت شـاعیری سـووتاو
وەکـو پەروانـە بـۆ دونیـا بـڕۆ لـەم خەڵکـە خـۆت لادە
شـیعارو مەسـلەکی ئەشـعاری تـۆ تەنقیـدو تەمجیـدە
بـەکارت نایـە ئـەم مەیدانـە ئەسـپی خـۆت لـەوێ لادە

دیوان: ٤٤.

ئـەنجا (تەنقیـد)ی کۆکـەیی هەنـدێ کـەڕەت دەگاتـە رادەی ئێشاندنی هەنـدێ کـەس‌و هەنـدێ دیاردەی کۆمـەڵایەتی، با لە ژێر پەردەو پـەڕۆی شـێخ‌و خەلیفـەو ئاینداریـشدا

---

(٥) پێـنج خـشتەکییەکی فارسـی مـەلا مـارفی کۆکـەیی، عەبـدوڵڵا سـەمەدی، www.dengekan.com

(٦) دیوان ملا معروف متخلص بشاعر کوکی: ٧٤.

حەشار درابێت. هەڵمەتی پلینگانەی شاعیر لێرە بۆ سەر خانەقای خەلیفەیەکی شێخانی زەنبیلە، دیارە رەفتارو هەڵسوکەوتی نەکەوتۆتە بەر دڵی شاعیر بۆیە خانەقاکەی بە (مەکتەبخانەی تەدلیس) ناوزەد دەکاو بەم جۆرەش خەلیفە دەشێلێت:

تەماعم بوو بکەم مەتحی خەلیفەی شاهی زەنبیلی
کە تێفکریم لە قوەت خاریجە تەشریحو تەفسیلی
لە باب و فەسڵی تەزویرو ڕیا هێند چوستو چالاکە
هەموو کەس خۆ دەپارێزێ لە مەکرو کەیدو تەزلیلی
وەکو جەردەی موسەلەح دەچێتە سەر ڕێگەی موسولمانان
بە ئیمان ئیکتیفا ناکا دەکا نەزعی سەراویلی
هەموو رۆژێ لە مەکتەبخانەی تەدریسو تەدلیسی
دەنووسن سەد جەوازی نومرە یەك روتبەی عەزاریلی
بەریشو سورەتو عەممامەو شکڵ و هەیولائی
بە لەحنی نازكو قەولی ئەکازیبو ئەباتیلی
فریوی جاهیلی وەحشی دەدا بێچارە نازانێ
مەقامو مەنزڵی ئیبلیسە ریشوو پێچو مەندیلی
أیا مَن قُلتَ أنَ الشعرَ عِصيانٌ وَ نُقصانٌ
لكم إحسانكم يا لائمي، نقصي وذنبي لي

دیوان: ٧٢.

دوا دێری قوفڵی پارچەکە بەروونی باڵادەستیو توانای شاعیرانەی مەلا مارف، بەسەر زمانو سەبکی غەیری کوردیش لە هۆنراوەدا نیشان دەدات.
شیعر لە کۆمەڵێکی نەخوێندەوار، غەرقی دابوو دەستووری خێڵەکیو دەرەبەگایەتی وەکو موکریانی ساڵانی (١٩٢٠ – ١٩٤٠)ی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، هەر دەبێ خاوەنی پەیامێکی کۆمەڵایەتیی هاندەرو هوشیارکەرەوە بێت. بە زمانو بەیانێك بدوێت تاوەکو خەڵکەکە تێی بگاتو لێی حاڵی بێت، لێرەوە مەلا مارف وەکو زانایەکی چاکەخوازو چاکسازی کۆمەڵایەتی، بە چەکی شیعرو هۆنراوە، هاتۆتە مەیدانی هاندانو تین وەبەرنانی کۆمەڵگاکەی، تەوسو پلاری تێگرتوون، کەمو کورتیو

ناشرینییەکانی ئاشکرا کردوون، رەخنەی لێ گرتوونو رێگای دروستو چاکەو پێشکەوتنی بۆ دەستنیشان کردوون.
بۆیە شاعیر لەم بوارەدا پێشەنگەو لە بەرهەمەکانیدا چەمكو ناوەڕۆکێکی سەر بە قوتابخانەی ریالیزمی دەربڕیوە. ئەگەرچی لە چوارچێوەو شێوەی دێرینی شیعری عەرووزیشدا لاینەدابێت. لە موکریان لە پێش مەلا مارف شاعیرێك بەدی ناکەین ئەوەندە خەمخۆرو بەتەنگ پێشکەوتنو سەربەستییەوە بوو بێت، ئەوەندە دژ بە دابو نەریتە کۆمەلایەتییە باوەکان وەستابێت، ئەوەندە واقیع بینانانەو بێ پەردە دەردو دەرمانەکانی دەستنیشان کردبێت. ئەوەندە داکۆکی لە بیری زانستی کردبێتو پەرۆشی قەومو نیشتمانەکەی بوو بێت. بەر لەوەی ئەم چەند دێرە بە کۆتا بهێنین وا چاکە پەنجە بۆ راستییەك رابێلین کە ئاوایی (کۆکە) جگە لە مەلا مارف زێدی دوو شاعیری ناوداری دیکەی موکریانە، یەکەمیان مامۆستا (عەباسی حەقیقی)یەو ئەوی دیکەش (خالەمین)ە. کۆکەیی لە سالی (١٩٤٥) کۆچی دوایی کردووەو لە مەهاباد سەری ناوەتەوە.
ب. رابەری سەرچاوە سەبارەت بە ژیانو بەرهەمی شاعیر:
١. گۆڤاری نیشتمان ١٩٤٣- ١٩٤٤ زمان حالی (کۆمەلەی ژێکاف)، جەمال نەبەز، بنکەی چاپەمەنی ئازاد – سوید، ١٩٨٥.
مەلا مارف هێشتا لە ژیان دابووە کە گۆڤاری نیشتمان لە مەهاباد دەرچووەو بلاوبۆتەوە، لە بەرێوەبەری بەرپرسو بلاوکەرەوەی گۆڤارەکەش (عەبدولرەحمانی زەبیحی) نزیك بووە،[٧] لە ژمارەکانی (١)، (٣، ٤)، (٥)، (٦)ی نیشتماندا چوار پارچە شیعری نیشتمانیی مەلا مارف بلاوبۆتەوە، واتا لە هەر ژمارەی پارچەیەك بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە گۆڤارەکە لە سالانی (٤٣ – ٤٤)دەرچووەو مەلا مارفیش لە سالی ١٩٤٥دا وەفاتی کردووە. دیارە ئەم بەرهەمانە دەبنە دوایین ئەزموونەکانی شیعری ئەو،[٨] لەوێدا لە ژێر نازناوی (شاعیرێکی بەناوبانگ – بوێژێکی ناودار) ناوبراوە. دیارە هەلومەرجەکە وای خواستووە کە ناوی راستەقینەی شاعیر ئاشکرا نەکرێت وەکو دابی زۆر لە نووسەرانی گۆڤارەکە. دواتر تەنها یەکێك لەم هۆنراوانەی

(٧) دیدار لەگەل مستەفای کۆکەیی (نەوەی شاعیر)، مەهاباد، ئەیلولی ٢٠٠٥
(٨) برا بیری چرایێکی بکەن، عبداللە سەمەدی، www.dengekan.com

(بە دەستکارییەوە) لە دیوانەکەیدا چاپ کراوەتەوە، ئەم چەند بەرهەمە بۆ هەڵسەنگاندنو ناسینی بیرو باوەڕی شاعیر زۆر بایەخدارن.[9]

٢. گۆڤاری هاواری کورد، ژمارە (١)، ڕەزبەری ١٣٢٤/ ١٩٤٥. وتارێکی لەلاپەڕە (٧ - ٨)دا بڵاوکردۆتەوە لە ژێر سەردێری: کوردی بەناوبانگ - مەلا مەعروفی کۆکی، ئەم وتارە تەنها چەند مانگێك لە دوای کۆچی دوایی شاعیرەوە نووسراوە، بۆیە لەم لایەنەوە بایەخی بەدیار دەکەوێت.

٣. دیوانی مەلا مەعروف کۆکەای، سیدیان، مەهاباد، ئیران، ١٣٤٦/١٩٦٧.

دیوانێکی پڕ لە هەڵەو پەڵەیە، کەمو کورتی زۆری تێدایە هەم سەرجەمی شیعرو بەرهەمەکانی شاعیری تێدا کۆ نەکراوەتەوەو هەمیش دەستکاری بەرهەمەکان کراوەو لێی زیادکراوەو شتی خراوەتە پاڵ. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تا ئێستا سەرچاوەیەکی باشە سەبارەت بە ژیانو بەسەرهاتو سەربردەی مەلا مارف، هەروەها بەشی هەرە زۆری بەرهەمە کوردییەکانی شاعیری تیادا کۆکراوەتەوە. سەبارەت بە مێژووی ژیانی شاعیرو ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی لە هەموو ئەو وتارو سەرچاوانەی کە دواتر نووسراون پشت بە زانیارییەکانی ئەم دیوانە بەستراوە.

٤. دیوان ملا معروف متخلص بشاعر کوکی، ئەمە دیوانی شیعرە فارسیەکانی شاعیرە، بەخەتێکی نەستەعلیقی جوان نووسراوەتەوەو هەر بە هەوڵو کۆششی (سیدیان) خۆی لەساڵی ١٣٤١/١٩٦٢ لە پاکستان لە ٢٠٨ لاپەڕەدا لە چاپدراوە. بەشی زۆری بەرهەمەکانی ئەم دیوانە لە غەزەلو قەسیدەو تەرکیب بەند پێکهاتوون، مەلا مارف یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی کە لە نەزمی فارسیدا لە ناوچەی موکریان دەستێکی زۆر باڵای هەبووە.

٥. گلزار شاعران کردستان — سید عبدالحمید حیرت سجادی، تهران، ١٣٦٤.

٦. مێژووی وێژەی کوردی، صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)، بەرگی-٢، انتشارات ناجی- بانە کردستان، ١٣٧٠.

٧. تاریخ مهاباد، سید محمد صمدی، انتشارات رهرو، مهاباد، ١٣٧٣.

٨.تاریخ فرهنگ وادب مکریان، ابراهیم افخمی، جلددوم، ناشر: محمدی سقز، ١٣٧٣.

٩. شاعران کرد پارسی گوی، سید عبدالحمید حیرت سجادی، تهران، ١٣٧٥.

١٠. چێشتی مجێور، هەژار، پاریس، ١٩٩٧.

---

(٩) سەرچاوەی پێشوو.

١١. زانایانی کورد، محمد سالّح ئیبراهیمی (شەپۆڵ)، چاپەمەنی سەقز (محمدی)، ١٣٧٩.
١٢. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مردوخ روحانی، جلد دوم، تهران، سروش، ١٣٨٢.
١٣. کۆمەڵێك وتارو باسی جۆراوجۆر لە بارەی مەلا مارف لە بەرگەکانی رشتەی مرواریو گۆڤارو رۆژنامەکانی وەکو (سروە، مهاباد، رصد..) بڵاوکراونەتەوە.
١٤. سید عەبدولای سەمەدی مهابادی لە سایتی: www.dengekan.com دوو لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە شاعیر بڵاوکردۆتەوە، یەکێکیان سەبارەت بەو چوار پارچە شیعرەیە کە لە کاتی خۆیدا لە ژمارەکانی گۆڤاری نیشتماندا بڵاو بوونەتەوە، دووەمیان سەبارەت بە ساغ کردنەوەو لێکدانەوەی پێنجینە فارسییە نێودارەکەیەتی.

# باســـــى دووەم

## ٢. ئەبولحەسەنی سەیفی قازی (سیف القضات)

### أ. ژیننامەو ناساندن:

یەکێکە لە شاعیرو پیاوە مەزنەکانی ناوچەی موکریان، برا بچووکی میرزا فەتاحی قازی‌و قازی عەلی بووە، مامی پێشەوا قازی محمدو سەدری قازی‌و باوکی حەمە حوسێن خان (شەهیدانی چوارچرا)ی کۆماری کوردستان بووە.[١٠] لە (مانگی بانەمەڕی ١٢٠٠ای هەتاوی – ٢٨ نیسانی ١٨٧٦) لە شاری سابلاغ هاتۆتە دنیاوە، میرزا قاسمی باوکی پیاوێکی زاناو پێشەوای ئاینی ناوچەکەو قازی شار بووە.[١١] لەو شوێنەوارە پڕ لە زانستو بەهرەیە پێگەیشتووە، شارەزایی لە ئەدەبو سیاسەتو زانستو زانیاریدا پەیداکردووە، لەلای مەلاو زانا ناودارەکانی موکریانی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی تا بە پلەی مەلایەتی گەیشتووە، ماوەیەك لە مەهابادو لە دواییدا لە گوندی (گویگجەلی) کە مەڵبەندێکی خۆش ئاوو هەوایەو لەسەر چۆمی جەغەتوی نزیك میاندواوە، جێگیر دەبێتو ژیان بەسەر دەبات. تا لە رێبەندانی ١٣٢٣/ ١٩٤٤ کۆچی دوایی دەکات.

سەیفی قازی گەورە پیاوێکی زاناو رووناکبیرو خوێندەوارو کارامەو بە ئەزموونی موکریان بووە، (زیاتر خەریکی کاری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و کشتوکاڵو موڵکداری بووە، سۆفی‌و دڵتەڕ بووە، شاعیری پیشەی هەمیشەیی نەبووە، کەچی لە ریزی شاعیرە بەرزەکان دەژمێردرێ، جگە لە زەوقی شاعیری کۆمەڵناس‌و مێژووزان بووە).[١٢]

هێمن لەو باسەیدا کە بەناونیشانی (مامۆستای شاعیرانی موکریان) لە بارەی سەیف نووسیویە، دەڵێ: (سەیفی قازی خۆی قوتابخانەیەکی نوێی لە ئەدەبی کوردیدا کردۆتەوە، بە یەکەمین شاعیری کوردستانی ئێران دەناسین کە بای داوەتەوە سەر

(١٠) هەواری خاڵی: ٣٤.

(١١) دیوانی سیف القضات: ١٤.

(١٢) هەواری خاڵی: ٣٥.

ئـەدەبی فولکلـۆری کـوردیو بـە زمـانی زەحمەتکێشانو رەنجبـەرانی لادێ شـێعری گوتووە، تێکۆشاوە تەعبیری ناسكو رەسەنی کوردانە لە شێعری ساکارو جوانو رەوانی خۆیـدا بگونجێنـێ، وشـەی پـەتیو رەسـەنی کـوردی لـەکار بێنـێو زمانەکـەمان بـە چەشنێکی وەستایانەو شارەزایانە بژاربکاو، وشەی بێگانەو نامۆی لـێ دەرباوێـژێو بـە شایەدی هەموو زماناسێك لەم کارە بە کەڵکەدا زۆر سەرکەوتووە.)[١٣]

لە پارچە شیعری (تفلی دڵ)دا شاعیر بە پێڕەوی لەشاعیرانی کلاسیکی پێشی خۆیـدا دەڵێ:

دایـــم دڵــم بـــە ناڵـــەو زاریو فیغـــان دەڵـــێ
خـــۆش بـــەو شـــەوەی کـــە رۆژی روخـــی دڵبـــەرم هـــەڵێ
تفلـــی دڵـــم گـــرووی شـــەکەری لێـــوی گرتـــووە
بـــەو دوو هـــەنـــارە ژێـــری کـــەوە، بـیـخـــە بـاغـــەڵێ
زولفـــت وەلادە رووت بنوێنـــە بـــە دەفعـــەیێ
شـــەو رابـــرێ، ســـتارە نـــەمێـــنێ، قـــەمـــەر هـــەڵێ
بـــەو زولفـــە میروەحـــەت مەکـــە مـــەنعم لـــە شـــەهدی لێـــو
تـــەیـــرێـــکە دڵ زەعـــیـفـــە، دەتـرســـێ لـــە داوەڵـــێ
ئـــەو قافیـــەت بەســـانی دڵـــی مـــوددەعی حەســـەن
تـــەنگە، درەنـــگە، مـــەیلی بـــە جـــەنـــگە، هـەڵێ، مـــەڵێ

دیوانی سیف القضات: ٣٣

(هێرش) لە مەڕ شیعرو پێشەنگیی سەیفی قازییـەوە دەڵێ: (یـەکێك لـەو شـاعیرانەی کە دەکرێ وەك پێشەنگی شیعری نیشتمانیو سیاسی موکریان نێوی بێنین کـە شـوێن پێی لەسەر شاعیرانی دواتـری موکریـان بـەرووونی دەردەکـەوێ سـەیفی قازییـە.. ئـەو یەکـەم شـاعیری ئـەو قۆناغمیـە کـە توانیویـەتی بـە دەمەزەردکردنـەوەو تیفتیفـەدانی خەنجەری شێعری موکریان دەستپێشخەری شێوازێکی نـوێ بـێ چ لـەباری شێوەوە چ لـەباری کاکڵو ناوەرۆکـەوە...ئـەو سـەرەڕای نوێکردنـەوەی بـیری گـەل پـەرستـیو نەتـەوەخوازی ئـەحمـەدی خـانیو حـاجی قـادری کـۆیی، لـەباری داهێنـانی کێشی خۆماڵیو دەکارهێنانی وشەی پـەتیو پاراو بەیـەکێك لـە ئـەدیبانی گـەورە لـە قەڵـەم

---

(١٣) سەرچاوەی پێشوو، ٣٥

دەدرێ).[14] شاعیر بە پێڕەوی لەئاهەنگو کێشی شیعری میللی کوردی، لە ژیانی پڕ زەحمەتی جوتیارانی لادێی موکریان دەدوێ:

شـــــەماڵ و زریـــــان دایـــــم شــــەڕیانە
ئـــاغـــاوات شــــڕن کرمــــانج قــڕیـــانـــە
کرمــــانج دەوڵـــەتی پــــڕو پاتــــاڵ بـــــوو
کۆچــی دێ بــە دێ بــە مـــانگ و ســـاڵ بـوو
ئـــەویش لـــە دەســـت چـــوو هێنـــدە کـــۆچ مەکـــەن
کـــای ســــەرو نــــوێ کـــەن، جـــووتی زۆربـــکەن
باغــــــان دابنـــــێن، داران بنێــــــژن
نــــەجیبو عەســــلن، کـــۆن و لــــە مێــــژن
تاکـــــەی لــــە دەرکـــان کـــزو بـــڵاو بـــین
بێ مـەزن و گـەورە، سـەر بێ کڵاو بـین

دیوان: ٥٣.

هەروەکو لە وەسفی شەنگە بێری و نازدارانی دێهاتی موکریاندا دەڵێ:

کــوان شــەنگە بێــری لـــە چـــیاو کوێـــستانان
شـــلقەی مەشـکەیــــان ، بـــــەری بەیانـــــان
قۆڵیـــــان هــــەڵ دەکــــەن، دەڵێـــی بلـــووره
ســــینگیان دەردەخــــەن، پارچێــــك لـــە نـــووره
دەرزی بـــــەرۆکیان کــــــەدێن دەربێـــــنن
رۆژ لـــە عاســـمانڕا بـــۆ عـــەرزی دێــــنن
زوڵفـــــان لابــــەلا دەکـــــەن بــــەلادا
رۆژ هـــــەوری لەســــــەر رووی خـــۆی وەلادا
قـــــەدو باڵایــــان وێنــــەی نــــەمامان
کـــێ دێ نـــەمامـــان بـــگرن شــــەمامان

دیوان: ٥٢.

(١٤) ڕەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان: گ/گزینگ، ژ/١٣: ٦٩

دیاره هێمن‌و شاعیرانی هاوتەمەنی، وشەو تەعبیری کوردانەو خۆماڵی لەوی فێربوون بۆیە دەڵێ: (شاعیرەکانی پێش ئێمەی موکریان ئەگەر نەشڵێن بیری نەتەوایەتی لەوی فێربوون دیارە ئوسلوبی لەکارهێنانی وشەی رەسەنی کوردی‌و زمانی شوان‌و سەپان‌و جوتیاریان لەوی وەرگرتووە، ئێمەش شاعیرەکانی پاش ئەوان وەك هەژارو عەتری گلولانی‌و هێمن پەیرەوی ئەوانمان کردووەو دیارە شاعیرەکانی لاویش وەك سوارەو هاوارو مەحموودی‌و مەلا غەفوور ئەم رێرەومیان بەرنەداوە).[15] شاعیرانی کورد هەندێ جار پەنایان بردۆتە بەر سیستمێکی تازە کە ئەویش (مەسنەوی — جووت سەروا)یەو بەوە خۆیان لە هۆنراوەی یەك سەروا رزگارکردووە تاوەکو واتا هەم رەوان بێت، هەم رەسەن‌و پاراوو نەبێتە قوربانی سەروا.[16] سەیفی قازیش شیعرە هەرە جوان‌و پاراوەکانی ئەوانەن کە لەسەر سیستمی جووت سەروا هۆنیونەتەوە:

تاکەی لە دەرکان کزو بڵاو بین
بێ مەزن و گەورەو سەر بێ کڵاوبین
چیدی دوژمنان بە خۆ خۆش مەکەن
بووزو کەپەنك بالاّ پۆش مەکەن
ئەو بەد بەختییەی لە کورد رووی دابوو
لەبەر نەخوێندن کۆزیان ساوا بوو
واجبە خوێندن بۆ دنیاو دینێ
پێغەمبەر فەرمووی بۆچوونی چینێ
بە کوتەو شانامان میللەت دەمێنن
بە مەزن‌و گەوران شان دەشکێنن
دەردی دڵ دەکەم کورت‌و کرمانجی
حەسەن کرمانجە چی لە دیلمانجی

دیوان: ٥٣ — ٥٤

---

(١٥) هەواری خاڵی: ٣٤.

(١٦) بەرگری لە هەڵبەست، گ/رۆشنبیری نوێ، ژ/٦٩: ١١٥.

سەیفی قازی لە هۆنراوەی (ساڵی قڕان) ئاکامی سیاسەتو ئاکاری دزێوی رەزا شای لە قاو داوەو لە دیمەنی (بەهارێکی زستانی)دا دەریبڕیوە، کەم شاعیر لە باری وشە ئارایی‌و لێکچواندان‌و خوازەو وێنەو ئیماژی شیعریدا دەیگاتێ:[17]

دنیا وا سووربوو لە بەفرو سیخوار
فرمێسکی سوورم بە سپی دێتە خوار
با لە کێوو دەشت خۆڵ وەسەر دەکا
گریانی کێوان بەحران پڕ دەکا
عەرزیش لە بۆ من هێندەی قوڕ پێوا
بەهاری دەگەڵ زستان لێ شێوا
لە گلەك لەگەڵ کەوت نەما تەق تەقی
سیرووش لە سیرەو فیتوو و چەقچەقی
پاك پەشیمانن لە بۆ گەرمێنێ
بۆ چ دەهاتنەوە عەمرو نەمێنێ

دیوان: ٥١.

لێرەدا (ئەگەر مانای ڕواڵەتی شێعرەکان بخەینە لاوەو بە نووکی قەڵەمەکەمان بنکۆڵیان بکەین هیچ مانای دیکەمان نادەنەوە دەست؟ بۆچی نا !، دوای ئەوەی کە سمکۆ بەرەو کوردستانی گەرمێن (١٩٢٦) پاشەکشەی کردو پاشان سەر لە نوێ گەڕاوە...ئاخیری بە هەر فێڵێك بێ بە دەستی رەزا شا لەناو دەچێ).[18] کەچی ئێستا شاعیر بە لە ناوچوونی شۆڕش‌و بزووتنەوە کوردییەکان‌و کپ بوونەوەی دەنگی گەلی کورد لە هەموو پارچەکان، سەر سووڕماوی خۆی لە نەمانی هەڵۆی کوردان‌و زەمانی قەل‌و قەشقەڵان دەردەبڕێ‌و کولو کۆی خۆی بەم جۆرە لە تەنیایی دیمەنی سروشتێکی بێ ڕەحمدا هەڵدەڕێژێ:[19]

لە بن بەردان مان هەر سەر مازەڵە
لە باغ‌و باغچان قەل‌و قشقەڵە

---

(١٧) ڕەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانی‌و سیاسی لە موکریان: ٦٩.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو: ٦٩

(١٩) سەرچاوەی پێشوو : ٦٩

لاڵ بم نـــابینم لـــه چـــیاو لـــه رازان
زیـــڕەی هەڵـــۆیان، چریـــکەی بـــازان
بـــەفری بـــێ وەعـــدە رەشـــانگی بـــڕی
رەشـــانگو ســـپی پـــاکیان ســـەر بـــڕی
ســـەر بـــڕا گـــا شـــین پـــاش مانگـــا بـــۆرە
لەبـــاتی گـــاڕان ڕۆڕۆو گـــا بـــۆرە
شـــینو گـــابۆرە لـــەنێو رەعیـــەتی
بـــە بـــاچوو رەنـــجو ســـەعی و زەحمـــەتی

نـا ئومێدی سـەیف درێـژە ناکێشێ، ئـەو لـە رۆژگارێکـدا ژیـاوە کـە ئـاگری راپـەڕین ناکوژێتەوەو هەر کاتە لەلایەك هەڵدایسێتەوە، نێوانو پێوەندی لەگـەڵ زۆربـەی ئـەو بزووتنەوانـەشدا بووە. تەنانـەت شوێن پەنجەو کارو تەئسیری سـەیفی قـازی بـوو کـە قازی محەمـەدی وەکو پێشەواو رێبـەرو تێکۆشـەری رێگـای رزگـاری کوردسـتان هێنایـە بەرهـەم. واتـە سـەیف مامۆسـتای بـیری قـازی بـووەو قـازی شـاگردێکی قوتابخانـەی کوردایەتی سەیف بووە.[٢٠] ئەوەی جێگای سەرنجو تێڕامانە سەیفی قازی لـە شیعری موناجاتی ئاینیو ستایشی خواو پێغەمبەریشدا هەر لە بیری نەتـەوەو نیشتمانەکەی خۆیەتیو کوردایەتی دەکات، بۆیە روو لە قاپی خودا دەکاتو دەڵێ:

کـوردینو بـێ کەسـینو لـە هـەر لایـە دەرکـراو
دەسـتێ وەدەس مـەدە، کە لـە رێـت ئێـمە لانـەدا
لێمـە نـە شـاو ئـەمیرە، نـە سـەردار و نـە وەزیـر
نـە حـاکم و نـە نایـب و سـەرتیـپ و نـە سـوپا

تا دەڵێ:

نــە مەدرەســە ، نــەعیلم و نــە دەرس و ســنعەتێك
زوڵـمە لەگـەڵ مـە هـەر کـە بـە چاوێك نـەکەن نـیگا
ئـــاخر بـــە زاتـــی تۆیـــە ئومێـــدی نـــەجاتی مـــە
رازی مـەبـە لـە ئـۆمەتی تـۆ، میللەتێـك فـەنا

دیوان: ٢٧.

---

(٢٠) دیدار لەگەڵ کاك ئەحمەدی قازی، مهاباد، ٢٠٠٥/٩/٢٩.

سەیفولقوزات دوو وشەی (ئۆمەت)و (میللەت)ی بەوپەڕی ژیرانە دەکارهێناوە کە یەکەمیان مانایەکی گشتیو ئاینی هەیە دووەمیان مانایەکی سیاسی، واتە کوردیش وەکو هەر میللەتێکی سەر رووی دنیا حەقی خۆیەتی کە مافی میللەتو دەوڵەتی خۆی هەبێ، نەوەکو دووچاری قڕ کردنو رووبەرووی فەنابوون بکرێتەوە.[21] سەیف لەگەڵ (عەزیز ئاغای عەباسی) ناوێکی ناوچەی (کولتەپە)ی بۆکان سەرو سەوداو دۆستایەتیەکی بە تینی هەبووەو تا دوا هەناسەی ژیان ساتێك بێ یەکتری هەڵیان نەکردووە، (تەنانەت جوانترین هەڵبەستەکانی (سیف القچات) هەر ئەوانەن کە بە نامە بۆ عەزیز ئاغای نووسیون)،[22] رادەی هاورێیەتیو برایەتی لەگەڵ عەزیز ئاغادا، وەکو لە نامە شیعرییەکانیدا دەردەکەوێت گەیشتۆتە رادەی دڵداری سۆفیزمی سۆزو هەستێکی ئینسانی پاكو پاراوی لێ هەڵدەرژێو (پەیوەندی ئەو دوو پیاوە دەمان خاتەوە یادی مەولانای رۆمیو شەمسی تەورێزی)،[23] هەر کە عەزیز لە چاوان ون دەبوو، ماوەیەك سۆراغو نامەی لە سەیف دەبڕا، سەیفی سەوداسەر بانگو هاواری لێ بڵند دەبوو:

زۆر تـــوولی کێـــشا عـــەزیز هیجرانــــت
لال بـــم نـــابینـــم مـــەیـــلی جـــارانـــت
چ قـــەوما ئـــەو ســـاڵ لەبـــەر چـــاو کـــەوتم
چلـــۆنت دڵ هـــات لـــە دڵـــت دەرکــــردم
ســـالان هـــەر مانگێـــك مایـــەی حـــەیاتم
یـــا تـــۆ دەهـــاتی یـــا مـــن دەهـــاتم
شـــەوانم شـــینو گریـــەو رۆ رۆیـــە
ژیـــربوونی رۆژیـــم بـــە بـــۆنەی تـــۆیە
هیلالـــی ئـــەبرۆت چـــونکە نـــەبینرا
چێـــژنمان تێـــك چـــوو رۆژوو نـــەگیرا
لـــە چـــاوەنۆڕیت عەیـــشم نـــەماوە
هـەر لەحزێـك حەسـەن سـەت جـار کـوژراوە

دیوان: ٥٦ .

---

(٢١) رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان: ٧٠.

(٢٢) دیوانی سیف القضات: ١٦

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو: ١٦.

له شیعری ئەڤینیو دڵداریشدا سەیفی قازی پارچە شیعری جوانو نایابی داهێناوە، هەریەکەیان بەرامەی چەپکە گوڵێکی نەخشین، یا سۆزو ئاوازی بەستەیەکی نەشئە بەخشو، زایەڵەی موسیقای سوناتایەکی رەزا سووکی لێ دەتکێ:

عەنبەری زولفت، بەدەم سەبادە

لەسەر مانگی رووت، هەوری موت لادە
تا رۆژ وەکو شێت روو لە کێوان کا
تۆزی غوسسەو غەم، هەستە بەبادە
لە عیشقت مردم وەسیەت بێ لە تۆ
بۆ خۆت بمنێژە تەڵقینم دادە
تا بڵێن زوحاك مار لەسەر شانی
تایەك لە زولفی چین چینت بادە
بە جامی دیدەی جەمشیدی جەمە
بە تەختی سینەی وەك کەیقوبادە
کوتم کوشتوومت، بە غەمزە فەرمووی
شێوەی شیرینە، رەسمی فەرهادە
لە دووری باڵات شەو هەتا سەحەر
کارم گریانە، پیشەم فەریادە
تاکو پامال بێ خوێنی مەزلوومان
پەنجەی شمشاڵت رەنگو خەنادە
بە هومێدی وەم بێیە سەر قەبرم
بۆیە وا حەسەن بە مردن شادە

دیوان: ٣٤.

ئەگەر سەرنج بدەینە نموونەی ئەو دەستە شیعرو بەرهەمانەی شاعیر کە خستمانە روو، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین سەیف لە چەند رووێکەوە شتی نوێی هێناوەتە ناو ئەدەبیاتی ناوچەی موکریان، کە هەم لە شاعیرانی دەستەی یەکەمی پێش خۆی جیادەکاتەوە، هەم شاعیرانێ کە لە دوای خۆشییەوە هاتوون پەیڕەویان لێکردۆتەوە. یەکەمیان لە رووی بابەتو ناوەڕۆکەوە ئەوەیە کە سەیف یەکەمین شاعیرێکە لە موکریان کە شیعری نیشتمانیو کۆمەڵایەتی گوتووەو لەو بارەوە بابەت

گەلێکی تازەی هێناوەتە نێو دنیای ئەدەبیاتی ناوچەکەوەو لە راستیدا لەو بارەوە رەچەشکێنی کردووە،[24] دووەمیش لە باری شێوەو روخسارەوە هەم بە زمانی پاكو رەوانو پەتیو خۆماڵی هەستو هۆشی خۆی راگەیاندووە هەمیش بەلای کێشی خۆماڵیو ئەدەبی کوردیدا بای داوەتەوە. واتە سەیف پرۆژە نیشتمانییەکەی لە زمانەکەیدا بەرجەستە کردووەو تیاشیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.[25]

ب. رابەری سەرچاوە سەبارەت ژیانو بەرهەمی شاعیر:

١. لە ئەرشیفی چاپەمەنیو بڵاوکراوەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان لە چەند شوێنێك وتارو لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ژیانو کەسایەتیو بەرهەمە شیعرییەکانی سەیف بڵاوکراوەتەوە. بایەخێکی بەرچاو بە ژیانو بەرهەمو کەسایەتی شاعیر دراوە، لێرەدا بەهۆی بەهای ئەرشیفیو لەبەر دەست نەبوونی ئەو سەرچاوانە، ئاماژەیان بۆ دەکەین:

أ. لە رۆژنامەی (کوردستان)ی بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارە ٨، ساڵی یەکەم، رێکەوتی (٨ رێبەندان ١٣٢٤ – ٢٨ کانوونی دووەم ١٩٤٦)، لە لاپەڕەی یەکەمدا وتارێك بڵاوکراوەتەوە لەژێر سەردێری (سیف القضات – بە مناسەبەتی یەکەمین ساڵی وەفاتی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی)، تیادا کورتەیەکی مێژووی ژیانی شاعیر خراوەتە روو، ئەنجا تیشك خراوەتە سەر لایەنی نەتەوەخوازیو نیشتمان پەروەری ناوبراوو پەنجە بۆ چەند پارچە شیعرو هۆنراوی شاعیر لەو بارەوە راکێشراوە. لە دواییدا وتارنووس (سید محمد حمیدی) پارچە هۆنراوەیەکی ماتەمنامەی بۆ یادی یەکەمین ساڵیادی وەفاتی سەیف هۆنیوەتەوەو مێژووی کۆچکردنی تیادا دەرخستووە:

غروبی حەوتی بەهمەن روحی پاکی رۆیی بۆ جەنەت
غروبی رۆژ هەمیشە بۆ بەشەر تاریکی هێناوە
بە خوێنی چاوی کوردان نوقتەدار بوو حەرفی تاریخی
لە دوای ئەو عەیشی کوردان بوو بە غەم ئازاری بۆ ماوە

---

(٢٤) هەواری خاڵی: ٣٤.

(٢٥) دیدار لەگەڵ یونس رەزایی، بۆکان، ئەیلولی ٢٠٠٥.

وتارەکە بەم چەند دێرە کۆتایی هاتووە: (مەرحوومی سەیف لەهەر بابەتێك بە فارسیو کوردی هەڵبەستیٚ زۆرە بەڵا گەلێکیان میللینو زۆرمان ئارەزووە کە خودا یارمەتیمان بدا خرپیان بکەینەوەو یەکجیٚ لە چاپی دەین. جیٚ نشینو ئەرشەدی ئەولاد لە دوای مەرحوومی سەیف، ئاغای محمد حوسێن خانی سەیفی قازییە کە لە ڕێی میللەتو سەربەخۆیی کوردستاندا زۆری مەینەت کێشاوەو گەلێکی ماڵ بەخت کردووە، ئێستاش معاونی فەرماندەیی هێزو سەردەستەی پێشمەرگەکانی کوردستانە. دوای ئەو ئاغای رەحیمی سەیفی قازییە کە گەنجێکی لاوچاكو خوێن گەرمو دە گەڵ پێشمەرگەکانی کوردستان ئامادەی فیداکارییە، تۆفیقیان لە خودا دەخوازین).

ب. گۆڤاری (هەڵاڵە)، ژمارە ٢ی خاکەلێوەی ١٩٤٦/١٣٢٥، وتارێکی بەناوی (شاعری میللیو بەناوبانگ سیف القچات) بڵاوکردۆتەوە، لەژێر سەردێرەکەدا نووسراوە ( لە ژمارە ٢٦ی ڕۆژنامەی کوردستان بە کورتی)، تیادا لاپەڕەیەکی بۆ کورتەی ژیانو تاریخی شاعیرێتی سەیف تۆمارکردووە، لە دواییدا هۆنراوە نیشتمانییە بیستو دوو دێریە ناودارەکەی (کوردینە تاکەی)، لەگەڵ پارچە غەزەلە ناسکەکەی (تفلّی دڵ) بڵاوکردۆتەوە. وتارەکە ناوی نووسەری بەسەرەوە نییە.

ج. گۆڤاری (کوردستان)ی مهاباد، (ژمارە ٣ی خاکەلێوەی ١٩٤٦)، لاپەڕەکانی ١٣ — ٢٦، واتە چواردە لاپەڕەی تەرخانکردووە بۆ بڵاوکردنەوەی قەسیدە درێژەکانی سەیف.

هەر لە گۆڤاری (کوردستان)داو لە ژمارە دواتر، واتە ژمارە ٤ی بانەمەڕی ١٩٤٦، لە بەرگی یەکەمی ناوەوە وێنەیەکی (سیف القچات)ی بڵاوکردۆتەوە کە چوارینێکی مەلا مارفی کۆکەیی بە فارسی لە ژێردا نووسراوە. دوای ئەوە لە لاپەڕەکانی ١ — ٤ وتارێك لەژێر ناونیشانی، (زانایانی کورد، شاعیری میللی بەناوبانگ حەزرەتی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی) بەهۆی ٧٢مین ساڵی لە دایکبوونی، بە پێنووسی سەید محمد حمیدی بڵاوکراوەتەوە. دیارە ئەمە دووەمین وتاری نووسەرەو لەماوەی دوو ساڵەی کۆچی دوایی شاعیردا نووسراوە. باس لە ڕۆڵی سەیف دەکات لە بواری شیعرو ئەدەبیاتی کوردیداو ئاورێك لە شێوەو دەربڕینو وشەو زمانو سەبکی شیعری سەیف دەداتەوە، ئەنجا بادەداتەوە سەر ژیاننامەکەیو دڵسۆزیو نیشتمان پەروەرێتی شاعیر بۆ گەلو نیشتمانەکەی. لە کۆتایی وتارەکەدا قەسیدە ٥٩ بەیتییە ماڵئاوایی نامەکەی شاعیر بڵاوکراوەتەوە کە مێژووی ١٩٤٤/١٣٢٣ی لەسەرەو دوا پارچە شیعرە کە شاعیر پێش کۆچی دوایی، هۆنیویەتەوە.

٢. مامۆستای شاعیرانی موکریان، نووسینی: هێمن، گۆڤاری رۆژی کوردستان، ژماره — ١، ساڵی دووەم، ئابی ١٩٧٢.
٣. دیوانی سیف القضات، گردەوەکۆی: قازی ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپخانە سبز، ١٣٦١.
٤. رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان، نووسینی: س.ج. هێرش، گۆڤاری گزینگ، ژمارەکانی ١٣و ١٥، چاپی سوید، ئۆکتۆبەری ١٩٩٦و بەهاری ١٩٩٧.
ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە لە دوو بەشداو لە نووسینی (س.ج. هێرش - سلێمانی چیرە) کە خۆی بەرکارو بەرپرسی نووسینی گۆڤارەکەیەو سەرجەم (٤٠) ژمارەیەکی لە وڵاتی سوید لێ بڵاوبۆتەوە. لە بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکەدا بەشێکی بۆ رۆڵی سەیفی قازی لەسەرهەڵدانو داهێنانی شیعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریاندا تەرخانکراوە. نووسەر وەستایانە بەلگەو بۆچوونەکانی خستۆتەڕوو بە نموونەی شیعری شاعیر سەلماندوویەتی. خودی لێکۆڵینەوەکەش یەکێکە لە باسو توێژینەوە باشەکانی شیعرو ئەدەبیاتی ناوچەی موکریان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.
٥. مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی ٢، نووسراوی: صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)، انتشارات ناجی — بانە، کردستان، ١٣٧٠.
٦. تاریخ فرهنگ وادب مکریان، نویسندە: ابراهیم افخمی، جلد دوم، ناشر: محمدی سقز، چاپ اول، ١٣٧٣.
٧. تاریخ مهاباد، سید محمد صمدی، انتشارات، رهرو مهاباد، ١٣٧٣.
٨. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مردوخ روحانی (شیوا)، جلد دوم، چاپ سروش، تهران، ١٣٨٢.
٩. مێژووی ئەدەبی کوردی، دکتۆر مارف خەزنەدار، بەرگی پێنجەم، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥ .

# باسی سێیەم

## ٣. مستەفا شەوقی

أ.رابەری سەرچاوە:

مستەفا شەوقی لەگەڵ ئەوەی لە ریزی شاعیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی ناوچەی موکریان بووە، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر ناونیشانو ژیانو بەرهەمەکانی بە شاراوەیی مابوونەوە تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم ئەوسا ئەم مەسەلانە بوون بە بابەتی کۆمەڵێك وتارو باسو لێکۆڵینەوە. بۆیە بەر لەوەی بێینە سەر تۆژینەوە لە ژیانو شیعرو بەرهەمە ئەدەبییەکانی، بە پەسەندی دەزانین لە پێشەوە ئاماژە بەو سەرچاوانە بدەین کە لەم بارەیەوە بە گوێرەی ساڵو شوێنی بڵاوبوونەوەیان نووسراون:

١. شیعری سیاسی لە کوردستانی عیراقدا، ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی، دکتۆر مارف خەزنەدار، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژمارە (١٥) ، زانستگای بەغداد، ١٩٧٢. لەم وتارەدا کورتەیەك لە ژیانی (شەوقی)، لەگەڵ تێکستی یەکێك لە بەرهەمە شیعرییەکانی کە بە ناونیشانی (هاواری دایکێ)یە بڵاوکراوەتەوە، ئەم بابەتە بۆ جاری دووەم بە زیادکردنی هەندێ زانیاریو پەراوێزی تازە، لە پاڵ چەند لێکۆڵینەوەیەکی دیکە لە کتێبێکدا چاپو بڵاوکراوەتەوە. بڕوانە:

- لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، دکتۆر مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٨٤.

لەم بارەیەوە دکتۆر عەبدوڵڵا محەممەد حەداد دەڵێ: ( ئەوەی راستی بێ، دکتۆر خەزنەدار، یەکەمین لێکۆڵەرەوەیە "مستەفا شەوقی قازی زادە"ی بە جیهانی ئەدەبیاتو رۆشنبیری کورد ناساندووە. ئەم دەست پێشخەرییەی ئەو، بووە مایەی ئەوەی نووسەرو لێکۆڵەرەوەکانی تر هەوڵ بدەن بەرهەمی تری ئەم شاعیرە بدۆزنەوە).[٣٦]

٢. شاعیرە ناو وون بووەکانی کورد، علی کمال باپیر، سلێمانی، ١٩٧٣.

---

(٣٦) شیعرەکانی مستەفا شەوقی قازی زادە، گ/رۆشنبیری نوێ، ژ/١١٢: ٧٦.

٣. دوو رۆژنامەی "کوردستان" لە ئەستەمبوڵ، دکتۆر مارف خەزنەدار، گ/ رۆژی کوردستان، ژ/(٤٣، ٤٤)، کانوونی دووەم، ١٩٧٧.
٤. دکتۆر مستەفا شەوقی – شاعیری نیشتمانپەروەری خاکی موکریان، دکتۆر مارف خەزنەدار، بەغدا، ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٨١. بڕوانە: (٥).
٥. مستەفا شەوقیو پەیژە، ساغکردنەوەو لێکۆڵینەوەی مومتاز حەیدەری، هەولێر، ١٩٨٥.
٦. دوو مستەفا شەوقی، کەمال رؤوف موحەمەد، دووبەش، گ/ کاروان، ژمارە/ (٤١، ٤٢)، شوباتو ئازاری ١٩٨٦.
٧. شیعرەکانی مستەفا شەوقی قازی زادە، عبدالله محمد حەداد، گ/رۆشنبیری نوێ، ژ/١١٢، کانوونی یەکەم ١٩٨٦ .
٨. هەتاوی کوردو سەردەمی راپەڕین، محمود زامدار، گ/ کاروان، ژ/ ٥٣، مارتی ١٩٨٧.
٩. دکتۆر مستەفا شەوقی، ئەحمەد شەریفی، گ/سروە، ژ/٦، خەرمانانی ١٩٩١.
١٠. سالهای اضطراب، خاطرات خلیلي فتاحي قاضی، انتشارات صلاح الدین ایوبی، اورمیە، ١٩٩١/١٣٧٠.
١١. لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە، عەلی رێبوار، گ/سروە، ژ/٨٦، خەرمانان ١٩٩٣.
١٢. قازی زادە مستەفا شەوقی- لە بارەی ژیانو خەباتو شیعرەکانی، عوسمان دەشتی، گ/ رۆژنامەڤانی، ژ/(٦-٧)، هەولێر-٢٠٠٢.
١٣. رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان، س.چ.هێرش، گ/گزینگ، ژ/١٣، پاییزی ١٩٩٦.
١٤. تاریخچە خانوادە قاضی در ولایت موکری، خلیل فتاح قاچی، تبریز، ١٩٩٩/١٣٧٨.
١٥. بەسەرهاتی دکتۆر مستەفا قازی زادە، ئەمیری حەسەنپوور/حەسەنی قازی، گ/رۆژنامەڤانی، ژ/ (٦، ٧)، زستانی ٢٠٠٢.
١٦. سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردی، ١٨٩٨-١٩٣٢، یادگار رەسول باڵەکی، دەزگەها سپیرێز یا چاپو وەشانێ، دهۆك، ٢٠٠٥.
١٧. بەشێك لە بەرهەمەکانی دکتۆر مستەفا شەوقی قازی زادە، گردو کۆی: ئەحمەد شەریفی، مهاباد، ١٣٨٤/٢٠٠٥ .

ب. کورتەیەکی ژیانو بەسەرهاتی مستەفا شەوقی:

لەو وتارەی بەڕێزان ئەمیری حەسەنپوورو حەسەنی قازی لەمەڕ ژیان‌و بەسەرهاتی شەوقیدا بلاّویان کردۆتەوە،[٢٧] بە پشت بەستن بەو نامەو زانیارییانەی کە دەقاودەق لە هەندێ لە ژمارەکانی گۆڤاری کوردستاندا میشنێری "The Kurdistan Missionary" بلاّوکراونەتەوە، کە زمانحاڵی مسیونێکی مەسیحی بووەو لەنێوان ساڵانی ١٩١٠ – ١٩٢٨ لە شاری میناپۆلس، ولایەتی شیگاغۆ لە ئەمەریکا دەرچووەو لە سابلاغ و موکریاندا بلاّوکراوەتەوە، لە هەندێ ژمارەکانیدا کۆمەڵێ هەواڵ‌و دەنگوباسی سابلاغ‌و ناوچەی موکریانی بلاّوکردۆتەوە. مستەفا شەوقی لە ڕێگای یەکێك لەو مسیونێرانەوە کە ناوی "N.J. Lohre" ە لە ئەستەمبوڵ ژیاوە پەیوەندی لەگەڵ مسیونەکە هەبووەو کۆمەڵێك نامەو نامەکاری لە ساڵانی ١٩٢١ – ١٩٢٣ لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕکراوە لە ژمارە (٢)ی ساڵی (١٥)ی ئەم گۆڤارەدا، کە ڕێکەوتی مانگی شوباتی ١٩٢٣ی بەسەرەوەیە، شەوقی کورتەیەکی ژیاننامەی خۆی، کە لە نامەکانی خۆیدا بۆ ئەم مسیۆنە نووسیوە بلاّوکراوەتەوە، کە لێرەدا بە قەڵەمی درشت وێستگە سەرەکییەکانی دەست نیشان دەکەین:

- وەکو خۆی دەڵێ لە ساڵی (١٨٩٦) لە دایك بووە، فارسی‌و عەرەبی خوێندووەو تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.
- لە ساڵی (١٩١١) کە تەمەنی پانزە ساڵان بووە چووە بۆ ئەستەمبوڵ.
- لە ساڵی (١٩١٣) قوتابخانەی ناوەنجی‌و ئامادەیی (لیسە)ی تەواوکردووە.
- هەر لەو ساڵەدا (١٩١٣) چۆتە ئەڵمانیاو لەدوای سێ ساڵ‌و لەبەر بێ دەرامەتی (١٩١٦) گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵ.
- لە ساڵی (١٩١٦) بووە بە ئەسیستانت.
- لە (١٩١٧) چۆتە کۆلێژی پزیشکی‌و لە (١٩٢٢)دا تەواوی کردووەو بووە بە پزیشك.
- ئەندامی کۆمەڵەی (هێڤی) بووەو لە (ڕۆژی کورد)و (هەتاوی کورد)ی زمانحاڵی کۆمەڵەکە وتارو نووسینی بلاّوکردۆتەوە. هەروەها لە (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان)یش ئەندام بووەو لە ئۆرگانەکەیدا (گۆڤاری ژین)، لەنێوان ساڵانی (١٩١٨ – ١٩٢٠) کۆمەڵێ شیعری بلاّوکردۆتەوە. وەکو چۆن لە گۆڤاری (کوردستان)ی

---

(٢٧) ئەو وتارە لە بنەڕەتدا لە یەکێ لە ژمارەکانی (گۆڤاری گزینگ)ی چاپی سویددا بلاّوبۆتەوە، لە ژمارە (٦ -٧)ی گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی، کە دۆسیەی تایبەتی بۆ گۆڤاری (ژین) ئەستەنبوڵ تەرخانکردووە، دووبارە وتارەکە چاپ کراوەتەوە.

ئەستەمبۆڵیشدا، کە لە نێوان ساڵانی (١٩١٩ — ١٩٢٠) لە ئەستەمبۆڵ دەرچووەو محمد میهری سەرنووسەری بووە، چەند بەرهەمێکی بڵاوکراوەتەوە.

لە بارەی بەسەرهاتو ژیانو چالاکی مستەفا شەوقی زانیاری جۆراوجۆر لە بەدەستدا هەن، کە ساغ کردنەوەو لێ وردبوونەوەیان پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتو سەربەخۆ هەیە. لە نامەو وتارو شیعرو بەرهەمە بڵاوکراوەکانیدا ئەوە روون دەبێتەوە کەوا:

- مستەفا شەوقی هەر لە سەردەمی لاوێتیدا لە سابلاغ پەیوەندیو دۆستایەتی لەگەڵ مسیونو مسیۆنێرە مەسیحییەکاندا پەیداکردووە، تا ئەو رادەیەش لەگەڵیاندا چۆتە پێشەوە تا وردە وردە بیروباوەڕی ئاینی بەرەو مەسیحیەت گۆڕاوە، بەڵام ئەوان لەو مەسەلەیە زۆر لێی دڵنیانەبوون.[٢٨] پارەو یارمەتیشی لێیان وەرگرتووە بۆ خەرجی تەواوکردنی خوێندنەکەی لە کۆلیجی پزیشکی زانکۆی حەیدەر پاشا لە ئەستەمبۆڵ.

- هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابووە کە ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ مسیۆنێرەکاندا هەیەتی بیخاتە بواری خزمەت بەخشین بە گەلو وڵاتەکەی، بۆیە لە چەند جێگا لە نامەکانیدا راشکاوی ئەو مەبەستەی راگەیاندووە: (دیارە وەکی بۆتان دەرکەوتووە ئاواتی یەکەمی من ئەوەیە کە خزمەت بە وڵاتی بوومی خۆم کوردستان بکەم)،[٢٩] وەکو چۆن لە هەوڵی ئەوەدابووە کە سۆزی ئەمریکاییەکان بۆ یارمەتی دانی خەڵکی کورد رابکێشێت سەبارەت بەو کاولکاریو وێرانییەی لە ئاکامی شەڕدا دووچاری بوون (ئێمەی کوردیش دەتوانین بڵێین ئەوە بۆ یەکەم جارە دەکەوینە بەر کەرەمو خۆشەویستی ئەمریکاییەکان کە زۆر بە گوڕ خەریکی پاککردنەوەی وێرانییەکانی شەڕن. بەڵام کوردەکان لەبەر نەزانی لە هەلومەرجێکی زۆر کاولکراوتردا دەژین، ئەمن خۆشحاڵم لەوەی ئێوە ئەوپەڕی حەولی خۆتان دەدەن بۆ ئەوەی یارمەتی بە ئێمە بکەن...ئێمە لە قووڵایی دڵەوە خۆمان بە قەرزاری مسیۆنێرەکان دەزانین بە رێی ئەو مەدرەسەو نەخۆشخانانەی دروستیان کردووە، گەلی ئێمە وشیار دەبێتەوە بۆ ئەوەی قەدری کولتوورو ئاینی رۆژئاوا بزانێ . . .

---

(٢٨) بڕوانە: نامەی دووهەمی م. قازی بۆ لۆڕ، کوردستان میشینێری، ژمارە ٤، ئاوریلی ١٩٢٢- گ/رۆژنامەڤانی، ژ/٧-٦: ٣٣٤.

(٢٩) هەر ئەو سەرچاوەیە: ٣٣٣.

لەو وتارەی بەرێزان ئەمیری حەسەنپوورو حەسەنی قازی لەمەڕ ژیانو بەسەرهاتی شەوقیدا بلاویان کردۆتەوە،[٣٧] بە پشت بەستن بەو نامەو زانیارییانەی کە دەقاودەق لە هەندێ لە ژمارەکانی گۆڤاری کوردستاندا میشنێری "The Kurdistan Missionary" بلاوکراونەتەوە، کە زمانحالی مسیونێکی مەسیحی بووەو لەنێوان سالانی ١٩١٠ – ١٩٢٨ لە شاری میناپۆلس، ولایەتی شیگاغۆ لە ئەمەریکا دەرچووەو لە سابلاغ و موکریاندا بلاوکراوەتەوە، لە هەندێ ژمارەکانیدا کۆمەلێ هەوالو دەنگوباسی سابلاغو ناوچەی موکریانی بلاوکردۆتەوە. مستەفا شەوقی لە رێگای یەکێك لەو مسیونێرانەوە کە ناوی "N.J. Lohre"ە لە ئەستەمبوڵ ژیاوە پەیوەندی لەگەڵ مسیونەکە هەبووەو کۆمەلێك نامەو نامەکاری لە سالانی ١٩٢١ – ١٩٢٣ لە نێوانیاندا ئالوگۆڕکراوە لە ژمارە (٢)ی سالی (١٥)ی ئەم گۆڤارەدا، کە رێکەوتی مانگی شوباتی ١٩٢٣ی بەسەرەوەیە، شەوقی کورتەیەکی ژیاننامەی خۆی، کە لە نامەکانی خۆیدا بۆ ئەم مسیۆنە نووسیوە بلاوکراوەتەوە، کە لێرەدا بە قەلەمی درشت وێستگە سەرەکییەکانی دەست نیشان دەکەین:

- وەکو خۆی دەلێ لە سالی (١٨٩٦) لە دایك بووە، فارسیو عەرەبی خوێندووەو تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.
- لە سالی (١٩١١) کە تەمەنی پانزە سالان بووە چووە بۆ ئەستەمبوڵ.
- لە سالی (١٩١٣) قوتابخانەی ناوەنجیو ئامادەیی (لیسە)ی تەواوکردووە.
- هەر لەو سالەدا (١٩١٣) چۆتە ئەلمانیاو لەدوای سێ سالو لەبەر بێ دەرامەتی (١٩١٦) گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵ.
- لە سالی (١٩١٦) بووە بە ئەسیستانت.
- لە (١٩١٧) چۆتە کۆلێژی پزیشکیو لە (١٩٢٢)دا تەواوی کردووەو بووە بە پزیشك.
- ئەندامی کۆمەلەی (هێڤی) بووەو لە (رۆژی کورد)و (هەتاوی کورد)ی زمانحالی کۆمەلەکە وتارو نووسینی بلاوکردۆتەوە. هەورەها لە (کۆمەلەی پێشکەوتنی کوردستان)یش ئەندام بووەو لە ئۆرگانەکەیدا (گۆڤاری ژین)، لەنێوان سالانی (١٩١٨ – ١٩٢٠) کۆمەلێ شیعری بلاوکردۆتەوە. وەکو چۆن لە گۆڤاری (کوردستان)ی

---

(٣٧) ئەو وتارە لە بنەرەتدا لە یەکێ لە ژمارەکانی (گۆڤاری گزینگ)ی چاپی سویددا بلاوبۆتەوە، لە ژمارە (٦ -٧)ی گۆڤاری رۆژنامەڤانی، کە دۆسیەی تایبەتی بۆ گۆڤاری (ژین) ئەستەنبوڵ تەرخانکردووە، دووبارە وتارەکە چاپ کراوەتەوە.

ئەستەمبۆڵیشدا، کە لە نێوان ساڵانی (١٩١٩ – ١٩٢٠) لە ئەستەمبۆڵ دەرچووەو محمد میهری سەرنووسەری بووە، چەند بەرهەمێکی بڵاوکراوەتەوە.

لە بارەی بەسەرهاتو ژیانو چالاکی مستەفا شەوقی زانیاری جۆراوجۆر لە بەدەستدا هەن، کە ساغ کردنەوەو لێ وردبوونەوەیان پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتو سەربەخۆ هەیە. لە نامەو وتارو شیعرو بەرهەمە بڵاوکراوەکانیدا ئەوە روون دەبێتەوە کەوا:

- مستەفا شەوقی هەر لە سەردەمی لاوێتیدا لە سابلاغ پەیوەندیو دۆستایەتی لەگەڵ مسیونو مسیۆنێرە مەسیحییەکاندا پەیداکردووە، تا ئەو رادەیەش لەگەڵیاندا چۆتە پێشەوە تا وردە وردە بیروباوەڕی ئاینی بەرەو مەسیحیەت گۆڕاوە، بەڵام ئەوان لەو مەسەلەیە زۆر لێی دڵنیانەبوون.[٢٨] پارەو یارمەتیشی لێیان وەرگرتووە بۆ خەرجی تەواوکردنی خوێندنەکەی لە کۆلیجی پزیشکی زانکۆی حەیدەر پاشا لە ئەستەمبۆڵ.

- هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابووە کە ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ مسیۆنێرەکاندا هەیەتی بیخاتە بواری خزمەت بەخشین بە گەلو وڵاتەکەی، بۆیە لە چەند جێگا لە نامەکانیدا راشکاوی ئەو مەبەستەی راگەیاندووە: (دیارە وەکی بۆتان دەرکەوتووە ئاواتی یەکەمی من ئەوەیە کە خزمەت بە وڵاتی بوومی خۆم کوردستان بکەم)،[٢٩] وەکو چۆن لە هەوڵی ئەوەدابووە کە سۆزی ئەمریکاییەکان بۆ یارمەتی دانی خەڵکی کورد رابکێشێت سەبارەت بەو کاولکاریو وێرانییەی لە ئاکامی شەڕدا دووچاری بوون (ئێمەی کوردیش دەتوانین بڵێین ئەوە بۆ یەکەم جارە دەکەوینە بەر کەرەمو خۆشەویستی ئەمریکاییەکان کە زۆر بە گوڕ خەریکی پاککردنەوەی وێرانییەکانی شەڕن.!بەڵام کوردەکان لەبەر نەزانی لە هەلومەرجێکی زۆر کاولکراوتردا دەژین، ئەمن خۆشحاڵم لەوەی ئێوە ئەوپەڕی حەولی خۆتان دەدەن بۆ ئەوەی یارمەتی بە ئێمە بکەن...ئێمە لە قووڵایی دڵەوە خۆمان بە قەرزاری مسیۆنێرەکان دەزانین بە رێی ئەو مەدرەسەو نەخۆشخانانەی دروستیان کردووە، گەلی ئێمە وشیار دەبێتەوە بۆ ئەوەی قەدری کولتوورو ئاینی رۆژئاوا بزانێ . . .

---

(٢٨) بڕوانە: نامەی دووهەمی م. قازی بۆ لۆڕ، کوردستان میشینێری، ژمارە ٤، ئاوریلی ١٩٢٢-گ/رۆژنامەڤانی، ژ/٧-٦: ٣٣٤.

(٢٩) هەر ئەو سەرچاوەیە: ٣٣٣.

ئەمن پێم خۆشە گۆڕانێكی تەواو لە هەلومەرجی كۆمەلایەتیو دینی ولاتەكەمو گەلەكەمدا ببینم).[30]

دیارە منەوەرو رۆشنفكرانی كورد لەو سەردەمەدا زۆر بە قوولی كەوتبوونە ژێر كاریگەریی بەندەكانی راگەیەندراوی سەرۆكی ئەمریكا (ودرۆ ویلسن) كە تیادا بانگی ئازادیو سەربەخۆیی بۆ گەلانی ژێر دەستەی ئیمپراتۆریەتی هەلوەشاوەی عوسمانی دەكرد. بۆیە كورد ئومێدێكی بەو سەرەتایانەی ویلسن پەیداكردبوو.

ـ سەرەتا شەوقی لە ئەستەمبۆل دەبێتە ئەندامی كۆمەلەی (هێڤی – ۱۹۱۲)و لە ئۆرگانەكەشیاندا (هەتاوی كورد) وتاری زانست پەروەریو هاندانی كوردانی بۆ دامەزراندنی فێرگەو قوتابخانەو خوێندنو فێربوون بە زمانی كوردی بلاوكردۆتەوە، تەنانەت داوا دەكات كتێبەكانی شەرعو فیقهی ئاینی ئیسلام لە لایەن مەلاو زانایانی كوردەوە بە كوردی تەرجەمە بكرێنو بەكوردی بخوێندرێن.[31] هەروەكو (م. بۆزئەرسەلان) باسی كردووە، هەردوو لاوی كوردستانی رۆژهەلات مستەفا شەوقیو محمد موفتی زادەی میهری لە ئەندامە ناسراوەكانی ئەم كۆمەلە بوون.[32]

لە دوای سەفەرو گەرانەوەی لە ولاتی ئەلمان (۱۹۱۳ – ۱۹۱٦)و تێهەلچوونەوەی لە خوێندنی پزیشكی ۱۹۱۷ دوای ئەوەش كە جەنگی یەكەم بلێسەكەی دادەمركێ، سەرۆكو رێبەرو ناودارانی كورد كە پێشتر پەرتەوازەو راپێچی بەرەكانی شەركرابوون، وردە وردە دادەورینەوەو لە ئەستەمبۆل لە كەشو هەوایەكی تازەدا یەك دەگرنەوە. لە كۆتایی ۱۹۱۸ كۆمەلەی پێشكەوتنی كوردستان پێك دێو زۆربەی خوێندەوارو زانایانی كوردی دانیشتووی ئەستەمبۆل بوونەتە ئەندامی ئەو كۆمەلەو

---

(۳۰) هەر ئەو سەرچاوەیە: ۳۳۳.

(۳۱) بروانە:- ئۆرژینالی ژمارە (۳)ی (هتاوكرد)، عەبدوللا زەنگەنە، گ/ رۆژنامەنووس، ژ/ ۹:۵۵ .

- تەرەقی دینمان دەوێ، قازی زادە- مستەفا شەوقی، هەتاوی كورد، ژمارە/۳، ك: ۱۳۲۹/۱۹۱۳: ۲۱ – ۲٤، لە وتاری: هەتاوی كوردو سەردەمی راپەرین، محمود زامدار، گ/ كاروان، ژ/۵۳، مارتی ۱۹۸۷ وەرگیراوە.

لە گۆڤارەكەدا ناوی نووسەری وتارو ناونیشانەكەی بەم شێوەیە تۆماركراوە: (سابلاغ – قازی زادە – مستەفا شەوقی)، ئەمە نووسەرانی ژیاننامەی شەوقی هێناوەتەوە سەر ئەو باوەرە كە تا ئەو كاتە ئەو لە سابلاغ بووبێت. بروانە:

- بەشێك لە بەرهەمەكانی دكتۆر مستەفا شەوقی قازی زادە، ئەحمەد شەریفی: ۱۳.

(۳۲) ژین، گۆڤارا تركی – كوردی، ۱۹۱۸، ۱۹۱۹، بـ۱: ۲۱.

یەکێك لەوانەش مستەفا شەوقی خەباتگێر دەبێت.[٣٣] هەر لەو سەروبەندەش گۆڤاری (ژین) کەوەکو ئۆرگانی نارەسمی ئەو کۆمەڵەیە بوو لە ئەستەمبوڵ بڵاودەبێتەوە، کە مستەفا شەوقی یەکێك لە نووسەرە بەردەوام و قەڵەم بە بڕشتەکانی ئەو گۆڤارە دەبێت لە یەکەم ژمارەیەوە (٧ ت٢ ١٩١٨) تاوەکو ژمارە (١٥) کە لە (٣٠ مارتی ١٩١٩)دا دەرچووە. دوای ئەوەش لە گۆڤاری (کوردستان)ی ئەستەمبوڵ کە لە ساڵانی ١٩١٩ — ١٩٢٠دا دەرچووەو خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری بەرپرسیشی محمد موفتی زادەی میهری هاوزێدی بووە، شەوقی چەند بەرهەمێکی لە چەند ژمارەیەکیدا بڵاوکردۆتەوە.[٣٤] وەکو لە بڵاوکراوەکانی کوردستان میشینێری دەردەکەوێت شەوقی لە کۆتایی ١٩٢٣دا بە هاوئاهەنگی دکتۆر شالك کە نێردراوێکی ئەو مسیۆنە بووەو بە داو دەرمان و کەلوپەلێکی پزیشکی زۆرەوە ، بڕیاریان وابووە لە ڕێگا یەکبگرنەوەو بە جووتە بگەنە ئێران. پێدەچێت شەوقی لەم سەفەرەشیدا ماوەی دوو ساڵێك لە سابلاغ مابێتەوە.[٣٥] سەبارەت بە سەفەری ساڵی ١٩٢٩ی مستەفا شەوقی بۆ سابلاغ وەکو نوێنەری کۆمەڵی خۆیبوون، (١٩٢٧ دامەزراوە)، شەوقی لەو نامەیەدا کە لە ساڵی ١٩٢٨ بۆ گەوهەر تاج خانمی خوشکی ناردووە دەڵێ: (لە بیری ئەوەدا بووم لەو پاییزەدا بگەڕێمەوە، بەڵام بەو هۆیەی کە کچۆڵەکانم (وەکو لە وێنەکەیان ڕا دیارە) چکۆڵەن و بەرگەی هیلاکی سەفەر ناگرن، بۆیە بە ناچاری سەفەرەکەم بۆ بەهار وەدواکەوت. هەر کاتێکیش لە سەرۆکایەتی تەندروستی ولایەتی وان دامەزرام کە لە سابلاغ زۆر نزیکەو بڕیار وایە بۆ ئەو ناوە بێم، ئەوە لەپاشان سەردانی نیشتمانی پیرۆز دەکەم و چاوانی پڕ لە غەریبیم پێ ڕووناك و شادمان دەبێتەوە، لە ڕاستیدا لەوە زیاتر مانەوە لە غەریبایەتی جائیز نییە...ناشمەوێ ئەو کارەی دەوڵەتی کە لێرە زۆر بە سەختی وەگیرم کەوتووە بە سانایی لە دەستی بدەم، بۆیە کاتێك دێمە ولایەتی وان ئەوا بە ووردی هەواڵ و بارودۆخەکە لە نیشتمان هەڵدەسەنگێنم و لە حالەتێکدا لە نیشتمانی پیرۆز شوێنێکی باشم بە پەسەند زانی، ئەوا بێ گومان گەڕانەوەو ژیان لە نیشتمان هەڵدەبژێرم، بەمجۆرە خوا یار بێ لەم پێنج شەش مانگە گەڕانەوەی وڵاتم بە نسیب

---

(٣٣) سەرچاوەی پێشوو: ٢٣.

(٣٤) گۆڤاری کوردستان ١٩١٩ -١٩٢٠، کۆکردنەوەو لەسەر نووسین: د. فەرهاد پیرباڵ، هەولێر، ١٩٩٨.

(٣٥) گۆڤاری ڕۆژنامەوانی، هەر ئەو ژمارەیە: ٣٣٨.

دەبێت..).[٣٦] بۆیە ئەم بڕگەیە لە ژیانی شەوقیدا وە ڕاست دەگەڕێ کە لە ساڵی ١٩٢٩دا هاتۆتەوە سابلاغو لەگەڵ زاناو ڕووناکبیرانی وەکو پێشەوا قازی و دکتۆر وێنەتانی ئەرمەنیو نیشتمانپەروەرانی دیکەدا تێکەڵاوی بووەو لە ڕێگای عەیادەکەشیدا خزمەتی زۆری بەخەڵکی ناوچەکە کردووە، دوای ئەوەی پۆلیسی ڕەزاخان هەست بە چالاکیو جموجۆڵەکانی دەکەن دەیخەنە ژێر چاودێریو تەنگی پێ هەڵدەچنن، بۆیە بەناچاری خۆی ڕزگار دەکاتو بەرەو ئەستەمبوڵ دەگەڕێتەوە. (ئەو هەتا چەند ساڵان پێوەندی نامەیی لەگەڵ خزمو کەسوکاری هەبووە، بەڵام دوای دەستپێکردنی شەڕی دووەمی جیهانی پێوەندی پچراو چی دی نامەی نەهات، بەپێی قسەی ڕێبوارێك کە لە تورکیا هاتبۆوە دەرکەوت کە دکتۆر لە ساڵی ١٣٢٩ی هەتاوی "١٩٥٠ زاینی" بە سەکتەی دڵ مردووە).[٣٧] لەبارەی سەربوردەی قازی لەتیفی باوکی شەوقیش، لەدوای ئەوەی رووسەکان لە ساڵی ١٩١٦ سابلاغ داگیردەکەنو میرزا فەتاحی قازی شەهید دەکەن، چەند کەسێك لە پیاوانی بنەماڵەی قازی بەدیل دەگرنو بۆ روسیا دووریان دەخەنەوە، کە یەکێکیان قازی لەتیفی باوکی شەوقی دەبێت، لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەر ١٩١٧، گیراوەکان ئازاد دەکرێنو دەگەڕێنەوە سابلاغ، بەڵام قازی لەتیف لە ڕێگای پۆلۆنیاو ئەڵەمانیاوە دەچێتە ئەستەمبوڵو لەگەڵ شەوقی کوڕیدا یەك دەگرنەوە. هەڵبەتە ئەویش پیاوێکی زاناو شاعیرو نیشتمان پەروەربووە، لەو ماوەیەدا سەروکاری لەگەڵ کۆمەڵو کوردانی ئەوێ هەبووە، قەسیدەیەکی (٢٣) بەیتی لە (ژین، ژمارە-٧، ٢/١/ ١٩١٩)دا بڵاوکردۆتەوە لەسەر شێوەی شیعرە نیشتمانییەکانی حاجی قادرو لە کۆتاییەکەیدا دەڵێ:

خۆ ئەگەر بێتوو ئەمن راهی بکەن بۆ موڵکی خۆم
کوردی ئیرانیش هەموو سەف سەف دەکەم هەروەك قەتار
هەر چلۆنی رەئی مەجلیس بێ وەهایان پێ دەڵێم
سەد هەزاران بایەعین بۆ ئەمری ئەو پیری هەژار
ئەی (لەتیف) حەیفە کە تۆ لێرە غەریبو بێکەسی
وەرنە بۆ ئەم مەسئەلە فەردی وەکو قوتبی مەدار[٣٨]

---

(٣٦) بەشێك لە بەرهەمەکانی دکتۆر مستەفا شەوقی قازی زادە: ٥٧ — ٥٨.

(٣٧) سالهای اضطراب: ٣٥.

(٣٨) ژین، سەرچاوەی پێشوو، ب٢: ٢١٥.

شـەوقی کـە ئـەو کاتـە خوێنـدکاری پزیـشکی بـووە، هـاوڕێتی بـاوکی دەکـاتو دەیگەیەنێتەوە سابلاغو خۆی لە سیپتامبری ۱۹۲۰دا دەگەڕێتەوە ئەستەمبۆل بـۆ سـەر خوێندنەکەی. قازی لەتیف لە کاتی هێرشی لەشکری شکاك بۆ سەر سابلاغ بە دەستی پیـاوانی سمکـۆ لـە ۱۹۲۱دا لـە ختوخـۆرایی شـەهید دەکرێـت، قـازی لـەتیف کـوڕێکی دیکەشی هەبووە، بەناوی کەریمی یەمینی قازی کە دایك برای شەوقی بووە.[٣٩]

ج. شیعرو بەرهەمی شەوقی

شیعرو بەرهـەمی شـەوقی ئـەوەی تـا ئێـستا زانرابێـتو دۆزرابێتـەوە شـتێکی کەمـە، ئـەویش بریتیـە لـەو چـەند پارچـە شـیعرو چـەند وتـارەی لەهـەر سـێ گۆڤـاری ئەستەمبوڵدا بڵاوکراونەتەوە:

- هەتاوی کورد ۱۹۱۳ ، ژین ۱۹۱۸ — ۱۹۱۹ ، کوردستان ۱۹۱۹ — ۱۹۲۰

— چـەند نامەیـەك کـە هەنـدێکیان لـە بڵاوکـراوەی کوردسـتان مـشینێری و یـەك دوانێکیش بەم دواییە بڵاوکراونەتەوە.[٤٠]

ئەو شیعرو بەرهەمانەی شەوقی ئەوەی تا ئێستا دیارن، هەرچـەندی بـە ژمـارە کـەمو لـە پەنجـەی دەسـتان تێناپـەڕن بـەڵام لـە بـاری هونـەریو داهێنـانو چـۆنایەتییەوە بەگوێرەی زەمانەو هەلومـەرجی داهێنانیـان بـۆ مێـژووی ئـەدەبی کوردی بایـەخێکی بەرچاویان هەیە[*].

---

(٣٩) بەشێك لە بەرهەمەکانی دکتۆر مستەفا شەوقی قازی زادە: ٨.

(٤٠) هەرچەندە بەڕێزان ئەمیری حەبەنپوورو حەسەنی قازی هەوڵیان داوە بەڵام دیارە دەستیان بە هەموو ژمارەکانی ئەو گۆڤارە رانەگەیشتووە، ئەوەی پەیوەندی بە (شەوقی)یەوە هـەبێت لـەو ژمارانەی بەردەستیان لە وتارەکەیاندا بڵاویان کردۆتەوە. بڕوانە:

— گۆڤـاری رۆژنامـەڤانی، (ژ/ ٦-٧)، لاپـەڕەکانی ٣٢٩ — ٣٣٨. هـەروەها ئەوانـەی لـە ژیـانو بەرهەمەکانی شەوقیان کۆڵیوەتەوە لەو باوەڕەدان کە دەبێ بەرهەمی زۆرتری هەبووبێت.

بڕوانە:

- بەشێك لە بەرهەمەکانی دوکتۆر مستەفا قازی زادە: ١٧.

* کاك ئەحمەدی شەریفی نووسەرو توێژەرو ئەرشیفێستی مهابادی لە ساڵی ٢٠٠٥دا نامیلکەیەکی لە بارەی ژیانو بەرهەمەکانی شەوقی ئامادەکردووەو بڵاوکردۆتـەوە، کـە نـاوی نـاوە (بەشـێك لـە بەرهەمـەکانی دکتـۆر مـستەفا شـەوقی). بـەو هیوایـەی لـە دوا رۆژدا بەرهـەمی دیکـەی شـەوقی بکەوێتە بەردەست. کاك ئەحمەد بە گوێرەی گێڕانەوەی هەندێ لە پیرو بەساڵاچووانی سابلاغو پیروبۆچوونی خۆی، ژیاننامەی شەوقی نووسیوەتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك خۆی لە قەرەی◄◄

یەك لەو مەسەلە گرنگانەی كە توێژەرو مێژوونووسی ئەدەبی كوردی لەسەری وەستاوەو بایەخی پێداوە مەسەلەی نوێگەریو تازەكردنەوەی شیعری كوردی بووە لە دوای جەنگی یەكەمی جیهانی. كۆبەندی باسو لێكۆڵینەوەكان لەسەر ئەوە كۆكن كە گۆڕانكارییە گەورەكان لە ژێرخانی ئابووریو كۆمەڵایەتیو سیاسی لەسەرەتای سەدەی بیست، ئەدەبێكی تازەیان لای میللەتانی رۆژهەلات هێناوەتە كایەوەو ماوەی نێوانی هەردوو جەنگ ماوەی داهاتنی "شیعری تازە"ی كوردی، واتە قۆناغی رۆمانتیكی بووە، لەو سەردەمەدا ئەم رێرەوە لە روخسارو ناوەرۆكدا لە ئەدەبی كوردی خۆی گرتو بە تاقیكردنەوەیەكی سەركەوتوودا تێپەڕی،[٤١] سەبارەت بەو نەوەیەش كە رۆڵی پێشەنگو رێبەرایەتیان لەم بزووتنەوە ئەدەبییە گێڕاوە، باسو بابەت گەلی بە سوودو تێرو تەسەل نووسراونو پێشكەش كراون. لەپاڵ هەوڵو هیمەتی پسپۆڕانی كورد بۆ زیندوو كردنەوەی ئەرشیفی رۆژنامەوانی كوردی كە لە سالانی حەفتاكانەوە دەستی پێكردووە، پەردە لەرووی ئەدەبو بەرهەمی بیرو داهێنانی زۆر لە شاعیرانو نووسەرانی كورد لادراوەو بەرهەمەكانیان كەوتونەتە بەر تیشكی رووناكی، لەمانە یەكێكیان قازی زادە مستەفا شەوقیو شوێنی ئەو شاعیرە لەپەرەسەندنی رێبازێكی نوێیە لە دنیای ئەدەبیاتی كوردی كە ئەویش رێبازی رۆمانتیكییە.(*)

مستەفا شەوقی (گەلێ مەعنای جوانو تازەی هێناوەتە نێو ئەدەبی كوردییەوە، شیعرەكانی شەقلێكی رۆمانتیكی رەسەنیان پێوە دیارە، لەبارەی داڕشتنو فۆرمی شیعریشەوە گەلێ وشەی جوانی كوردی بەكارهێناوە هەوڵێكی زۆری داوە تا زمانی

---

◄◄ زانیارییەكانی گۆڤاری كوردستان مشینێری نەداوە كە لە وتارەكەی ئەمیری حەسەنپوورو حەسەنی قازیدا هاتووەو سێ چوار سالێش بەر لە نامیلكەكەی ئەو بلاوكراوەتەوە. بڕوانە:

ـ بەشێك لە بەرهەمەكانی دكتۆر مستەفا شەوقی قازی زادە، گردوكۆی؛ ئەحمەدی شەریفی، مهاباد، ١٣٨٤/ ٢٠٠٥.

(٤١) لە بابەت مێژووی ئەدەبی كوردیەوە: ١٢٩.

* بۆ یەكەمین جار د. مارف خەزنەدار ئاماژە بۆ شوێنی شەوقی لە برەوسەندنی شیعری سیاسی دەكات لە سالانی نێوان هەردوو جەنگ دا، كە ئەمەشیان سیمایەكی دیاری شیعری رۆمانتیكی كوردییە. بڕوانە: ـ شیعری سیاسی كوردی لە كوردستانی عیراق دا، ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی، گۆڤاری كۆلیجی ئەدەبیات، ژ/١٥، زانستگای بەغدا، ١٩٧٢.

کوردی لە تەئسیراتی وشەو تەعبیراتی فارسی تازە رزگار بکات.. ئەم دیاردەیەش، هەر چەند ئەو ساکە تەواو جێی خۆی نەگرتبوو، بەڵام نیشانەی وریایی‌و هەست پاکی نەتەوەیی شاعیرە).[42]

(هاواری دایکێ) یەکەمین پارچە شیعری بڵاوکراوەی شاعیرە، بە پێشەکی یاخود پارچە پەخشانێکی ڤانگدراو بە هەناسەی رۆمانتیزمی دەستپێدەکات، وەك ئەوەی شاعیر زەمینەو سیناریۆ بۆ شانۆی رووداوەکان لە بەراییدا خۆش بکات، ئەم دیاردەیە لە شیعری کوردیدا پێشتر بەدی نەکراوە، بەڵام لە شیعری ئەوروپایی‌و عوسمانیدا هەبووە.[43]

- شاعیر بێجگە لە شێوە زاری موکریانی، لە هەوڵی ئەوەدا بووە سوود لە وشەو پەیڤ‌و شێوە زارەکانی دیکەش وەربگرێت. شێوازی دەبڕین و زمانی شیعریشی رەوان‌و بێ گرێ‌و گۆڵە، ئەم بەکاربردنی شێوازو شێوە زارە خۆماڵیانەش لە سەرجەم شیعرەکانی شەوقیدا بۆتە نەریتێك.

- شاعیر پەراوێزی بۆ هەندێ ناوو وشەو بێژەی ناو شیعرەکانی هێناوەتەوەو شەرحی بۆ کردوون‌و مانای لێکداونەتەوە تاوەکو خوێنەران لێی حاڵی بن، ئەمەش کارێکی بێ پێشینەیە، زیاد لەوەش جار نا جارێ باس لە بنیاتی رێزمانی وشەیەك دەکاو وەك زمانەوانێکی شارەزا لە گرامەری زمانی کوردی رێژەو دۆخەکانی گەردانکردنی ئەو چاوگە دەستنیشان دەکات. لە راستیدا پەی بردن بە نهێنییەکانی زمانی کوردی لەو رۆژگارەو بەم کارامەییە، شتێکە بلیمەتی‌و شارەزایی شاعیر دەردەخات.

لە ژمارە (٥)ی گۆڤاری (کوردستان)ی ئەستەمبۆلدا، پارچە شیعری (حەسبو حاڵ دەگەڵ وەتەن) بڵاوبۆتەوە، هەر لە هەمان لاپەڕەدا تەرجەمەیەکی شیعرەکە بۆ تورکی کراوە (هەم بە شیعرو هەم لەسەر هەمان کێش)، کە وەرگێرانەکەش بە قەڵەمی مستەفا شەوقی خۆیەتی.[44]

شەوقی چەند وتارێکی لە گۆڤارەکانی (هەتاوی کورد)و (ژین) بڵاوکردۆتەوە، کە تیادا بیری رۆشنگەری نەتەوەخوازی‌و نیشتمانپەروەری بە روونی دەردەکەوێت.

---

(٤٢) شیعرەکانی مستەفا شەوقی قازی زادە، گ/رۆشنبیری نوێ، ژ/ ١١٢: ٧٦.

(٤٣) مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەدار، ب٥: ١٥٦.

(٤٤) گۆڤاری کوردستان، ١٩١٩ — ١٩٢٠: ٧٩.

# باســـی یەکـــەم

## زمانی شیعری:

زمان مادەو کەرەستەی سەرەکی ئەدەب پێك دەهێنێ، بنیاتی زمانیش لە (وشە) پێکدێت. وشە کاتی بەکاربردنی لە ئەدەبدا زۆر جاران واتا فەرهەنگییەکەی بەجێ دێڵیو دەلالەتێکی نوێ وەردەگرێت.

لەم رووەوە هەریەك لە ئەفلاتونو ئەرستۆ زمانی شیعرو ئەدەب (بەجۆرێکی تایبەتی زمان، یا جۆرێکی تایبەت لەبەکارهێنانی زمان)[1] دادەنێن. تیورە تازەکانی مەیدانی زمانەوانیش هەر ئەو راستییە دووپات دەکەنەوەو هەموو کارێکی ئەدەبی بەچاوی زمانێکی تایبەتو هەڵبژێردراو سەیر دەکەن. بەو هۆیەشەوە کە زمان بە ژیانو بە رەوتی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە گرێدراوە، بۆیە حاڵەتێکی نەگۆڕو چەسپاوی نییە، لەگەڵ ئەوەی زمانی شیعر (پەیرەوی لەهەمان یاساو دەستورەکانی زمان دەکات، بەڵام بە پێی ئەو بارو دۆخە نوێیانەی کە لە ئەنجامی یاساکانی گۆڕانو پەرەسەندنی ژیانەوە روودەدەن، ئەویش لەهەر سەردەمێکدا مانای نوێ پەیدا دەکات کە لەگەڵ سەردەمەکە بگونجێت)[2]. بۆیە زمانی شیعرو زمانی ئەدەب لەهەر رۆژگارو سەردەمێکدا کۆمەڵێك سیماو خاسیەتو تایبەتمەندی خۆی هەیە.

دیوانی شیعری کلاسیکی کوردی بەپێڕەوی لەبارودۆخی سەردەمو بەهۆی کاریگەری دوورو درێژی زمانو فەرهەنگی عەرەبیو فارسیو تورکی، بوو بەو سامانە ئەدەبییەی کە خاوەنی کۆمەڵێك سیماو ئەدگارو خاسیەتی تایبەتییەو لە پێشەوەشیان ئەو زمانە (تێکەڵاوەیە) کە پێی تۆمارکراوە. بەرهەمی ئەدەبی ناوچەی موکریانیش لە دەورەی یەکەمی داهێنانیدا لەسەر دەستی (وەفاییو حەریقو ئەدەب...) کە لە رووی جەوهەرو وەسفی گشتییدا بەشێکە لەو سامانەو لێی دانابڕێت، هەر بەو زمانە داهێندراوە. بەم پێیە (زمان) دەبێتە ناسنامە بۆ بەرهەمو داهێنانی ئەدەبی لەهەر دەورو سەردەمێکدا، کە دەورو سەردەمیش گۆڕا ئەدەبیش دەگۆڕێتو دیاردەکە لە زمانەکەشدا رەنگ دەداتەوە. ئەو (دیاردەی گۆڕانو نوێ بوونەوەیە لە رووی مێژووییەوە لە ئەنجامی کارلێکردنو بەریەك کەوتنی دوو

---

(1) رەخنەی ئەدەبی کوردیو مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر: ٢٨٣.

(2) سەرچاوەی پێشوو: ٢٨٥.

عەقڵیەت‌و دوو هەڵوێستی جیاوازدا لە دایك دەبێت‌و لە کەش‌و هەوای گۆڕانی ژیان‌و لە بارودۆخی تازەدا گەشەدەکات).[3]

سەرەتاو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم سەردەمی ئاڵوگۆڕە گەورەکانە لە ناوچەکەدا، کە هاوزەمان بووە لەگەڵ بووژانەوەو پەرەسەندنی هوشیاری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و هەر لەو رۆژگارەشدا کازێوەی قۆناغێکی رۆشنگەری‌و رێنیسانسی ئەدەبی لە کوردستان سەر هەڵدەدا کە مەڵبەندی موکریانیش پشکێکی لەو بوژانەوەیە، بەتایبەت لە مەیدانی رووناکبیری شیعری کوردیدا هەیە.

ئەنجا (لە ئەنجامی گۆڕانی باری ژیان‌و پەرەسەندنی رۆشنبیری‌و باوەش کردنەوە بۆ شارستانیەتی گەلانی ترو زیادبوونی بزووتنەوەی وەرگێڕانی بەرهەمی بیری نەتەوەکانی تر، ئەمانە هەموویان کردیانە کارێ کە نرکەی داواکردنی نوێ کردنەوە لە شیعردا بەرزبێتەوە).[4] لێرەدا کە ژیان‌و فیکرو جیهانبینی شاعیران لە ئاڵوگۆڕدا دەبێت ئەڵبەتە شێوازو زمان‌و بەیانیش دەگۆڕێت، بەگوێرەی ئەوەی کە زمان لە بنچینەدا ئامرازو کەرەستەی دەربڕین‌و بەرجەستەکردن‌و گوێزانەوەی فیکرو بیرو جیهانبینی مرۆڤە.[5] لە سۆنگەی ئەم جموجۆڵە تازەیەوە کاروانی شیعری موکریان لە ساڵانی نێوان هەردوو جەنگی گێتیدا لەسەر دەستی شاعیرانی ئەم دەورەیە (کۆکەیی، سەیف، شەوقی) لە رووی جیهانبینی‌و زمان‌و بەیان‌و شێوازەوە رووەو ئاقارێکی جیاواز هەنگاو هەڵدێنێ:

ـ شیعری ئەم دەورەیە تا دێ لەو زمانە دەستوورییە دێرین‌و تێکەڵەی شیعری کلاسیکی دادەبڕێت کە شاعیرانی دەورەی یەکەمی موکریان پەیڕەوکاری بوون‌و، لە هەوڵی دۆزینەوەی زمان‌و دەربڕینێکی تازەدا دەبێت کە لە زمانی خەڵك نزیکتر بێت‌و (خاس)و (عام) تێی بگات.

ـ ئەو باوەڕەی کە پێی وابوو رادەی دەسەڵاتی شاعیر بەندە بە ڕادەی تواناو دەسەڵاتی بەسەر ئەو زمانە رۆژهەڵاتییە تێکەڵاوەو رادەی وشە ئارایی‌و پەنابردنە بەر زاراوەی نامۆو ناسازگار لە شیعردا، لە ئارادا نەماو شیعری ئەو سەردەمە بایداوەتەوە سەر

---

(3) الثابت والمتحول: ١١.

(4) ئەدەب‌و رەخنە: ١٠٦.

(5) اللغه والفكر: ١٣٧.

زمـانی ئاخـاوتنی رۆژانـەو خۆمـاڵیو پـشتی لـە شـێوازی ئاهەنگـدارو ئـاڵۆزو قەبـەی شیعری کۆن کردووە.

- شاعیرانی پێشوو لە باری ئازادی ئەندێشەو رەسـەنایەتی لـە دەربڕینـی مەبەسـتو ناوەڕۆکـدا هەمیـشە لـە چوارچـێوەیەکی دیـاریکراودا دەسـووڕانەوە، گـۆرانی شـاعیر گوتەنی کە سێ کوچکەکەی (میرو پیرو مەعـشوق) بـوو، وشـەو تەعبیراتـە کۆنەکـەش لەوێنـەی (زولفـی زنجـیرو رۆژو مـانگی روخـسارو لێـوی یـاقوتو لـەعلو مـەرجان...) هەمیشە جۆرێك لە بابـەتو نـاوەڕۆکی نـاقۆڵاو ناپەسـەندیان بەسـەر شـیعرو شـاعیرا فەرز دەکـرد.[6] کەچـی شیعری ئـەو سـەردەمە زیاتر روودەکاتـە دەرخـستنی رەنـجو موعانـاتی مـرۆڤ و هۆکارەکانی پاشکەوتنی کۆمـەڵو مرۆڤـی کورد، هـەر ئـەو وشـەو تـەعبیرە راسـتگۆیانەو مـرۆڤ دۆستانەشـە کـە ڕەوتـی ئامـانجو نـاوەڕۆکی شـیعر دەستنیشان دەکەنو رەنـگ ڕێـژی بـۆ هەیکـەلی ئـەو شـیعرو بەرهەمانـە سـاز دەکـەنو پێکەوەیان دەگونجێنن.[7]

- شـیعری ئـەو دەورەیە لـە موکریـان رەنگـدەرەوەی بارودۆخی کۆمەڵگەی خۆیـەتی، لـەوبارەوە گـوتراوە: (ئەگـەر تـا دوێنـێ شـیعری کـوردی بـە تێکرایـی دەربـڕی بـیرو مەبەسـتێکی ئایدیالیـستیو عیرفـانیو گـشتی بێژانـەی هەمەلایەنـە بـووە، لـەماوەی هـەردوو جەنگـدا پـێ دەنێتـە قۆنـاغێکی ریالیـستی لـە "کۆمـەڵخوازیو رۆشـنگەریو نەتـەوە پـەروەری"، کـە هـەم بـاری کۆمەڵایـەتیو چـینایەتی، هـەم رۆشـنگەریو نەتەوەخوازی تیادا بەرجەستە دەبێتەوە).[8]

لەو ماوەیەدا لە موکریان ئاماژە بۆ رۆڵو بەرهەمی هەریەك لە شاعیران (مـەلامارف، سەیفی قازی، مستەفا شەوقی) دەکرێت کەوەکو سێ کوچکە هەریەکەو چمکێکی ئـەو گۆڕانو پێشکەوتنەی بەجۆرێك، لە ئەزموونی شیعری ناوچەی موکریـان لـە ئەسـتۆدا بـووەو بـەجێیان گەیانـدووە، ئـەنجا بـوون بەسـەر مەشـقی دەورەی دواتـری شـاعیرانی موکریـان لـە ناوەراسـتی سـەدەی بیـستەمدا لـە وێنـەی (حـەقیقیو ئـاواتو نـووریو هەژارو هێمنو هێدیو....) ئەوانی تر.

---

(6) شیعر نو: ٩.

(7) قضايا الشعر المعاصر: ٢٣٤.

(8) رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان: ٦٧.

ئەنجا لەم دەروازە گشتییەی زمانی شیعریی هاوبەشی ئەم سێ شاعیرەوە پێویستە ئاورێك لە زمان و شێوازی تایبەتی هەر یەکێکیان بدەینەوە.

أ. شێواز: سەرەتا پێویستە (ئەوە بزانین کە لەو قۆناغە نوێیەدا زمانی شیعری کلاسیکی یەکسەر لە زمانە کوردییە تێکەڵەکەوە نەگۆڕاوە بۆ زمانی کوردیی پەتی، بەڵکو زمانە کوردییە تێکەڵەکە هەرما، بەڵام بەشێوەیەکی تری جیاواز لە زمانە تێکەڵەکەی شیعری کلاسیکی کوردی).[9] ئەمە حەقیقەتێکەو بەروونی لە بەرهەمی شیعریی مەلا مارفی کۆکەییدا بەدیار دەکەوێت، کە لە رووی رووخسارەوە، واتە قاڵبی شیعری و زمان و شێواز و کێش و سەرواوە، لە شیعری کلاسیکییەوە نزیکترە تاوەکو بەرهەمی تازە، بەڵام شێوازێکی رەوان و روون و بێ گرێ و گۆڵی هەیە، وشەو زاراوە بێگانەکانیشی ئەوەندە قورس و ئاڵۆز نین کە خوێنەری ئاسایی سەری لێ دەرنەکات.

کەسێ غەوواسی بەحری عیلم و عەقل و فەزل و جەوهەر بێ
دەبێ سینەی سەفینەی عەزمی وەك سەددی سکەندەربێ
کەسێ مەیلی خەزێنەی گەنجی ئەسراری نیهانی بێ
دەبێ مەردی تەعام و حەوت خوانی شێرو ئەژدەربێ

یا کاتی دەڵێ:

باز ئەوا شابازی فیکرم، مەیلی پەروازی هەیە
بۆ شکاری لوتفی تۆ، زۆری نییە نازی هەیە
هەوری تەبعم مایلی گریان و بەرق و بارشە
بۆیە گوڵ کەیف و دەماغێکی تەڕو سازی هەیە
مودەتێکە عەندەلیبی باغی شێعرم ساکیتە
لەم گوڵ و گوڵزارە یەك دنیا گلەو رازی هەیە

دیوان: ٤٩.

مەلا مارف وەکو لەبەسەرهات و سەربردەکەیدا هاتووە، لە ژیاندا مرۆڤێکی دڵخۆش نەبووە، ئەو بەهەتیوی گەورە بووەو بۆ خۆ پێگەیاندن زۆر زەحمەتی کێشاوە، بە پیلان و دەسیسە کوڕە گەورەکەی (عەلی) دەکوژرێت، لە ئەنجامی دوژمنداری بەناچاری ئاواییە دڵنشینەکەی خۆیان بەجێ دێڵێ تا لە مەهاباد لە مزگەوتی (شا دەروێش) دەگیرسێتەوە. وەکو هێمنی شاعیر دەیگێڕێتەوە ناوبراو بەدەست هەژاری و

---

(9) رەخنەی ئەدەبی و مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر: ٣٠١.

دەست تەنگییەوە نالاندوویەتی، گوایە لە ئەنجامی گریان‌و نالانی لە سوێی لەکیس چوونی کوڕەکەی‌و لەداخی هەژاری‌و بێ دەرامەتی، هەردوو چاوەکانی هەو دەکەن‌و لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییەدا هەردوو چاوەکانی لەدەست دەدات، ئەمە دۆخەکە ئالۆزترو خراپتر دەکات، بۆیە رەشبینی‌و بەدبەختی‌و توڕەیی‌و پشوو لە ناخ‌و دەروونیدا رەگ‌و ریشەی دادەکوتێ، ئەنجا ئەم حاڵەتە رەش بینییە دەبێ بە پێکهاتەی میزاج‌و نەست‌و بیرو جیهانبینی شاعیرو لەزارو شێوازو وێنەو دەربڕینی شیعریدا رەنگ دەداتەوە. هەر ئەوەشە کە دەگوترێ لە چەمکی شێواز یەکێتی وشەو وێنە، وێنەو بنیات، بنیات‌و بیر یەك دەگرێتەوە. وەکو چۆن کاریگەری دۆخی کۆمەڵایەتی‌و واقیع، لە شێوازدا رەنگ دەداتەوەو مۆرکێکی کەسی وەردەگرێت.[10] ئەم مۆرك‌و سیمای (رەشبینییە) لە زۆر جێگا لە بەرهەمەکانیدا دیارو ئاشکرا دەبێت.

مەڵێن یا شێتە یا مەستی شەرابو نارەق‌و بەنگە خەیاڵاتم
پەرێشانە دڵم تاریکە هەم تەنگە
مەکەن مەنعم لە هەوری بیری من بارانی خوێن بڕژێ
لە سەحرای سینەدا دیسان هەرایە شۆڕشە جەنگە شەهی ئقلیمی
بەدبەختی لە بۆ تەسخیری مولکی دڵ هجوومی کردووە، تالب بە
تاج‌و تەخت‌و ئەو ڕەنگە ئەمیری لەشکری زوڵمە لە دەوری فەوجی
بێ روحمی جەفاوو جەورو میحنەت، یاوەرو سەرتیپ‌و سەرهەنگە

دیوان:٣٢

یاخود کە دەڵێ/

مودەتێکە نەفسی بەد حوکمی خراوم لێ دەکا
هەر بە قەهرو کینە دەروانێت‌و چاوم لێ دەکا
جار بەجار دەگری دەناڵێ هەروەکو هەوری بەهار
گەه بە خەندەو پێکەنین دێت‌و سڵاوم لێ دەکا
یەك سەعات‌و یەك دەقیقە دەس لەمن هەڵناگرێ
روو لەهەر لایێ دەکەم هەر قاوە قاوم پێ دەکا
هەرچی تەفرەی لێ دەدەم وەعدەو وەعیدی پێ ئەدەم ناسرەوێ
تەکلیفی قۆڕو بن دراوم لێ دەکا

دیوان:٣٣

---

(10) شێواز لە کورتە چیرۆکی کوردیدا: ١٣.

یان کە دەڵێ/

شـــاعیر عومـــومی کەوتنـــە مـــەقالاتو بۆڵـــەبۆڵ
مـــەتحی وەتـــەن دەکـــەن بـــە قەســـیدەی شـــڕو شـــڕۆل
تـــەعریف دەکـــەن لـــە میللـــەتی کـــوردی بەســـەد زمـــان
پـــاك بوونـــە چاوشـــێکی بـــەبێ دەمبـــەگو دەهـــۆڵ
کـــوردیش چ کـــوردە میللـــەتی خۆخـــۆرە پێکـــەوە
بـــۆ گیـــانو مـــاڵی یـــەکتری سمکـــۆڵ دەکـــەن لـــە خـــۆڵ
دێـــوو درنـــجو ورچو بـــەرازو ڕێـــویو چـــەقەڵ
کوێـــرو کـــەڕو شـــەلو کەچـــەڵو گێـــڕو گـــول

لە شوێنێکی دیکەشدا دەڵێ/

لـــەو ڕۆژەوە کـــە عەهـــدی زەمـــانی تەجـــەدودە
لـــەو وەختـــەوە کـــە نێـــوی تەمـــەدون لـــە دەفتـــەرە
بارانی غەم لە هەورو هەڵای میحنەتو ئەلەم باریوە بۆیە
چـــەشمەی چـــاوم موکـــەدەرە
دڵ وا مـــەلولو مـــاتو پەرێـــشانو عـــاجزە
کـــوللی دەقیقـــە مونتەزیـــری مـــەوتی ئەحمـــەرە

دیوان:٦٣

لە هێرشو داشۆرینو هەجوکردنـدا شێوازی مـەلا مـارف ڕەوانو ڕاسـتەوخۆ، لـە وشەو ناوو ناتۆرەو توانجی پڕ بە پێستو موستەحەق دایە، ئەمە لـە شێوازی شیعرە داشـۆرینەکانی شێخ ڕەزای تاڵـەبانی، کـە سـەر تـۆپی شـیعری داشـۆرینە لـە ئـەدەبی کوردی، جیایە. شێخ ڕەزا بێ پەردەو ڕووتو ڕەپو ڕاست ئاتارو پاتاری بـابو دایـكو خزمو عێلو عەشیرەتی ناحەزەکەی دەداتە بەر فەحشو جنێو، مەلا مارف بەتوانجو پلاری داپۆشـراو بـە تـەلمیحو تـەرجیحو کینایـە، وشـەو دەسـتەواژەی مـزر حەواڵـەی بەرامبەرەکەی دەکات، واتە ئەگەرچی سەرکۆنەو پەلامارەکانی توندن، بەڵام خـۆی لـە جنێوی ڕووتو ڕاستەوخۆ لادەدات. لێرەدا هێرشی بـۆ سـەر یـەکێك لـە خـەلیفـەکانی شێخانی بنەماڵەی زەنبیل وا دەست پێدەکات:

لـــە بـــابو فەســـڵی تـــەزویرو ڕیـــا هێنـــد چوســـتو چـــالاکە
هـــەموو کـــەس خـــۆ دەپـــارێزێ لـــە مـــەکرو کەیـــدو تـــەزلیلی

وەکو جەردەی موسەللەح دەچێتە سەر ڕێگەی موسولمانان
بە ئیمان ئیکتیفا ناکا، دەکا نەزعی سەراویلی
هەموو ڕۆژێ لە مەکتەبخانەی تەدریس و تەدلیسی
دەنوسن سەد جەوازی نومرە یەك ڕوتبەی عەزازیلی
بە ڕیش و سورەت و عەمامەوو شەکل و هەیولائی
بەلەحنی نازك و قەولی نەکازیب و ئەباتیلی
فریوی جاهیلی وەحشی دەدا بێچارە نازانێ
مەقام و مەنزلی ئیبلیسە ریش و پێچ و مەندیلی
أیا مَن قُلتَ أنَّ الشعرَ عِصْیانٌ ونُقْصانُ
لكُمْ احساناتكمْ یالائمي، نقْصي وذُنبي لي

دیوان:٧٢

ڕازاندنەوەی شیعر واتە (تلمیع)، جگە لەوەی هونەرێکی شیعرییە، بەڵام بەشێك لە زمان و تەبع و شێوازی شیعریش لای شاعیران پێك دەهێنێ و دەچێتە خانەی بەکارهێنانی وشەو زاراوەو دەستەواژەی زمانی بێگانەوە لەبەرهەمی شیعریدا. مەلا مارف لەزۆر شوێندا پەنای بۆ زمانی عەرەبی و فارسی و تورکیش بردووە، نیوە دێرو دێرە هۆنراوەی تەواوی بەو زمانانە تێهەڵکێشی شیعرەکانی کردووە، دەکرێ ئەو شایەدیەش بدەین کە زۆر وەستایانە ئەو کارەی ئەنجام داوە بێ ئەوەی هەست بە پچڕان و دابڕان بکەین لە سیاقی بیرو شێوازو داڕشتنی بەرهەمەکانیدا:

ـ نە من تەنها پەرێشانم، هەموو کەس مات و غەمگینە
ئەوی مەسرورو دڵشادە، فەقەت حەسادو گەوادە
تراهمْ مُنذ ذاكَ الیَومِ یُوحي بَعْضُهمْ بَعضاً
سمێل بابڕ بە کەیفی خۆت سمێڵی خۆتی لێ بادە

دیوان:٤٢

ـ ئەی سەییدی جوان و نەوجەوان بەخت و موحتەرەم
یا ناقِصَ ألعطیةِ وَیا قاصِرَ الهِمَمْ

دیوان:٥٢

ازگلشن وجود تو از باد انقلاب
بر روی چون گلت ننشیند غبار غم
حاجی مەلا محمد سۆفیش بەرپیشەوە
خەندێکی بۆ بکات و بڵێت ئەی وەلی نیعەم

دیوان:٥٥

ــ ئـــەی حەســـەن ئـــەی ســـاحەبی وەجهـــی حەســـەن
مەزهـــــەری فەرمايـــــشی جـــــەددول حەســـــەن
يـــــانی فەرمويـــــە ئەگـــــەر خێرتـــــان دەوێ
أطلبـــــوهُ مِـــــن ذوي الوَجْـــــــهِ الحَـــــسَــــنِ
چـــــەندە پـــــێم خۆشـــــە ببيـــــنم دوژمنـــــت
پـــــێ لەســـــەر كورســـــیو لەگەردنـــــدا رەســـــەن
جـــار بـــەجار، بـــانگی بـــە تـــوركی كـــەم، بڵـــێم
كـــەيفن ئـــەحواڵن ئـــەفەندم، نەيـــنی ســـەن

ديوان:٥٦

ــ قەريبـــەن شەســـتو دوو ســـاڵە ئـــەوا دەڕوا لـــە عـــومرو ســـين
نەديتوومـــە، نەبيـــستوومە، بـــەجوز يـــەك قـــازی شـــێخ موحـــسين
لـــــهُ فِي كُـــــلِّ يَـــــومٍ قائـــــلٌ بالبـــــاب يَـــــدعُوهُ
يُناديـــــهِ بيـــــامَنْ لايَـــــزالُ مُحْـــــسِناً أحْـــــسِن
كـــسی خواهـــد وجـــاهترا ميـــان مـــردم و ملـــت
وَيَبقَـــی اسْـمَهُ مِـــنْ بَـعْدُ بالْأفْـــواهِ والْأَلْـــسِنِ

ديوان:٥٩

ــ گەرچـــی دەوڵەتمەنـــدو ســـاحێب پـــووڵو پـــارەو ســـەروەتی
مـــاليكی گـــامێشو مـــێشو گـــوێ درێـــژو گـــوێ لـــەقی
هـــەر لـــە وشـــتر تـــا دەگاتـــە كـــاورو گيـــسكو فـــڕوج
دێتـــە بـــەر دەســـتت هـــەموو ڕۆژێ بـــە موفتـــەو بـــێ حـــەقی
تأكـــلُ مـــا تـــشتهيهِ تلـــبَسُ مِمـــا تـــشاء
مِـــنْ حَريـــرِ نـــاعِمِ أو سُـــندسِ وأسْـــتبْرَقِ
خزمـــەتی ئەشخاصـــی شـــاعير لازمـــە عـــەقلت هـــەبێ
اتّـــهُم كالـسَّـــمِ قَتّـــالٌ لِمَـــرءِ لا يَتّقـــی

ديوان: ٨٠.

ئـــەلا ئـــەی هودهـــودی بـــاغی ســـەبا فـــەورەن بـــە تـــەعجيلی
تعـــالَ اذهَـــبْ بِمَكْتـــوبي الى مَـــولاي رَتبيلـــي
إذا أدْرِكْتِـــهُ فـــاخفِضْ جَنـــاحَ الـــذلِ تعظيمـــا
وَبَـعْدَ الوَصْلِ وَالتـقْبيلِ بَـلّغهُ أقـاويلي

ديوان:٨٢

لەباسی بەکارهێنانی وشەو زاراوەی بیانیو تەرکیباتی تازە لای مەلا مارف ئاماژە بۆ چەند لایەنێك دەکەین:

**١. وشەو زاراوەی عەرەبیو فارسیو تورکی**

شاعیر بەگوێرەی پێویستو تا چەند بۆی لوا بێت لە شێوازی داڕشتنو دەربڕینی ئامانجەکانی لە پەنابردنە بەر وشەو زاراوەی بێگانە نەپرینگاوەتەوە، زۆریش لەو وشەو زاراوانە تایبەت بەخۆیەتی واتا شێوازی بەکارهێنانێکی کەسییان وەرگرتووە. هەندێکیش لەو وشەو زاراوانە دووبارەکردنەوەن، واتە لە پێش ئەوداو لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بەهەمان واتاو تانوپۆ بەکار هاتوون. لێرەدا ئامارێك دەخەینە بەر دەست کە ڕێژەی سەدی بەکارهێنانی ئەم وشەو زاراوە بیانیانە بەدیار دەخات.

لە ئامارەکەدا (١٠٠) دێرە شیعرمان لەسەرەتاو ناوەڕاستو کۆتایی دیوانی شاعیر وەرگرتووەو ئامارێکی وشە کوردیو عەرەبیو فارسییەکانمان نیشانداوە.

**سەرجەمی ئاماری وشەکان لە ١٠٠ دێرە هۆنراوەدا:**

| کوردی | عەرەبی | فارسی | تورکی | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|
| ٥٦٥ | ٣٣٦ | ٧٥ | ٧ | ٩٨٣=* |

**ڕێژەی سەدی بەکارهێنانی وشەکان:**

| کوردی | عەرەبی | فارسی | تورکی |
|---|---|---|---|
| ٥٧,٥ | ٣٤,٢ | ٧,٦ | ٠,٧ |

لەگەڵ ئەوەی ئەم ئامارە ڕێژەیەکی تەقریبیمان نیشان دەدات، بەڵام زۆر لە ڕاستییەوە دوور نییەو ئەوەش دەسەلمێنێت کە نزیکەی نیوەی فەرهەنگی وشەو زاراوە شیعرییەکانی شاعیر بریتین لە عەرەبیو فارسی، بەتایبەت وشەی عەرەبی کە ڕێژەیەکی بەرچاوی هەیە. پاساوی ئەمەش بەوە دەدرێتەوە، کە شاعیر مەلا بووە، پاشخانێکی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی عەرەبییو فارسیی تێکەڵی هەبووە، هەروەها دەسەڵاتو شارەزایی لەو زمانانەدا وای لێ کردووە پەنا بۆ فەرهەنگی وشەو زاراوەکانی ئەو زمانانە بباتو لە شێوازو دەربڕینو داڕشتنی هۆنراوەکانیدا بیانگونجێنێ. هەروەها لە فەرهەنگی زمانو زمانی قسەکردنو نووسیندا ئەم وشانە زۆرجار بە بێگانە دانانرێنو وەکو بەشێك لە وشەی زمانی کوردی سەیر دەکرێن.

---

* ئەم ئامارە ئامرازەکانی وەکو (لە، بە، بۆ، ۆ، بێ....)ناگرێتەوە..

## ٢. تەرکیباتو وشەڕۆنان

ئەمەشیان هەر دەچێتە خانەی شێوازناسیی وشەو رادەی پەیوەنداری شاعیر بەجۆرێك لەو وشەو زاراوەو تەرکیباتانە کە بەزۆری لە بەرهەمەکانیدا دووبارە بوونەتەوە، یا ئەو وشە لێکدراوانەی کە شاعیر خۆی دەستی هەیە لە رۆنانو سازکردنیان لە زمانو شێوازە شیعرییەکەیدا.(11)

چاوپیاخشاندنێکی وردی دیوانی مەلا مارف چەند لایەنێك لە شێوازو زمانی شیعری شاعیر لە ئاستی وشەسازیو وشەرۆناندا بەدیار دەکەوێت کە وەکو دیاردەیەك لە گفتو لفتیدا بۆتە باوو دووبارەو چەند بارە بۆتەوە، لەوانە:

دووبارە بوونەوەی (هاوواتا)و (هاوواتا ئاسا)و (جووتە وشەی لێکدراو):

هاو واتا ئەو جووتە وشەیەن کە واتاکەیان وەکو یەك بێت.(12) هاو واتا ئاساش ئەو وشانەن کە واتاکانیان لە یەکتر نزیك بنو بەزەحمەت لەیەکتر جیابکرێنەوە، واتا لەیەك کێلگەو چوارچێوەی واتاییدا کۆببنەوە.(13) ئەم دیاردەیە وەکو سیمایەك لە شێوازی شاعیردا زۆر بە روونی هەستی پێ دەکرێت وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

گوڵستانو گوڵو گوڵزارو گوڵشەن
نەی‌و شمشادو سەروی جوێباری

نەواوو نالەوو گریانی قومری
فوغانی بلبلی سەر شاخ ساری

بەهەر نەزمو بەهەر وێنەو عیبارەت
هەموو ئیقرار ئەکەن پەروەردگاری

دیوان: ٥.

ـــ کەمتر لە هەموو سائیلو دەروێشو گەدایە
لەو عەرشە موعەلایە هەم خوسرەوو قەیسەر

ـــ عادەتی ئەشخاسی شاعیر مەسلەکی شەخسی ئەدیب
یا درۆیە یا ریایە یانە مەکرە یا فەریب

---

(11) کلیات سبکشناسی: ٢١٧.

(12) زمانەوانی: ١٦٤.

(13) زمانناسیو هەندێ بابەتی زمانناسی کوردی: ٣٥.

ـــ ئەووەلـــەن (زرنـــی) حەدیـــسی شـــاهبازی کیبریـــا
بـــاوەڕت بـــێ ســـانیەن تەقیـــەو ئـــەدەب شـــەرمو حـــەیا

ـــ رابیعـــەن بەدبـــەختیی‌و بـــەدوەزعیی‌و رۆژی ســـــیا
بـــۆ شـــەرەفیابی حـــوزوورو خزمـــەتی تـــۆ عـــاجزە

ـــ گـــەر مووەففـــەق بم بـــە تـــەوفیقات‌و لـــوتفی ئێـــزەدی
تـــا موتـــەووەق بم بـــە تـــەوقی فـــەهم‌و عـــەقل‌و بـــوخرەدی

ـــ بـە عـەترو تـام‌و بـۆن‌و رەنگـی لـەعل‌و سورەت‌و تـەرکیب
قەشـــەنگ‌و دڵڕوبـــاو دوڵبـــەرو مەخـــسوس‌و مومتـــازی

- ســـۆفی وەرە هـــەنگامی گـــوڵ‌و فەســـڵی بـــەهارە
وەختـــی تـــەرەب‌و عـــەیش‌و دەمـــی گەشـــت‌و گـــوزارە
پیـــشەو عەمـــەلت حیلەیـــە تـــەزویرو ریایـــە
تـــۆ بەشـــقی خـــودا پـــێم بڵـــێ ئـــەم کـــارە چ کـــارە

ـــ ئـــەم جـــەهل‌و نیفـــاق‌و حەســـەدو بـــوغزە هـــەتا کـــەی
دەخولێنـــەوە تاکـــەی وەکـــو دێوانـــەو مەســـتان

ـــ خـــارو خەســـی زیللـــەت لـــە رەگ‌و ریـــشە دەرێـــنن
بیکـــەن بـــە گـــوڵ‌و گوڵـــشەن‌و گـــوڵزارو گوڵـــستان

ـــ ئـــەمیری لەشـــکری زوڵمـــی لـــە دەوری فـــەوجی بـــێ روحمـــی
جـــەفاوو جـــەورو میحنـــەت، یـــاوەرو ســـەرتیپ‌و ســـەرهەنگە
ـــ مـــوحیتی دایـــرەی دوکـــان‌و بـــازاڕی بـــە ئاســـانی
بـــە ســـەتح‌و ســـەقف‌و ســـەربانی خـــولی پێـــدا قـــولی بـــادا
لـــە مەســـکوکاتی ئێرانـــی، لـــە لـــیرەی سـککەی عوسمـــانی
لـــە ئێغـــدان‌و مـــەجری‌و مەحفـــەزەو ســـندوقی پـــۆڵادا
چ رۆژێکـــە لەلایـــەك گرمـــەگرمی هـــەورو ناڵـــەی بـــا
لـــە لایـــەك شـــیوەن‌و گریـــان‌و قوڕپێـــوان‌و فـــەریادە

- بەسـەرماندا دەڕێـژن گێژەلووکـەی نەگبـەتو میحنــەت
غوبــاری ئیفتیقــارو تــۆزی دەردو گــەردی بێــوازی
دوعــای حیفــزی وجــودو عیــزەتو ئیقبــالو تــەوفیقی
لەسـەر تۆ واجبو فـەرزە بـە كوردیو فارسیو تازی
لــە بـابو فەسـلی تـەزویرو ریـا هێنـد چوسـتو چـالاكە
هـەموو كـەس خـۆ دەپارێزێ لـە مـەكرو كەیـدو تـەزلیلی

- كەسـێكی مـونكیری ئـەخلاقو ئەوسـافی كـەریمت بـێ
بە كوللی حازرم بۆ قـەرعو مـەنعو زەجرو تـەنكیلی

- دەنووسـم بـۆ موغـەنیو موتریـبو خۆشـخوانو رەققاسـان
كــە بــەزمێكی موهەیاكــەن شــەبیهی بــەزمی فــەغفووری

- تۆ بە حوسنی فیكرو فیكری بیكرو ئەشعاری حـەسەن
مــن بــە شـیعری نـاڕەوانو سـەهلو سـادەو سـەرسـەری

جـۆرێكی دیكـە لـە جووتـە وشـە هـەن هەمیشە بـەدوای یـەكتری دادێـنو جووتـە وشـەیەكی نـاوی پێـك دەهێـنن (ئەگـەر هـەردوو تـاكو وشـەكە نـاو بـن)، یـا جووتـە وشەیەكی ئاوەڵناوی پێك دەهێنن (بێتو تاكەكان ئاوەڵناو بن)، ئەمانە زیاتر هۆكاری وەسفی پێكەوەیان دەبەستێتەوەو[14] زۆریش لە شیعری مەلا مارف دا بەدی دەكرێت، بەنموونە تـەنها لـە قەسـیدەیەكی شاعیردا كـە بـەناوی (بـاڵی سـەمەنـدەر) ەو[15] بـە روونـیش دیـارە كـە لـە ژێـر كاریگـەری چامە نێودارەكـەی (سـالم)دا (جـانم فیـدایی سروەكەت ئەی بادەكەی سەحەر) هۆنراوەتەوە، ئەم جووتە وشانە بەدی دەكەین:
(پـەیكی هونەرەوەر، میشكی موعەتەر، نەسیمی سەحەر، گوڵاڵـەی ئەحمـەر، شـوعبەیی عەسكەر، سەرهەنگو یاوەر، میحرابو میمبـەر، خانـەیی شەشـدەر، بـاڵی سـەمەندەر، شـەربەتو شـەككەر، حـەزرەتی حەیـدەر، سـەجادەی منـەوەر، فەرەیـدونو سـكەندەر، سینەوو دەفتەر، پـەردەیی ئـەخزەر، خوسرەوو قەیـسەر، موساو رەزا، سائیلو گـەدا،

(14) جووتە وشەی لێكدراو لە زمانی كوردیدا: ١٢٥.
(15) دیوانی مەلامارف: ٧.

عەرشی موعەللا، خوسرەوو قەیسەر، حاتەمو جەعفەر، هادیو رەهبەر) پارچە شیعری (ئامانجو ئارەزوو) هەموو قافیەو پاش قافیەکانی بەم شێوەیە، واتا لە جووتە وشەی لێکدراوو ئاوێتە پێکهاتووە:[16] (سەددی سکەندەر، شێرو ئەژدەر، زەربی خەنجەر، نێشی نەشتەر، یارو دولبەر، رەندو قەلەندەر، یاقوتو گەوهەر، رۆژێ ئەنوەر، تۆپو عەسکەر، شەهدو شەککەر، موحەدەب یا موقەعەر، سینە دەفتەر).

ئەنجا ئەگەر پێدا بچین دیارە ئەوا ئامارێکی زۆرمان لەو بابەتە لا کۆدەبێتەوە، ئەم دیاردەیەش خۆی لە خۆیدا لایەنێکی شێوازی شاعیرمان لە زاراوەو دەستەواژە سازیدا بۆ روون دەکاتەوە. لە لایەکی دیکەوە شاعیر پەنای بۆ کۆمەڵێك تەرکیباتو زاراوە بردووە کە پێشتر لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بەدی ناکرێن، زۆریشیان شاعیر بۆ پێداویستیی قافیە یاخود دەربرینی مەبەستی شیعریی خۆی سازی کردوون، لەخوارەوە نموونەیەك لەو تەرکیباتە دەگمەنو نامەئلوفانە دەخەینە روو:

شەهبازی کبیریا، تەوفیقات، بوخرەدی، نەقشی ئەرژەنگ، ئاوپاشی فەلەك، عەقەب کەوتە، سابوونی سەداقەت، فانۆسی زوڵمانی، موجەستەر، موفرەدی لاموسەننا، سەقیل باشی، تەکلیفی بن دڕاو، خانو خەوانین، سەبابانی قون تڕۆل، زەیغەمی خوێن ئاشام، وەعدەی وشکی بەر کورسی، مورغەکی کونجی، موسینانی عەدیمول سین، لائاسین، نەهەنگی تەبیعەت، تازی، لەکلەکی دەریازی، ئیغراز، تالوتو جالوت، روتبەی عەزازیل، سەرپڕ لەسندان، کابینەی کیرامول کاتبین، ئەلیەق، چەرخی مەنشوور، وەفاتی قەند، گەزیدەی عەقرەب، موحمەرول مەزاکیر،دەرهەم بەرهەم..

ئەم زاراوەو وشە ئاوێتانە بە وێنەیەك لە بەرهەمی شاعیردا دووبارەبوونەتەوە تا بووە بە پێڕەوێكو شاعیر ئولفەتی پێوەگرتوە. بەڕادەیەك لەهەموو بەرهەمەکانیدا (جووتە وشەو زاراوەی ئاوێتە) بۆتە پیشەیەكو سیمایەکی دیاری شێوازی شیعریی مەلا مارف. بەتایبەت هەندێك جووتە وشەو زاراوەی ئاوێتە هەن کە زۆرجاران لە بەرهەمەکانیدا دووبارەو چەندبارە بوونەتەوە.

ئێمە لە بواری شێوازناسیو، هەر تەنیا لە ئاستی وشەسازی، دەشێ ئاماژە بۆ گەلێ لە هونەرەکانی تری شێوازی شیعریی مەلا مارف بکەین. لە وێنەی رەگەز دۆزی، پێچانو کردنەوە، دژیەك، ئیغراقو موبالەغە و گونجانو تێهەڵکێشو تیکرار.....تاد. هەروەها

(16) سەرچاوەی پێشوو: ٢٠.

له ئاستی شێوازناسی رستەو پارستەدا وەکو شێوەکانی رستەی: ئەمری، خەبەری، پارستەی پرسیارو مەرجو وەڵامی مەرجو پاشخراوو....تاد. ئەنجا لەبارەی ئەوەی کە ئاخۆ پێکهاتەی رستەو گوتاری شاعیر درێژو پرشو بڵاون یاخود رستەی کورتو سفتو بەیەکەوە بەستراون دەشێ لەدووتوێ دێرو نیوە دێرەکاندا ئاماژە بۆ گەلێك نموونەی جۆراوجۆر بکەین،[17] بۆ نموونە:

- رستەی مەرجو وەڵامی مەرج/

(١) کەسێ تالب بە نێوو شۆرەتو روشدو شەجاعەت بێ
دەبێ ئامادە بۆ شمشێرو تیرو زەربی خەنجەر بێ

(٢) کەسێ مەیلی خەزێنەی گەنجی ئەسراری نیهانی بێ
دەبێ مەردی تەعامو حەوت خوانی شێرو ئەژدەر بێ

- رستەی مەرجی پاشخراو:

(١) چ باکێکی لە تیرو تەعنو لۆمەی یارو ئەغیارە
کەسێ عاشق بە تاقی قەوسی ئەبرۆی یارو دولبەر بێ

(٢) چ کارێکی بەوەعزو میمبەرو میحرابو مزگەوتە
کەسێکی مورشیدی مەیخانە یا رەندو قەلەندەربێ

- رستەی خەبەریو پرس:

کە من جامی شەرابم پڕ لە ژەهری مارو ئەقرەب بێ
بە من چی، شەربەتی تۆ پڕ لە شیرو شەهدو شەککەر بێ

**ب. شێوەزار:**

پلەکانی دابەش بوونی زمان، لەوانەش زمانی کوردی بەم جۆرەن:

١. دیالێکت، ٢. شێوە – زار ٣. زارۆچکە

کەواتە شێوەزار پلەی دووەم وەردەگرێت، کوردی خواروو کە بە (دیالێکتی کرمانجی خواروو) ناودەبرێت لەلای زمانناسانی کورد لە چوار شێوەزاری (سلێمانی – سۆرانی

---

(17) کلیات سبك شناسی: ٢١٩-٢٢٠.

– سنەیی- موکری) پێکهاتووە.[18] شێوەزاری موکریانی کە ناوچەیەکی جیۆگرافیایی فراوانی داپۆشیوە لە کوردستانی ئێران، لە باشووری گۆلی ورمێوە تا خوارووی سەقزو بانە دادەکشێ، لە رۆژئاواش ناوچەی پشدەری کوردستانی عێراق دەگرێتەبەر. شێوەزاری موکری لەناوخۆیدا بۆ چەند زارۆچکەیەکی ناوچەیی وەکو (گەورکی، مامەشی، مەنگوڕی، پشدەری) دابەش دەبێت. بەلام لەناو شارە گەورەکانداو بەتایبەت لە مهاباد لەگەلْ ئەوەش لە سنووری زارۆچکەی مامەشان دایە، بەلام هەموو زارۆچکەکان تێکەلاو دەبن لەناو واتاو شێوەزارە سەرەکییەکەدا دەتوێنەوە.

شێوەزاری کەسی هەر شاعیرێك لە (وشەو رستەو دەستەواژەکانی)، واتە لە کردەکانی ئاخاوتن لای ئەو کەسەوە (کە شیعرەکانییەتی) دەستنیشان دەکرێت، ئەمەش جگە لە بالاّ دەستی شێوەزاری ئاخاوتنی ناوچەکەی، پێویستە لە رووی زمانەوانی کۆمەلایەتییەوە لێی بکۆلدرێتەوە. واتا پلەی کۆمەلایەتیو چینایەتی شاعیر، تەنانەت باری دەروونیو ئاستی رۆشنبیریش رۆلێکی بەرچاوی دەبێت.

کۆکەیی لە موکریان پێگەیشتووە، لە مهاباد ژیانی بەسەربردووەو مەلا بووە، واتە پاشخانێکی رۆشنبیری ئیسلامیی* هەبووە، دیارە ئەمە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر شێوەزاری شاعیرەوە هەبووە تا ئەو رادەیەی وشەو زاراوەکانی شێوەزارو ئاخاوتنی موکریانی زۆر بە کەمی لە بەرهەمی شاعیردا هاتووەو ئەوەندەش کە هاتوون لەناو شەپۆلی وشەو زاراوە عەرەبیو فارسییەکانیدا گوم بوون. هەندێکیشیان هەر لە ئەسلدا زارو ئاخاوتنی فارسینو پەڕیونەتەوە ناو شێوە ئاخاوتنی موکریانی. هەندێك لەو وشانەی کە تایبەتن بە ناوچەی موکریانو لە شێوەزاری شاعیردا بەدیدەکرێن دەخەینە روو:

رووپەڕە، نوچکەی چیا، هومێدەواری، گڕی ئاوور، ریزە خۆر، سەر عەسکەر، پولومالْ، شەرەفیابی، هێشتێ، بەشقی خودا، ئاوپاشی، لەسان دان، تماشا، کوندە شاخی، تاووساو، بێ تووشە، موردار، کالەکۆن، تەڕو ساز، گلەو ڕاز، نەهارو شام، نیکتەپەردازی، سەرئەفرازی، بێ وازی، فەرتون، درۆی پاش مردن، خواهیش، فامیل، زیندەگی...

---

(18) زاراوەکانی زمانی کوردی، گ/ زانیاری، ژ/ ٤: ٧٥.

* د. مارف خەزنەدار ئەم زاراوەی هێناوەتە ناوەو لە نووسینەکانیدا بەکاری دەهێنێت، کە ئاماژەیە بۆ رۆشنبیرییەکی ئاینی ئیسلامی تێکەلی عەرەبیو کوردیو فارسیو تورکی.

بۆیە زمانو شێوەزاری مەلا مارف بریتییە لە شێوەزارێکی کوردی/ موکریانی تێکەڵ بە وشەو تەعبیراتی زمانەکانی دیکەی وەکو عەرەبیو فارسی، لەگەڵ ئەوەشدا شێوازێکی سادەو دوور لە گرێ لێدراوێو پێچەو دەورەی لە دەربڕینی بیرو مەبەستەکانی پەیڕەو کردووە.

## زمانو شێوازی شیعری سەیفی قازی:

کاتێك ئاوڕ لە زمانو شێوازی شیعریی سەیفی قازی دەدەینەوە، مەسەلەکە زۆر جیاواز دەبێت، بە واتا زمان لێرە بەکارهێنانێکی جیاوازو تایبەت وەردەگرێت کە لە شاعیرانی دیکەی جیا دەکاتەوە. ئەمەش شتێکی ئاساییە چون هەر بەکارهێنانێکی تایبەتی زمان لە دەرفەتێکی زەمانی دیاریکراو لەلایەن شاعیرێکەوە، زمانو شێوازی ئەو شاعیرە پێك دەهێنێ.[19] ئەوە رێگا لەوەش ناگرێت کە کۆمەڵێك شاعیرو هونەرمەند لەیەك سەردەمو قۆناغی مێژووییدا لەیەکچوونێك لە بیرو زمانو شێوازدا لە نێوانیادا هەبێت، لە ئەنجامی کاریگەریی هەمان دۆخی کۆمەڵایەتیو رەنگدانەوەی هەمان واقیع بەڵام شێوازی دەربڕینو رەنگدانەوەکە مۆرکێکی کەسی وەردەگرێت.[20] سەیف بەلاسایی کردنەوە دەستی پێکردووە، بۆیە زمانی شیعری لەسەرەتادا هەمان زمانی قەسیدەو غەزەلی شاعیرانی کلاسیکی کوردییە:

قاسید کە لە دەرهاتو بە تەبلیغی وەفاکرد
حوجرەی منی حەسرەت دیهی سەت چینو خەتاکرد
پێم کوت لە خوتەن دێیەوە یا خوتتەیی تاتار
یانەهلی بەهەشتی کە دڵت پڕ لە سەفا کرد
یان خدری کە هاتی بە دوجام ئاوی بە قاوە
ئەم موردەیی هیجرەت بە تەمای عومری بەقاکرد
یاخود لە تەرەف یارەوە دێی حامیلی نامەی
خاسییەتی ئاهوی خۆتەنو چینی ئەداکرد
خاسییەتی بۆ چاوی منی خەستەو رەنجوور
وەك جامەیی یوسف کە بە یەعقوبی عەتاکرد

دیوانی سەیفولقوزات: ٢٩

---

(19) بنية اللغة الشعرية: ١٥.

(20) شێواز لە کورتە چیرۆکی کوردیدا: ١٣.

سەیف بەو پێیەی کە لە زمانو ئەدەبیاتی فارسیو عەرەبیدا شارەزابووە بۆیە سەرەتا نەیتوانیوە خۆی لە چنگاڵی وشەو تەعبیراتی ئەدەبی ئەو دوو زمانە ببوێرێت، بەڵام لە درێژەی شیعرو بەرهەمەکانی دیوانەکەیدا بەدیار دەکەوێت کە هەمیشە تێکۆشاوە خۆی لە دەست ئەو وشەو زاراوانە دەرباز بکات. (شاعیر زۆر تێکۆشاوە لە دەکارهێنانی واژەی عەرەبی خۆ بپارێزێو زبانێکی کوردی پاكو خاوێن بۆ دەربڕینی هەستو بیری شاعیرانەی خۆی بدۆزێتەوە).[20] ئاکامی ئەو هەوڵانەی شاعیر لە شیعرو غەزەلەکانی دواتری دیوانەکەیدا بەدیار دەکەوێت:

دایـــم دڵـــم بەناڵـــەو زاریو فیغـــان ئـــەڵێ
خـــۆش بـــەو شـــەوەی کـــە رۆژی روخـــی دڵبـــەرم هـــەڵێ
تفڵـــی دڵـــم گـــروی شـــەکەری لێـــوی گرتـــووە
بـــەو دوو هـــەنارە ژێـــری کـــەوە بیخـــە باغـــەڵێ
زولفـــت وەلادە روت بنوێنـــە بـــە دەفعـــەیێ
شـــەو ڕابـــرێ، ســـتارە نـــەمێنێ، قەمـــەر هـــەڵێ
بـەو زولفـە میروەحـەت مەکـە مـەنعم لـە شـەهدی لێـو
تەیرێکـــە دڵ زەعیفـــە، دەترســـێ لـــە داوەڵـــێ
ئـــەو قافیـــەت بەســـانی دڵـــی مـــودەعی حەســـەن
تـــەنگە، درەنگـــە، مـــەیلی بـــە جەنگـــە، هـــەڵێ مـــەڵێ

دیوان:۳۲

زمانی شیعری سەیف کاتێك دەگاتە ئاستی ئەو شیعرو بەرهەمانەی کە بۆ عەزیز ئاغای دۆستی نوسیوون، یا باسی ژیانی دێهاتی کوردەواری دەکات، یاخود ئەو لیریکە دڵدارییانەی کە لەسەر شێوازی شیعری بڕگەیی دایناون (ئەوجار زبانی راستینی خۆی دەس دەکەوێو نیازی بە فارسیو تورکیو عەرەبی نامێنێو ئەو لیباسە گرانو نالەبارەی لە بەر هەڵبەستەکانی دادەڕنێو بە جلو بەرگی جوانو رەنگاو رەنگی کوردی دەیان رازێنێتەوە)،[22] وەك ئەم نموونەیە:

عەنبـــەری زولفـــت بـــەدەم ســـەبادە
لەســـەر مـــانگی رووت هـــەوری مـــوت لادە
تـــا رۆژ وەکـــو شـــێت ڕوو لـــە کێـــوان کـــا

---

(21) دیوانی سیف القضات: ۱۹.

(22) سەرچاوەی پێشوو: ۱۹.

لـــــه عيـــــشقت مـــــردم وەســـــيەت بـــیٚ لـــه تـــــۆ
بـــــۆ خـــــوٚت بم نێـــــــزە تـــــــەلقینم دادە
تـــــا بڵـــــێن زوحـــــاك مـــــار لەســەرشـــــانی
تـــــایەك لـــــــە زولفـــــی چـــــین چـــــینت لادە

دیوان:٣٤

ئەگەر ئەژمارێکی وشەو واژەکانی شاعیر لە رووی شێوازناسییەوە بکەین ئەوا ئەم ئاکامانەمان لا دەست دەکەوێت:

**لە ١٠٠ دێرە شیعردا ئاماری وشەکان بەم شێوەیە بەدیاردەکەوێت:-**

| کۆ | تورکی | فارسی | عەرەبی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| ٨٧٤ | ٤ | ٢٥ | ٨٨ | ٧٥٧ |

**رێژەی سەدی وشەکان:-**

| تورکی | فارسی | عەرەبی | کوردی |
|---|---|---|---|
| ٠,٤٥ | ٢,٨ | ١٠,٠٦ | ٨٦,٦ |

ئەم خشتەیەو رێژەی بەکارهێنانی وشەی کوردی، لەچاو وشە بیانییەکاندا ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێ کە شاعیر خاوەنی زمانێکی پاراو بووەو خۆی لە بەکاربردنی وشەو زاراوەی بێگانە بەرادەیەکی زۆر بە دوورگرتووە.

لە بارەی زمانی شیعریی‌و شێوازەوە راستییەك هەیە دەڵێ (هەر زمان‌و شێوازێك رەنگدانەوەی جیهان بینییەکی جیاوازە)،[23] واتە شێواز رەنگدانەوەی ئەزموون‌و جیهانبینی شاعیرو هونەرمەندە بۆیە مەبەست‌و ناوەرۆکی شیعر رۆڵێکی باڵا دەگێڕێ لە هەڵبژاردن‌و دارشتنی شێوازدا، ئەو ناوەرۆك‌و بابەتگەلەی کە شاعیر لە بەرهەمەکانیدا تەعبیری لێکردوونەتەوە بریتی بوون لە ژیانی دێهاتی‌و کشتوکاڵی‌و پەروەردەکردنی رەزو باغ‌و بێستان‌و ئاژەڵداری لەگەڵ ئەو سۆزو خۆشەویستییەی بۆ نیشتمان‌و بۆ کورد نیشانی داون، تەعبیرکردن لەم ژیان‌و هەست‌و بیرو مەشغولییەتە شاعیری بەرەو راستە شەقامی زمانێکی پاراو، روون، ئاسان‌و سادە بردووە. لەو رۆژگاری بووژانەوە ئەدەبییەش تێڕوانینێکی ئەوتۆ لەئارادا هەبووە کە (زمانی شیعر ئەو ئەندازەیەی سادەو ڕەوان بێت، بەواتا لە زمانی ئاخاوتن‌و ژیانی رۆژانەی خەڵك

(23) زبانشناسی‌و نقد ادبی: ٢٩.

نزیکتر بێت ئەوا بەو ئەندازەیەش کارو تەئسیری بەسەر خوێنەرەوە زیاتر دەبێت، ئەگەرچی بیروڕای پێچەوانەش لە ئارادا هەبووە).[24]

شاعیر چەند بەرهەمێکی لە وێنەی (نامەی شیعری) لە سۆزو خۆشەویستیی عەزیز ئاغای هاوڕێی هۆنیوەتەوە، کە هەم لەسەر کێشی بڕگەییەو هەمیش سیستمی جووت قافیەی تیادا پەیڕەوکردووە، ڕەنگە عەزیز ئاغاش کە کوێخا دێیەکی دەشتەکی بووە بەناوی (کوڵتەپە)و دەشێ خوێندەوارییەکی ئەوتۆشی نەبوو بێ، بۆیە شاعیر لە نامەکانیدا پەیڕەوی شێوازی (سەهلی مومتەنیع)ی کردووەو سۆزو مەبەستەکانی بە ڕوونیو بە ساکاریو بە کوردییەکی ڕەوان بۆ دەربڕیوە:

یـــــادم بـــــۆ ناکـــــەی یـــــادت بـــــەخێربێ
وەعـــــدەی زوو هـــــاتن وەختـــــە زۆردێـــــر بـــــێ
هێنـــــدەم تەماشـــــای ڕێـــــی هاتنـــــت کـــــرد
چـــــاو خێـــــل بـــــوون لەســـــەر ســـــەربانو ســـــەرگرد
ڕێگـــــای کوڵتەپـــــەی دوورو درێـــــژە
هـــــاتنی عـــــەزیزم یـــــەکجار لەمێـــــژە
حەســـــەن لـــــەدووریت نـــــەخۆشو گێـــــژە
تـــــا مـــــابووم نەمـــــدی، هـــــاتی بینێـــــژە
دەردەی بـــــێ دەرمـــــان هـــــەر دەردی تۆیـــــە
بـــــە بـــــایەك دەمـــــرم دەژیـــــم بـــــەو بۆیـــــە

چاوپیاخشاندنێکی بەرهەمی شیعری دیوانی سەیفی قازی چەند ڕاستیەکمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لە بواری ڕاستیی شێوازناسیدا بایەخی خۆی هەیە:

- شاعیر بەڕادەیەکی زۆرو بە هۆشیارییەوە خۆی لە زاراوەسازیو تەرکیباتی ئاوێتەو لێکدراو (لە وێنەی جوتە وشە، هاوواتا، هاوبێژ...) پاراستووە، ئەمە نەك هەر لەبەرهەمە بڕگەییەکانی، بەڵکو لە ئاست بەرهەمە کلاسیکیو عەروزییەکانیشیدا هەر وایە.
- لە شیعرەکانیدا هەمیشە پەنای بۆ لکسکێونی سادە (یەك یا دوو یا سێ) بڕگەیی بردووە جا ئەگەر هاتو بۆ (جێناوی جوداو وشەکانی پرسو سەرسوڕمانو خۆزیو

(24) سەرچاوەی پێشوو: ١٠٠.

پاڕانەوەو لێکدان)یش، حسابی وشەی یەك بڕگەیی بکەین، ئەوا رادەو ئامارەی دووبارە بوونەوەی وشەکان لە بەرهەمەکاندا بەگوێرەی ئەم ریزکردنەی خوارەوەیە:
دووبڕگەیی ← یەك بڕگەیی ← سێ بڕگەیی ← چوار بڕگەیی لە زۆرەوە بۆ کەم دەگۆڕێت. لە پێشەوەش ئاماژە بۆ ئەوەکرا وەك لە ئامارە سەدییەکاندا بەدیارکەوت، کە فەرهەنگی وشەو بێژەکانی شاعیر رادەی زۆرترینی کوردیو پەتیو خۆماڵین. لێرەدا پارچە غەزەلێکی شاعیر دێنینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی شێوازناسی بۆ دەکەین کە ئاستی زمانەوانی بەتایبەتی (وشەسازی) بە روونی تیادا بەدیار دەکەوێت:

### بۆ خۆت بم نێژە

عەنبەری زولفت بەدەم سەبادە
لەسەر مانگی رووت هەوری موت لادە
تا رۆژ وەکو شێت روو لە کێوان کا
تۆزی غوسسەو غەم هەستە بە بادە
لە عیشقت مردم وەسیەت بێ لە تۆ
بۆ خۆت بم نێژە تەلقینم دادە
تا بڵێن زوحاك مار لەسەر شانی
تایەك لە زوڵفی چین چینت بادە
بە جامی دیدەی جەمشیدی جەمە
بە تەختی سینەی وەك کەیقوبادە
گوتم کوشتومت بە غەمزە فەرموی:
شێوەی شیرینە رەسمی فەرهادە
لە دووری باڵات شەو هەتا سەحەر
کارم گریانە، پیشەم فەریادە
تاکو پامال بێ خوێنی مەزلومان
پەنجەی شمشاڵت رەنگو خەنادە
بە هومێدی وەم بێیە سەر قەبرم
بۆیە وا حەسەن بە مردن شادە

بۆ لێکۆڵینەوەی لایەنی شێواز لەم پارچەیەی شاعیر، پێویستە

بەم شێوەیە پەیڕەوی لە هەنگاوەکانی لێکۆڵینەوەی شێوازناسی دەق بکەین:[25]

١. **لەسەر ئاستی زمان:** ئاستی زمان بۆ سەر سێ ئاستی بچوکتر دابەش دەبێت:

أ. **ئاستی دەنگ (دەنگسازی):** ئەمەیان زیاتر پەیوەندیی بە لایەنی موسیقاو ئاهەنگی شیعرەوە هەیەو لە شوێنی خۆیدا باسی لێوە دەکەین.

ب. **ئاستی وشە (وشەسازی):** لەگەڵ ئەوەی پارچەکە لەسەر کێشی بڕگەیی هۆنراوەتەوە بەڵام روخساری لاسایی کردنەوەی قاڵبی غەزەلی کلاسیکی پێوە دیارەو شاعیر پەنای بۆ کۆمەڵێ لە وشە زاراوەی بێگانەش بردووە.

ـ پارچەکە سەرجەمی لە (٨٤) وشەو (١٦) جێناوی لکاوو (١٩) ئامرازی عەتفو (١٦)ئامرازی ئیزافەو (٥) دانە کاری بێ هێز پێکدێت.

ـ لە سەرجەمی وشەکان (٣٦) دانەی یەك بڕگەیی‌و (٤٦) دانەی دوو بڕگەیی‌و تەنها (٢) دانەی چوار بڕگەییین.

ـ لە سەرجەمی وشەکانی پارچەکە (١١) وشەی عەرەبی‌و (٦)وشەی فارسی بەکارهاتوون.

هەر لەلایەنی وشەسازییەوە دەکرێ ئاماژە بۆ چەند لایەنێکی رەوانبێژی غەزەلەکە بکەین، لەنێوان:

ـ عەنبەری زولفت / لەسەر مانگی روت/ هەوری موت

ـ بە جامی دیدەی/ بە تەختی سینەی

ـ شێوەی شیرینە/ رەسمی فەرهادە

کارم گریانە/ پیشەم فەریادە

چەند لایەنێکی جوانکاری گوتنی تێدایە کە لەجۆری (سەجعی هاوتەریبە).

ـ لە (زولفی چین چینت) رەگەز دۆزی تەواو هەیە.

ـ لە چەند شوێنێکدا تەلمیح (تەلمیح ـتیلنیشان) بەدی دەکرێت:-

★ تا رۆژ وەکو شێت روو لە کێوان کا ←―― ئاماژەیە بۆ بەیتێکی نالی

★ تا بڵێن زوحاك مار لەسەر شانی ←―― ئاماژەیە بۆ داستانی زوحاك‌و کاوەی ئاسنگەر

---

(25) کلیات سبك شناسی: ٢١٦ -٢١٧.

★ بەجامی دیدەی جەمشیدی جەمە ⟵ ئاماژەیە بۆ ئاوێنەی جیهان نومای جەمشید

★ شێوەی شیرینە رەسمی فەرهادە ⟵ ئاماژەیە بۆ داستانی شیرینو فەرهاد

- لە دەستەواژەی (لە عیشقت مردم) زێدەڕۆیی هەیە.

- لە دێری پێش کۆتاییدا:

تـــــاکو پامـــــاڵ بـــــێ خـــــوێنی مـــــەزلومان
پەنجـــــەی شمـــــشاڵت رەنـــــگو خـــــەنادە

وێنەیەکی شیعریی جوانو ناسکو دلگیر هەیە، شاعیر رووی قسەی لە یارەکەیەتیو پێی دەڵێ:

بۆ ئەوەی خوێنی بەناحەق رژاوی منو خەڵکی زۆرلێکراوی دیکەش، بفەوتێو شوێن بزر بێت، (پایەماڵ بێت) واتە بخرێتە ژێر پێ، ئەوا تۆ بۆ شاردنەوەی ئەو خوێن ڕشتنانە، پەنجەی شوشو باریکت لە رەنگو خەنە بگرە، تا خەڵك لێیان بشێوێو وانەزانن کە دەستو پەنجەت بەخوێنی رژاوی ئێمەمانانەوە سوورە.

- لە پارچەکەدا پەی بە هیچ وشەیەکی ناسازگارو نامۆ، یا هەر جۆرە زاراوەسازیو وشە داتاشرانێك نابردرێت.

**ج. ئاستی رستەو رێزمان:**

شاعیر پەنای بۆ رستەی کورتو سادە بردووە هەندێ جار لە یەك نیوە دێردا رستەکە تەواو دەبێت:

- عەنبەری زولفت بەدەم سەبادە.

- بەجامی دیدەی جەمشیدی جەمە.

- لە عیشقت مردم.

هەندێ رستە نیوە دێری دووەمیش دەگرێتە خۆی:

- لە دووری باڵات شەو هەتا سەحەر ، کارم گریانە، پیشەم فەریادە.

هیچ رستەیەك بۆ تەواو بوونی واتاکەی لە دێرێکەوە نەپەڕیوەتەوە بۆ دێرێکی تر، واتا یەکێتی واتایی بەیت لە غەزەلەکەدا پارێزراوە.

**شێوەزار:**

موکریانی وەکو شێوەزارێکی ناوچەیی دیالێکتی کرمانجی خواروو، تارادەیەکی زۆر خاوێنو پاراوو پەتییە، واتە لە تەئسیراتی زمانەکانی عەرەبیو فارسیو تورکی بە

دوور بووە، رەنگە ئەوەش بۆ سروشتو هەڵکەوتی جیۆگرافیایی ناوچەکە بگەڕێتەوە، بەو هۆیەی لە مەرکەزی تەئسیرو دەسەڵاتی هەر سێ قەوارەی ناوچەکە:

١. دەوڵەتی عەرەبیی ئیسلامی لە بەغدا.

٢. دەوڵەتی سەفەوی لە ئیسفەهانو تاران .

٣. دەوڵەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ.

دوورو لاتەریك هەڵکەوتووە، بۆیە ئەو شێوەزارە وشەی بێگانەی زۆر کەم پەڕیوەتەوە ناو. ژیانی شارنشینیو شارستانیش هەمیشە وشەو زاراوەی نوێو تازە بابەت دێنێتە بەرهەم، بەگوێرەی پێویستو وەکو وەڵام دانەوەیەك بۆ ئەو جۆرە ژیانە. ناوچە دێهاتییەکان دیسانەوە تاڕادەیەك لەم جۆرە کاریگەرییە بەدوور دەبن، بۆیە لە کۆمەڵگای کشتوکاڵیدا زاری ئاخاوتنی شارو دێهاتیش جیاوازی دەبێت.

بەگوێرەی بیروڕای شارەزایانی ناوچەکە شێوە ئاخاوتنی دێهاتو ناوچەکانی نێوان سێ گۆشەی (سەردەشت – بۆکان – میاندواو) کە (ناوچەکانی لاجانو چۆمی مەجید خانو شارویرانو دێهاتی دەوروبەری میاندواو دەگرێتەوە) لە هەموو بەشەکانی دیکەی خاکی موکریان رەوانو پاراوترە. لە پێشەکی دیوانی سەیف دا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە شاعیر ژیانی لە لادێدا بەسەر بردووەو خەریکی کشتوکاڵو ئاژەڵداری بووەو گوندەکەی، (گوێگجەلی – کە لە دەوروبەری میاندواو هەڵکەوتووە)، (بە باغو مەزراو مێشەو چنارستانو بەندو ئاشو خانووبەرەی خۆشو دلگیر رازاندبۆوەو بەهەشتێکی شاعیرانەی بۆ خۆی پێکهێنا بوو. هەروەها هەڵبەستەکانی کە بە زبانی دێهاتی ناوچەی محالی مەجیدخان بۆ عەزیز ئاغا نووسیون، ئەوجار زبانی راستی خۆی دەس دەکەوێ، واتە زبانی کرمانجەتی یا دێهاتی، ئەویش ئەو زبانە شیرینو ناسکەی کە لە ناوچەی بۆکانو دەروبەری میاندواو پەرەی گرتوە).[26]

لەسەرجەمی (٢٧) پارچە شیعری کورتو درێژی دیوانەکەیدا، کە بریتییە لە (٥٧٢) دێر، سەیف لە سێیەکی شیعرەکانی (کە لە سێ پارچەی درێژی ١٩٦ دێری پێکهاتووە)، پەیڕەوی لەو شێوەزارە کرمانجییە سادەو رەوانو پەتییە کردووە. لە شوێنەکانی دیکەش کە بە ئاراستەی پەیڕەوی لە تانوپۆی شیعری عەرووزو کلاسیکی رۆیشتووە، زۆر لەم زمانو شێوەزارە دوور نەکەوتۆتەوە. بۆیە دەکرێ ئەمە وەکو خاسیەتو ئەدگاری شێوازو شێوەزاری بەرهەمی شیعری سەیفی قازی حسابی بۆ بکرێت.

---

(26) دیوانی سیف القضات: ١٥، ١٩.

**زمانی شیعریی شەوقی:-**

تازەکردنەوەی زمان وەك بنەمایەك لە سیماکانی نوێگەری لە شیعری کوردیدا بەند بووە بە پەرەگرتنی بزووتنەوەی رۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، کە ئەویش بەلاساییکردنەوەی ئەدەبی تورکی – عوسمانی لە سالانی ٢٠- ٣٠ی سەدەی بیستەمەوە دەستی پێکردووە. دکتۆر خەزنەدار سەبارەت بە مەسەلەکانی فەرهەنگو زمانی شیعری شەوقی بیروراکانی بەم شێوەیە چڕکردۆتەوە: (شیعری (شەوقی) رەنگدانەوەی فەرهەنگی زمانی شیعری ناوچەی موکریانو بزووتنەوەی شیعری نوێی عوسمانی بوو،...هەندێ لە شیعری مستەفا شەوقی وەك لاسایی شیعری عوسمانی دەکەونە بەرچاو، ئەوەی شاعیرانی ماوەی هەردوو جەنگی گێتی سەدەی بیستەم لە کوردستانی باشوور، نوری شێخ سالحو عەبدوللا گۆران ناویان نابوو "شیعری لاسایی عوسمانی").[27]

ئەگەر سەرەتا قسە لە شێوازو زمانە شیعرییە گشتییەکەی شاعیر بکەینو مەسەلەی شێوەزارە موکرییە روونو ئاشکراکەی بخەینە دواوە، ئەوا بەو گوێرەیەی کە لە رەخنەی شیعری کوردی لای ئێمە باوەو باسی لێکراوە، شەوقیش لە ریزی ئەو شاعیرانەیە کە پەیرەوی لەو زمانە شیعرییە تازەیە کردووە، کە بە (زمانی کوردی عوسمانی) ناسراوەو لە ژێر کاریگەریو تەئسیری رۆمانتیکە تورکەکان دابووە،[28] پڕیش بووە لە وشەو زاراوەی تورکیو عەرەبیو فارسی، کە زمانی باوی شیعری تورکی عوسمانی خۆی بووە. بە نموونە یەکێکی وەك عەبدولحەق حامید کە یەکێك لە پێشەنگەکانی ئەدەبی رۆمانتیکی تورکە، کاریگەری بەرچاوی بەسەر شیعرو بەرهەمی شەوقیدا هەبووە، وەك ئەوەی بەسەر شاعیرانی تازەکەرەوەی وەکو شێخ نوریو گۆرانی دا هەبووە.[29]

---

(27) مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٥: ١٥٥.

(28) ئەدەبیاتی نوێی کوردی: ٤٤.

(29) بڕوانە:

- توفیق فیکرەتو شاعیرە نوێخوازەکانی کورد: ١٣ -٦٦.

لە راستیدا لەگەڵ جیاوازی زمانیش، هەندێ لەسەردێرو ناونیشانەکانی شیعری شەوقی، وەکو (جەوانان، حەسبوحاڵ دەگەڵ وەتەن، تەرانەیی وەتەن،...) بێجگە لە وشەو زاراوەکانی تێکستەکان ئەوا لە بەرهەمی (عبدالحق حامید)دا ئەم شاعیرەدا دەدۆزرێتەوە، رەنگبێ تۆژینەوەی ورد گەلێ لایەنی دیکەی ئەم لێکچوونانە بەدیار بخات.

له راستیدا لەگەڵ جیاوازیی زمانو شێوازی داڕشتندا، دەتواندرێ ڕێژەیەکی زۆر لە کەرەستەو موفرەداتی شیعری ئەو ڕێبازگەیە (مەبەست ڕۆمانتیکەیەتی تورکیە) لەوانەش فەرهەنگی زمانو موفرەداتی شیعری عبدالحق حامید، لەدوو توێی شیعرەکانی شەوقیدا بناسرێنەوە یا بەسەر بکرێنەوە. هەر بۆ نموونە سەردێری بەرهەمەکانی لە وێنەی: (جەوانان، حەسبو حاڵ دەگەل وەتەن، تەرانەیی وەتەن...) لەژێر کاریگەری بەرهەمەکانی ئەو شاعیرەدا داڕێژراون. جگە لەوەش ڕۆمانتیك وەکو ڕێبازێکی فیکریو فەلسەفی خاوەنی کۆمەڵێك چەمكو جیهانبینیەکی تایبەتی ئەدەبییە، کە لە زمانو شێوازو تەعبیراتی پەیڕەوکارانی ئەو قوتابخانەیە ڕەنگی داوەتەوە، وەك ئەوەی باری خەمو مەینەتیو حەسرەت هەمیشە دەروونو ناخی شاعیری داگیرکردووەو، سروشتی وڵاتو بەهاری ڕازاوە بە گوڵو لاڵەی ڕەنگین هەمیشە پەردەیەکی لە خەمو ماتەمی پۆشیوە. شاعیر هەمیشە لە حەسرەت یارو دڵداری جەفاکاردا ڕەنج دەکێشیو بەدەست بەدبەختیو نەهامەتییەکانی ژیانەوە دەتلێتەوە. هەر بۆیە ڕوخساری شیعرو بەرهەمەکانی شاعیر ئەم شێوازو بەرگە ڕۆمانتیکیە سۆزاوییەی پۆشیوە.

ــ خەملیوە لەسەر قەبری جەوانان گوڵو لالە
یا سووریی خوێنە کە بڵێی ڕەنگەکی ئاڵە
پێش تابشی خورشیدی فەلەك وەقتی بەهاران
وەك چاو لە فرمێسکی منە، قەترەیی ژاڵە
ئەی بادی سەبا هەستە گوزەرکە بەوەتەندا
پەخشان بکە سەر ئەرزی وەتەن بۆنی گوڵاڵە

ب. ش: ٢٠.*

ــ بۆ چ دەناڵێنی، لەسەر لێوت لە بۆ چ بار کەوتووە
لەشکری زوڵفت کە خاوو کاڵە بۆ چ ڕووی گرتووە
ئاهی تۆ وەك بای سمووم، هاتو قەڵبی دادڕیم
ئەی فەلەك گرپەت کە ئەوجارە بۆ وات کردووە
چەندە مەحبووبە لەسەر ئەندامی سەروت جلکی ڕەش تۆ بە
فرمێسکی خوێن ئەو ڕەنگە رووت بۆ شوشتوە

ب.ش: ٢١.

---

* بەشێك لە بەرهەمەکانی دکتور مستەفا شەوقی قازی زادە، ئەحمەدی شەریفی، مهاباد، ١٣٨٤.

ـــ بــەبێ تــۆ عالــەمی دڵ غــەرقی دەریــای یــەئس‌و حیرمانــە
تەماشــاکە شــەپۆڵ ئــەورۆ چــلۆن ســـەر ڕێــزی چــاوانە
عەجــەب تۆفــان دەرە حیــسی شــەبابم هەڵدەچــێ دایــم
لــە قــەلبی پــڕ خــرۆش ئەســرینی چــاوم لــەعلی ڕوممانــە

دە ئافــاقی ئەمــەل ئــەورۆ ســـەرابە وەســـڵی تـــۆ دوورە
لــە بۆیــە فەلــسەفەی ژینــێ لــە بــۆ مــن بۆتــە ئەفــسانە

ب.ش: ٢٧.

هەنــدێك وشــەو زاراوەو تــەعبیراتی شــاعیرانە هــەن کــە لــە شــێوەی ئیدیــەم یــاخود موتیفێکی* ئەدەبی لە بەرهەمەکانی شەوقیدا زۆر دووبارە بوونەتەوە. بـۆ نموونـە بـۆ دەربڕینی هەستی خۆشەویستی بۆ نیشتیمانەکەی (کوردستان)و شارەکەی (ساباڵغ)، ئەم مۆتیڤانە وەکو تایبەتمەندییەکی شێوازو تەعبیر بەدی دەکرێت:

ـــ لەبــەر مــاڵی وەســیعی مــوڵکی بابــت دەنگــی ســەمتووری.
ـــ بــەبێ تــۆ کــەلهوڕو ســۆران‌و مــوکری‌و مــوڵکی بابــان زار.
ـــ ئــەی بــادی ســەبا هەســـتە گوزەرکــە بــە وەتــەن دا
پەخــشان بکــە ســـەر ئــەرزی وەتــەن بــۆنی گوڵاڵــە
ـــ شــەوقی وەرە لــەو غوربەتــە مائیــل بــە وەتــەن بــە
بــێ خــاکی وەتــەن، عیزەتــی تــۆ مــەحزی خەیاڵــە
ـــ لــە حەســرەت دەردی کۆنــە مــوڵکی بابیــان هاتنــە چــاڵاکی
کــە بــڕژێنن لەســەر خــاکی وەتــەن خوێنیــان بەســەر پــاکی
ـــ وەتــەن ئــەی مــوڵکی بــاپیرم، لــە بــۆ چ ئەوڕۆکــە ڕوخــاوی.
ـــ وڵاتو شــاری مــە خۆشــە، بــەڵا حەیفــە کــە وێرانــە.
ـــ بــە نــووری حــوبی مەوتــەن دڵفــرووزەو هاتــە روونــاکی .
ـ کــە ئــاوی جۆگەڵــەی ســابڵاغێ نەشئەی چــاوی مــەخموورت
لــە مێرگۆڵــەی ســەهەندو کێــوی لاجانێ بــەفر بــۆ عالــەمێ بــاری

---

* مۆتیف Motif بابەتێکە لەشێوە تەعبیرێك کە لە بەرهەمی کەسێك یا لە جۆرێکی ئـەدەبی (وەك شیعر بە نموونە) یا لەسەردەمێك زۆر دووبـارە دەبێتـەوە، وەك ئـەوەی (چاوی کاڵ، لێوی ئاڵ) دوو مۆتیفی باون لە شیعرو گۆرانی کوردیدا.
بڕوانە:
سبك شناسی شعر: ٣٤٧.

ـ ئەوێ مولکی قەدیمو مەوتەنی ئەجدادی پێشووتە
بە مەردی مەیروخێنە چۆن حەریمی مولکی بابانە
ـ لە مولکی کوردەکان ئەورۆ تەپو مژ هێندە پەیدابوو.
ـ کە مولکی موکریانو شاری سابلاغ بۆ تۆ خاپوورە.
ـ لە مولکی خۆشەویستی تۆ دەخوینێ کوند سبەینان زوو.
ـ لەنێو کوردان کەسێك مولکی نەبێ، خۆ نۆکەرە بێ شك
لەسەر خەلقی لەبەر مولکە، کە ئەمری ئێوە موجرابوو
ـ کە خاکی پاکی وی لانکە لە بۆ ئێسقانی باپیرمان.

هەروەها لەئاست دواکەوتوویی و ژێر دەستی ولاتەکەی ئەم تەعبیرانەی بەکاربردووە: مالّی خاپوور، وێران، ئەنقازی مالّیان، مەوتەن رووخا بوو، خانە وێران، مالّت چۆلّو خاپوور. سەبارەت بە گەلو میللەتەکەی خۆشی ئەم تەعبیرانە هاتوون: مێری کوردان، قەومی خۆش نیهاد، کوردی فەقیر، قەومی کوردی، دەمی ئەو کوردە کە لالّە، زمانی کوردی، لەنێو کوردان.....هەر بەم شێوەیە کۆمەلّێك مۆتیڤو دارشتنی دیکە لە شیعرەکاندا بەدی دەکرێن، کە لە شێوەی نزیك لە یەکتر دووبارە بوونەتەوە:

ـ مەستی غرور، بەسەودای تۆوە مەستم، مەستو مەسحوور، چونکە مەستی، بەدمەستی مەی بوو.

ـ لە تەئسیری فسوونی، دوو کولّمی پڕ فسوونت، بە ئەفسون بەستی دەستانم، دلّت بەستم بە ئەفسون، بە ئەفسون بەستی قۆلّت، لە تەئسیری فسوونی نەفەسی تۆ.

ـ دایکی سەرشین، دایکی مەحبوب، دایکی پیر، دایکی کوردان.

ـ جەوانان، فیکری جەوانی، قەبری جەوانان، بەختی جەوانیم، جەوانانی وەتەن، شۆڕی جەوانی.

ـ دەسمالّی حەریر، چارشێوی رەشت، چارشێوو دەسمالّی تۆ.

ـ گولّو لالە، گولاّلە، مێر گۆلاّن، مێرگۆلّە، بۆنی گولاّلە.

بەرادەیەکی کەمتریش ئەم مۆتیڤانە بەدی دەکرێن:

ـ نەشئە، شەوقی حەیات، عیلمو مەعریفەت، جەهلو غەفلەت، غوربەت، رۆژی تابان، بولبولی شەیدا، بەندی یەخسیری، ئەمەل، ئومێد، عالەم، زولفی خاو، زولفی کالّ...تاد. شەوقی لە مەیدانی زاراوەسازی شێوازدا بە زۆری پەنای بۆ پێکهاتەی شێوازی دیارخەرو دیارخراو (سفەو مەوسوف) بردووە، کەم دێرە شیعری شاعیر بەدی دەکەین کە یەکێك یا زیاتر لەم پێکهاتانەی تیادا نەبێت، لە وێنەی ئەم

نموونانه:رۆژی تابان، مێری کوردان، بولبولی شەیدا، بای وەعدە، چرای عەزم، چاوی مەخموور، چاوی بێ نوور، قەهری فەلەك، جەوری رەقیب، ستەمی دۆست، ناسیەیی پرشکەن، بەدمەستی مەی، کاکۆڵی رەش ڕەنگ، بای سمووم، فرمێسکی خوێنین، قامەت مامەشی، قەلبی زار، شۆڕی جەوانی، کابووسی جەهل، شەهدی شیرین، جەبین مینای زیو، گەردن هوما، شەدەشل، چاو بەکل، عالەمی دڵ، قەڵبی پڕ خرۆش، زولفی کاڵ، زولفی خاو، تاریکی وجود، ئوفوولی ئەرغەوانی رۆژ، یادگاری قەدیم، فاتە چاو جوان، شەوگاری تەنهایی، نەباتی قەندی لێو، قەڵبی مەجروح، قەڵبی خوێنین، زولفی سیاه، سینەی ساف، زنجیری زولم، دەستی پڕ زۆرت، ماهی تابان، برۆی کەچ، توفلی گریان، چاکی گریبان..... لە هەندێ شوێندا ئەم پێکهاتانە شێوازی سیفەتی وێکچوون (سیفەتی تەشبیهی) وەردەگرن وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:
لەشکری زوڵف، باڵای سەروی بۆستان، زارت حوقەیی بلوور، ددانت دوڕی هەوشاری، خاڵ مشکی تاتاری، جەبین مینای زیو، گەردن هوما، روو سوورە گوڵ، چاوی بادامی، لێوی لەعل، ئافاقی ئەمەل، شەکرە زار، کانی دندان، تیری موژگان، قوبەی سینە، ئاهوی خەتا، چاوی نێرگس، تابووری موژە، تیپی عاشق، کەمەندی زوڵف، تەلیسمی گەنجی حوسنی تۆ....هەندێ لەو زاراوەو پێکهاتانە رەنگە سادەو سواوەو دووبارەکراو بن لە شیعری کوردیداو، بۆ شاعیر هیچ هونەرێکی تازەی لەشێوازی شیعری دا تیادا نەنواندووە وەك لە گوتنەوەی: بولبولی شەیدا، قەهری فەلەك، بای سمووم، بای وەعدە، چاوی مەخموور، کابوسی جەهل، قەلبی مەجروح، زولفی سیاه، زنجیری زولم، ماهی تابان، برۆی کەچ..... وەیا لەو سیفەتە تەشبیهیەکانی وەکو: لەشکری زولف، لێوی لەعل، تیری موژگان، تابووری موژە......
شاعیر لە بواری زاراوەسازی شێوازدا هەندێ وشەو تەعبیراتی جوانو تازەی بەکارهێناوە جا یا لە فۆلکلۆرو ئاخاوتنی خۆماڵی وەریگرتوون وەیا خۆی سازی کردوونو دایهێناون وەك لەم وشەو زاراوانەدا دەبیندرێن: قامەت مامەشی، شەدەشل، چاو بەکل، روو سوورە گوڵ، شەکرەزار، نێو بەندو بەرمووری یار، قەترەیی ژاڵە، کاکۆڵی رەش ڕەنگ، بەختی جوانی، حەریمی عیشق، شۆڕی جەوانی، شۆڕی دڵ، چاوی بادامی، شەپۆڵ سەر رێژی چاوانە، ئەسیری ڕەنگی بێ ڕەنگیم، پیاڵەی چاوی نێرگس، ئوفوولی ئەرغەوانی، گیان سەختی، دایکی سەرشین، حەریمی مولکی بابان، کۆرپەی دڵ، شەوگاری تەنهایی، نەباتی قەندی لێو، قەومی خۆش نیهاد، مەلاحەت، تەپو مژ، کێردی دوشمن، بەندی یەخسیری، گەرمە برین، مەردانەگی، تەوێڵت بۆچی گرژە،

بـازوو بەنـد، باوەشـی تـۆ بێـشکەیە.....ئەڵبەتـە شـەوقی ئـاوڕی لـە هونـەرەکانی ڕەوانبێژی وەکو لێکچواندنو خواستنو خوازەو بەشەکانی دیکە داوەتەوە، بەڵام زیاتر پەیڕەوی لە هونەری میتافۆری ئەوروپایی (واتە لێکچواندنی وێنە) کردووە، بۆیـە لـە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێ دەکەین، لەگەڵ ئەوەی هەندێ لایەنی هونـەری ڕەوانبێـژی پەیوەندی پتەوی بەشێوازناسییەوە هەیە. هەروەها دەتواندرێ لە ئاستی ڕستەسازیدا هەندێ لایەنی شێوازی شیعری شەوقی بە نموونە دەسنیشان بکرێت بەم شێوەیە:[30]

١- ڕستەی ناوی ٢- ڕستەی کاری[*]

١/ ـ لە مێرگولان دەخوێنن بولبولی شەیدا.
ـ بەهار هاتو نەشئەی بای وەعدەیە.
ـ شەوقی وەرە لەو غوربەتە مائیل بە وەتەن بە.
ـ چارشێوو دەسماڵی تۆ، شەرحە لە بۆ تاریکە شەو.
ـ جەبین مینای زیو، گەردن هوما، خاڵ مشکی تاتاری.
ـ وەتەن ئەی مولکی باپیرم.

ڕسـتەی نـاوی بەرێژەیـەکی زۆر لـە بەرهەماکانـدا دووبارەبۆتـەوە، بـە پێـچەوانەوە ڕستەی کاری ڕێژەی زۆر کەمە.

٢/ ـ خەملیوە لەسەر قەبری جەوانان گوڵو لالە.
ـ تەماشاکە شەپۆڵ ئەوڕۆ چلۆن سەر ڕێژی چاوانە.
ـ هبووتی کردووە فیکرو ڕوحم هاتۆتە هێلانە.
ـ تەبەسومکە وەدەرخە موعجیزێ بۆ عالەمی ئەوڕۆ.
ـ دڕابوو دامەنی پاکی، بەهیجران قەڵبی سوتا بوو.

پاشو پێش خستن:

لە زۆر شوێندا شـاعیر پـەنای بـۆ پێشخـستنی کـار، یا تەواوکـەر بـردووە بەمەبەسـتی سازدانی ئاهەنگو، سەلامەتی تەعبیرو پێداویستی زمانی شیعر:

---

(30) تحليل النص الادبي: ٥٨.

(*) مەبەسـت هـاتنی وشـەیەکی (نـاو) یـا (کـار)ە لەسـەرەتای فرێزو ڕسـتەکاندا لەسـەر بنـەمای شێوازناسیو سیمانتیکی، نەوەکو (ڕستەی ناویو ڕستەی کاری)یە بەگوێرەی بنیـاتی ڕیزمـانیو زمانەوانی.

- هەڵستاون، جەوانانی وەتەن دیسان. (پێش خستنی کار)
- لە مێرگوڵان دەخوێنن بولبولی شەیدا. (پێش خستنی کار)
- پەخشان بکە سەر ئەرزی وەتەن بۆی گوڵاڵە. (پێشخستنی کار)
- بە دەستڕە بسترە فرمێسکی شەوقی. (پێش خستنی تەواوکەر)
- من لە عومرم مانگ دەنێو تاریکە شەو، نەم بیستووە. (پاشخستنی کار)
- لە بۆ چاوی بە فرمێسکی جەوانان، سورمەیە خاکی. (پاشخستنی نیهاد)
لە بنەڕەتدا/ خاکی سورمەیە لە بۆ چاوی بە فرمێسکی جەوانان.
- بەبێ تۆ عالەمی دڵ غەرقی دەریای یەئس‌و حیرمانە. (پێش خستنی جێناو)
- چرای فیکرم لەوێ دایم، دەکاتن ئیقتیباسی نوور. (پێشخستنی کار)
- تەماشای هەر قەدی دارێ مەکە، ئەوڕۆ بەگیان سەختی. (پاشخستنی گرێ)
لە بنەڕەتدا/ ئەوڕۆ بە گیان سەختی، تەماشای هەر قەدی دارێ مەکە.
- کەبابە جەرگی من ببیە. (پێشخستنی بەرکار)
- بوتی مەخمووری چاوت، شەقی کرد سەد تاق‌و کاشانە. (پێشخستنی کار)
لە بنەرەتدا/ بوتی مەخمووری چاوت سەد تاق‌و کاشانەی شەق کرد.
- لە مولکی خۆشەویستی تۆ دەخوێنی کوند سبەینان زوو. (پێشخستنی گرێ)
لە بنەرەتدا/ کوند سبەینان زوو لە مولکی خۆشەویستی تۆ دەخوێنێ.
ئەنجا بەگوێرەی دابەشبوونی رستەی زمانی کوردی بۆ رستەی (خەبەری: سادە، جەخت) هەروەها رستەی (ئینشائی: داخوازی، نەرێ، پرس، بانگ کردن، تکا، مەرج، سەرسورمان، ستایش‌و سەرزەنشت)، بەکورتی هەندێ نموونە دەخەینەڕوو:
(رستەی خەبەری سادە )

- ولاتو شاری مەخۆشە، بەڵا حەیفە کە وێرانە
لە بۆ چاوی بە فرمێسکی جەوانان سورمەیە خاکی.
(جەخت)

- بەڵێ شەوقی کە کوردە، چاو بە خوێنە، قەت هەدانادا
بە خوێنی چاوەکانم سوور بووە چاکی گریبانم

(مەرج)

- ئەگەر چی تۆ لە قەومی خۆش نیهادی پاکی بێ باکی
بەلام جانم لە ماڵەنگۆیە وا چەند ساڵە میهمانە

(داخوازی)

ــ شەوقی وەرە لەو غوربەتە مائیل بە وەتەن بە
بێ خاکی وەتەن، عیزەتی تۆ مەحزی وەباڵە

(نەرێ)

ــ ئەوێ مولکی قەدیم‌و مەوتەنی ئەجدادی پێشووتە
بە مەردی مەیرۆخێنە چۆن حەریمی مولکی بابانە

(پرس)

ــ بۆ چ دەناڵێنی، لەسەر لێوت لە بۆ چ بارکەوتووە؟
لەشکری زولفت کە خاوو کاڵە بۆچ رووی گرتووە؟

(تکا)

ـ بلا تیر ئاو ببێ بەو خوێنە سوورە گولێ لە مێرگوڵان
بە شوعلەی نووری ئومێدیان وەتەن با بێتە رووناکی

(سەرسورمان)

ــ بە لەنجەو لارەکەت وا دیارە نەشئەی تۆ لە کوردانە
وە ئیلا، چۆن دەبێتن پێکەوە زولم‌و وەفاداری!

(سەرزەنشت)

ــ لە تەئسیری فسوونی رۆژی تابان عالەمی شۆری
مەگەر تۆ چاوەکانم مێری کوردان هێشتا مەخمووری

(ستایش)

ــ رەنگی تۆ خۆ زەردە، زولفت کاڵە، قامەت مامەشی
یا لەنێو پایتەختی رۆمی سوێسنەو پشکووتوە

## رەنگدانەوەی شێوەزاری موکری لە شیعری شەوقی

شەوقی خۆی موکریانی بووەو تەمەنی جحێڵی لە سابلاغ بەرێ کردووە، لەپاشان لە رێگەی ئەستەمبۆڵەوە دەچێتە ئەوروپا (ئالمان)و نزیکەی سێ ساڵێك (١٩١٣ ـ١٩١٦) لەوێ خوێندکاری رشتەی پزیشکی دەبێ، بەهۆی بارودۆخی هەلگیرسانی شەڕی گەورەوە، ناتوانێ درێژە بە خوێندن بدات، بۆیە دەگەڕێتەوە ئەستەمبۆڵ‌و لەوێ خوێندن تەواودەکات‌و بەیەکجاری لەوێ دەگیرسێتەوە تا کۆچی دوایی دەکات. لەگەڵ

ئەوەی شاعیر لە تەمەنێکی زوودا موکریان بەجێدەهێڵێ، بەشی زۆری تەمەنیشی لە ئەستەمبۆڵ بەسەر دەبات‌و ژیان‌و گوزەران‌و خێزانێکی ئەرستۆکراتیانە پێکەوە دەنێت، بەڵام شیعرو بەرهەم‌و زمان‌و شێوازو ئیحساساتی کوردانەی موکریانی هەر دەمێنێتەوە. خەڵکی موکریان‌و سابلاغ‌و شوێنەوارو یادگارەکانی هەمیشە بە زیندوویی لە یادەوەریدا دەژین‌و لە شیعرەکانیدا سەردەکەن. لە ئارایشکردن‌و رازاندنەوەی هۆنراوەکانیشیدا پەنا بۆ شێوەزارو ئاخاوتنی زیندووی مەڵبەندەکەی دەبات‌و وێنەی شاعیری جوان‌و دلگیریان لێ پێك دەهێنێ، کە لەم تەعبیرانەدا بەدیاردەکەوێت:

لەناز بالنجی خەو، دەنگی زەنگۆڵ، چلۆن سەبرێ دەکەی، نێوبەندو بەرمووری، ئەوێستا لە بێخەی رۆژهەڵاتی، دەژینێ حەقی خۆت سابیت بکە، بەدەستڕە بستڕە، خەوی مە، ئەتۆ دەستە شکاوی، بەو کاکۆڵی رەش ڕەنگە، بۆ چ دەناڵێنی لەسەر لێوت لە بۆ چ بارکەوتووە، قامەت مامەشی، چارشێوو دەسماڵی تۆ، بەلای لایەی دڵم، هەڵستاون جەوانانی وەتەن، دە دڵ عەزم‌و لەسەر شۆڕی جەوانی، بۆ چ دەبەرناکەی، مێرگی شین، وڵات‌و شاری مە خۆشە بەڵا حەیفە کە وێرانە، جاوەباڵی وی، دەپێشدا شەوقی وێستاوە، ئەحواڵی دڵی خۆم، غەفلەت‌و بەس بێ، دە ئافاقی ئەمەل، دەسیجنی تەبعی جوانان، خۆش بێن، بەڵام جانم لە ماڵەنگۆیە مێهمانە، وەدەرخە، شەکرەزار، ئەتوی نێونا، دەفکری شار، مەگەر مەردانەگیت وابوو، لەنێو کوردان، هەتاکو فرسەت‌و ماوە، لەپێشا پێشی، تیپی عاشق، قەت هەدانادا.... هەروەها لە چەند شوێندا ئاماژە بۆ ناوچەکانی موکریان دەکات وەکو:

دوڕی هەوشار، ئاوی جۆگەڵەی سابلاغ، لە مێرگۆڵەی سەهەندو کێوی لاجانێ، مولکی موکریانێ، شاری سابلاغ، کانی قولقولاغ‌و... لە شوێنێکدا ئاماژە بۆ (بەندی برایمۆك) دەکات کە بەیتو داستانێکی شیعریی ئەدەبی میللی بەناوبانگە لەناوچەی موکریان.

## باسی دووەم

### وێنەی شیعری:

لە رەخنەی نوێدا گرنگیی زۆری پێدەدرێ‌و وەکو یەکێك لە پێکهاتە سەرەکییەکانی بنیاتی شیعر سەیر دەکرێت، لە رەخنەی کۆندا (وێنەی ئەدەبی) لەبەرامبەر خەیاڵکردن‌و ئەندێشە دەوەستێت کە رەگەزێکی بنەڕەتیی شیعرە.[31] تەنانەت لەلای زانایانی (زانستی مەنتیق)ی دەوری ئیسلامی شیعر وەکو (کلام مخیل) پێناسەکراوەو پرۆسەی (خەیاڵکردن: وێنەکێشان) بە بنیاتی شیعر دەستنیشانکراوە.[32] ئەو کردەوەی خەیاڵکردنە رێگا لەبەردەم شاعیردا دەکاتەوە کە ئەو واتاو گوزارانەی مەبەستیەتی لە بەرگێکی رازاوەو دلگیردا بەرجەستە بکات‌و بیانخاتە روو، بەمە وێنەی شیعریی دروست دەبێت. وێنەی هونەری وەکو لەلایەن (سی دی لویس)وە نیشان دراوە (وێنەیەکە بە وشە، لە رێگەی وەسف‌و خوازەو لێکچوونەوە پێك دەهێندرێت‌و بەرێی تەعبیرێك یا رستەیەکی ئارایشت کراوەوە ئاراستە دەکرێت).[33] بەم پێیە دەربڕین‌و وێنە، یاخود شێوازو وێنە وەکو دوو رەگەزی روخسار لەگەڵ ناوەڕۆکدا یەك دەگرنەوەو تێکەڵاو دەبن‌و یەکێتی ئۆرگانیکی بەرهەمی شیعری پێکدەهێنن، بەمە وێنەی شیعریی (دەبێتە بنەمایەکی گرنگ لەو بنەما هونەرییانەی کە پرۆسەی داهێنانی شیعرییان پێ کامڵ دەبێت).[34] دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی دووجۆر وێنەی شیعری دەستنیشان بکەین.

یەکەم: وێنەی وەسفی، کە لە رێگای وشەو دەربڕینی راستەوخۆوە ئەنجام دەدرێت.

دووەم: وێنەی رەوانبێژی کە لە رێگەی هونەرەکانی رەوانبێژییەوە دێتە بەرهەم.

### وێنەی شیعری لە بەرهەمی مەلا مارفی کۆکەییدا:

مەلا مارف بەو پێیەی لە بەرهەمەکانیدا پەیڕەوی لە زۆر لایەنی یاساو نەریتەکانی شیعری کلاسیکی کوردی کردۆتەوە بەتایبەت لە باری زمان‌و شێوازو فۆرمی

---

(31) النقد الادبي الحديث: ٢٨٣.

(32) صور خيال در شعر فارسي: ٢٨.

(33) وێنەی شیعری لە رێبازی رۆمانسی کوردیدا: ص

(34) دیلان‌و تاقیکردنەوەی شیعری: ٢١٨.

گشتییەوە، بۆیە بەرهەمەکانی لەباری جوانی ناسییەوە لەسەر بنەماکانی هونەری ڕەوانبێژی دامەزراون. لە بەرهەمەکانیدا وێنەی ڕەوانبێژی بەگوێرەی لقەکانی وەکو: (لێکچواندن، خوازەو خواستن‌و درکە)، لەپاڵ وێنەی وەسفیدا بەدی دەکرێن. لێرەوە تیشکێك دەخەینە سەر جۆرەکانی وێنەی ڕەوانبێژی‌و ڕەنگدانەوەی لە شیعری کۆکەییدا.

١. **لێکچواندن**/ بەشێکی بنچینەییە لە بەشەکانی ڕەوانبێژی، شاعیر تیادا شتێك دەچووێنی بە شتێکی تر بۆ ئەوەی سیفەتێك لە شتە لێچووەکە زەقترو درەوشاوەتر نیشان بدات. کە بێت (لێکچواندن، بەستن‌و پەیداکرنی وێکچوونێکە لەنێوان دوو شتدا بەپێی هاوبەش بوونیان لە یەك سیفەتا یا زیاتر).[35]

لێکچواندن لەسەر چوار بنەما دەوەستێت (لێچوو، لەوچوو، ئەوزار، لێکچوون) بۆ ئەوەی پرۆسەی لێکچواندن تەواو بێت لانی کەم پێویست بە بوونی هەردوو بنەمای (لێچوو – لەوچوو) دەکات، کە دوو کۆڵەکەی بنەڕەتیی لێکچواندنە.

لێکچواندن لەبەرهەمی مەلا مارفدا پانتاییەکی فراوانی گرتۆتەوەو بەپێی سەرنجی ئێمە لە هەموو بەشێکی دیکە زیاترە، هەروەها جۆری لێکچواندنەکانیش جۆراو جۆرن بە گوێرەی هاتنی ژمارەی بنەماکان دەگۆڕێن. لێرەدا چەند نموونەیەك لە جۆرە جیاوازەکانی لێکچواندن لە شیعری کۆکەییدا پیشان دەدەین:

— بۆ گولی رووی تۆ وەکو بولبول لە ناڵینە دڵم
تا نەفەرمووێ، چۆن حقوقی نادەمی؟ لێم عاجزە

دیوان: ل١٣

بنەماکان:

لێچوو: دڵی شاعیر لەوچوو: بولبول ئەوزار: وەکو

رووی لێکچوون: ناڵین

جۆری لێکچواندنەکە: درێژەی بەرەڵلایە، بەو گوێرەیەی کە هەر چوار ڕەگەزەکە (بنەماکان)ی بە ئاشکرا تیادا هاتووە.[36]

---

(35) ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردی: ٢٢.

(36) سەرچاوەی پێشوو: ٣٦.

ـ کە شیعرت وەك سەدەف فەرزەن هەموو پڕبن لەدانەی دوڕ
لەلای ئەشخاسی وشكو بۆ تەبیعەت ئاسنو سەنگە

لێچوو/ شیعری شاعیر لەوچوو/ سەدەف
ئەوزار/ وەك لێكچوون/ پڕ بن لە وانەی دوڕ

جۆری لێكچواندن/ درێژەی بەرەڵلا، دیسان لەنێوان (شیعر)و(ئاسنو سەنگە) لێكچواندنی رەوان هەیە.

ـ كەسێ غەواسی بەحری عیلمو عەقلو فەزلو جەوهەر بێ
دەبێ سینەی سەفینەی عەزمی وەك سەدی سكەندەر بێ

لێچوو: سینەی سەفینەی عەزم لەوچوو/ سەدی سكەندەر

ئەوزار/ وەك لێكچوون/ .....(نەهاتووە، ئەڵبەتە مەبەستی ئەوەیە كە لە قایمیو سەختی وەك یەك بن).

جۆری لێكچواندنەكە: قولەیە، بەو پێیەی یەكێك لە بنەماكانی لێكچواندنەكە نەهاتووە كە ئەویش (لێكچوونە).[37]

ـ هەتا كەی كونجی تەنهایی، وەرە زاهید تماشاكە
كە خەیمەی شای شەكەر لێوان، چ قەسرو بارەگاییكە

د: ل٢٥

لێچوو/ خەیمەی شای شەكەر لێوان لەوچوو/ قەسرو بارەگا
ئەوزار/....(نەهاتووە) لێكچوون/ .....(نەهاتووە)

جۆری لێكچواندنەكە : لێكچواندنی رەوانە. رەوان ئەو جۆرەیە كە تەنها دوو بنەما سەرەكیەكە، واتا (لێچوو – لەوچوو)ی تیا هاتبێت. كە ئەمەش بەرزترین جۆری لێكچواندنە.

ـ موتەوەل زولفی تۆ بوو، فەسڵو وەسڵم لێ تماشاكرد
موعەمماییكە لایەنحەلو، زنجیری بەلاییكە

د: ل٢٦

لێچوو/ زولفی یار لەوچوو/ كتێبی (المگول) – دوورو درێژ

---

(37) سەرچاوەی پێشوو: ٣٥.

لێکـچوون/ هـەبوونی (فەسـڵو وەسـڵ) لـە هـەردوولا – ئـاڵۆزی ئەفـسانەیی لـە هەردووکیان.

ـــ ئیـــشارەی کـــردە لامـــی زولفـــی، ئـــەلفی قامـــەتی، یـــەعنی
جـــەوابی قـــەدی دالی تـــۆ، فەقـــەت لامـــەل فەلاییـــکە

د: ل٢٥

لێچوو/ زولـفی یـار – قامەتی یار – قەدی یار
لەوچوو/ حەرفی (ل) – حەرفی (ا) – حەرفی (د)

لێرەدا چەند شتێکی هەڵبژاردووەو بە چەند شتێکی تری چواندووە. لێکچواندنەکان سەربەخۆن‌و بە یەکترەوە نەبەستراون: (زولف – ل)، (قامەت – ا)، (قەد –د). جۆری لێکچواندنەکە: بڵاوە. بڵاویش ئەوەیە کۆمەڵێك لێکچواندن بەدوای یەکتریـدا بـێن لـە دێرە شیعرێکدا.[38]

- لێکچواندنی وێنە/ لەم جۆرەیان شاعیر وێنەیەك دروست دەکات کە لە چەند رەگەز پێك هاتبێت‌و رەگـەزەکان تێکهاڵابن‌و تابلۆیـەکیان (وێـنەکیان) لـێ بەرهـەم هاتبێت. ئەنجا ئەم وێنەیە بە وێنەیەکی هاوشێوەی دەچووێندرێت. وەکو ئەم دوو نموونـەیـەی لای کۆکەیی:

- شەونم کە لەسەر رووی وەرەقی گوڵ دەدرەوشێ
عەینەن وەکو قەترەی عـەرەقی روومەتی یـارە

د: ل٦

لێـچوو / وێنـەی یەکـەم : دلـۆپی شـەونمە کاتێـك لەسـەر رووی پـەڕەی گـوڵ دەدرەوشێتەوە
ئەوزار/ عەینەن
لەوچوو/ وێنەی دووەم: قەترەی عەرەق کاتێك لەسەر روومەتی یار بەدیاردەکەوێت.
جـۆری لێکـچواندنەکە لێـرەدا، ئـاوەژوور کراوەتـەوە، شـاعیر جێگـۆرکێی بـە لێـچوو– لەوچوو کردووەو مەبەستیەتی جوانی‌و دلگیری وێنەی دووەم (قەترەی عەرەقی سـەر روومەتی یار) بەتین‌و تەوژم تر نیشان بدات.

- لە گۆشەی پەنجەرەی شیشەی لەتیف‌و قەسری کافووری
نمایشیان دەدا خـانم وەکـو حـوری‌و پـەریزادە

---

(38) سەرچاوەی پێشوو: ٤٢.

لێچوو/ وێنەی یەکەم : خانمانی مهابادی وەختێك لە گۆشەی پەنجەرەی شووشە بەندی جوانی قەسرو باڵەخانە سپیو سۆڵەکاندا بەدیار دەکەوتن.
لەوچوو/ وێنەی دووەم: لە وێنەی دەرکەوتنی حۆریو پەریزادبوون کە لەناو ئەو فەزا سپیو سافەدا وەدەردەکەوت.
شاعیر لە پێناوی دەربڕینو رازاندنەوەی بیرو سۆزو هەستو نەستەکانی پەنای وەبەرهێنانەوەی جۆرەکانی تری وێنەی رەوانبێژی بردووە، لە نموونەی خوازەو خواستنو درکە،* بەڵام رادەو رێژەی ئەو جۆرە وێنانە لە بەرهەمەکانی مەلا مارفدا لە لێکچواندن کەمتر وەبەرچاو دەکەوێت.
**خوازە/** بریتییە لەوەی وشەیەك بۆ مانای دروستی خۆی بەکار نەبرێ بەڵکو بۆ مانایەکی تر بخوازرێو مەبەستێکی تر بگەیەنێ.(39) نموونەی خوازە لە شیعری کۆکەیی:

من لەلام وایە کەنەیدیوە لە مەکتەب حەرفی لا
بۆ یە کەس نەی بیستووە لەو سەییدە ئیلا نەعەم

د: ل٦١

(مەکتەب) خوازەیەو مەبەست لێی (کتێبی مەکتەب)ە، کە تیادا فێری (لا-رژدی) یان (نەعەم-چاوتێری) دەبن. پەیوەندی (کتێبو فێربوون) لەگەڵ (مەکتەب) لەسەر بنەمای شوێنی (المحلیە) دامەزراوە.(40)

- فەرموو وەرە مەجلیسی تەرحیمو رەحمەتە
رۆژی وەفاتی مەسجیدو میحرابو مینبەرە

---

★ لێرەدا بە پێویستی نازانین درێژ دادڕی بکەین لە راڤەو پێناسە کردنی ئەم هونەرانە، خوێنەری بلیمەت بەمەبەستی تێگەیشتنی زیاتر لەم هونەرانە دەتوانێت بۆ هەر یەکێك لە کتێبو سەرچاوەکانی رەوانبێژی کوردی بگەڕێتەوە لە نموونەی :
١. رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردی، ٣ بەرگ، د. عەزیز گەردی.
٢. خۆشخوانی، مامۆستا علاوالدین سجادی.
٣. زانستی ئاوەڵواتا، د. کامل حەسەن بەسیر
(39) رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردی، ب١: ٦٧.
(40) زانستی ئاوەڵواتا: ٩٧.

(وەفاتی مەسجیدو میحرابو مینبەر) بۆ مانای دروستی خۆی بەکار نەهاتووە، بەڵکو وەکو خوازە بەکارهاتووە بۆ لەناوچوونو لە برەوکەوتنی شوێنەوارو رێورەسمەکانی ئاینی ئیسلام.

*خواستن/* ناونانی شتێکە بەناوی شتێکی ترەوە ئەگەر جێگەی گرتەوە. خواستن لەسەر یەك بنەما دەوەستێ ئەویش (لەوچوو یا لێ خواستراو)ە، یاخود (لێچوو یا بۆ خواستراو)ە.[41]

- بۆ خەراباتو کلێسا، مەسجیدو دەیرو کەنشیت
دەم رفێنی ئەم سەگە، سەد گورگە راوم پێدەکا
عیففەتو عیسمەت کە باری کردووە، ئەم کافرە
هەر شەوێ داوای کچێکی کەس نە گاوم لێ دەکا

هەردوو دەربرینی (ئەم سەگە)و (ئەم کافرە) خواستراون لە بریتی بەکارهێنانی (نەفسی بەد) بەکارهاتوون.

- ئەوێستاش گەر ئەنێری جوببە شینی کەللە مەخروتی
لە خزمەت حەزرەتی سەدری لەگەڵ دوو مورغەکی کونجی

د: ٥٨.

جوبەشینی کەللە مەخروتی: بۆ کەللە قەند خواستراوە، حەزرەتی سەدری: بۆ برنجی سەدری.

درکە: ئەوەیە کە راستەوراست ناوی شتێك نەبەی بەڵکو بچی ناوی شتێکی تر ببەی کە پەیوەندی بە هی یەکەمەوە هەبێت تاکو خوێنەر یا گوێگر لە مانای باسکراوەوە بۆ مانای مەبەست بچێتو پەیوەندی نێوانیان (لازمو مەلزوم) دەبێت.

دەفعەیەکیش یەك لەشخاسی ئەدیبو موحتەرەم
ئیدعای یەگ گەوهەری کون ناکراوم لێ دەکا

د: ٣٥

گەوهەری کون ناکراو درکەیە، هێمایە بۆ شیعری تازەی شاعیر، واتە شیعرێك هێشتا خەڵك نەیدیبێو تازە کوورە بێت.

- تۆی سوارو من پیادە جووابت نەدامەوە
پێت وابوو لەم قسەیە سەرفی نەزەر دەکەم

د: ل٥٣

---

(41) بنیاتی وێنەی هونەری: ٢٣٨.

- تۆی سوارو من پیادە درکەیەو هێمایە بۆ ئەوەی کە هەمیشە بەدواتەوەمو وازت لێ ناهێنم.
لەدرکەدا هەردوو واتای راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دروستن‌و رێیان تێدەچێت وەکو (تۆ سوارو من پیادە).

- دەنگی زیکرو خەتم‌و تەهلیلت فەزای پڕ کردووە
زەلزەلەی خستۆتە خەیمەی بێ ستوونی ئەزرەقی

د: ل٧٨

خەیمەی بێ ستوونی ئەزرەقی درکەیە، هێمایە بۆ ئاسمان.

جۆری دووەمی وێنەی شیعری لای کۆکەیی وێنەی وەسفی راستەوخۆیە، شاعیر لە رێگەی وشەو دەربرینەوە راستەوخۆ لە شتەکان دەدوێت‌و سیماو روخساریان نیشان دەدات، (لێرەدا وشەکان خۆیان ئامرازی دەربڕین‌و هەلگری وێنەکانن).[42] جاری واشە وشەو دەربڕینەکان کە خۆیان وێنەو دیمەنی بچوك بچوك دەنوێنن، بەشداری دەکەن لە پێکهێنانی وێنەیەکی گشتی بۆ بابەتەکە.

کۆکەیی لە شیعرێکی ستایش‌و پارانەوەدا دەڵێ:

گولستان‌و گول‌و گولزارو گولشەن
نەی‌و شمشادو سەروی جوێباری
نەواوو نالەوو گریانی قومری
فوغانی بولبولی سەر شاخساری
زریوەی مەل، لەسەر پەل یا لەسەر گول
چریکەی هودهودو سەوتی هوزاری
سەلاوو حەقحەقی مورغانی یا حەق
کە دەنگیان دێ لەسەر عودی قەناری
ئەنجا پاشبەندی ئەم چەند دێرە بەم شێوەیە دێ:
هەموو تاریفی زاتی پاکی تۆیە
دەمێ ئەیکەن بە خەندەو گەه بەزاری

د: ل٥

(42) وێنەی شیعری لە رێبازی رۆمانسی کوردی دا : ١٥.

لەنیوە دێرەکانی چوار دێری یەکەمدا کۆمەڵێك ناوو وەسفو تەعبیرات هاتوون، کە هەر یەکەیان وێنەیەکی سەربەخۆ دەنوێنن (وێنەی هەستی بینینو بیستن)، ئەمانە هەموویان بەشداری دەکەن لە نەخشاندنو سازکردنی وێنەیەکی گشتی ئەویش رازانەوەی جیهانە بەم هەموو دەنگو ڕەنگو بوونەوەرو مەوجوداتەوە، واتە هەموویان تەعبیر لە شتێك دەکەنەوە ئەویش بوونو ناساندنی پەروەردگارێکی مەزنە.

کۆکەیی لە باسو وەسفی گوندەکەی ئاغای (موهتەدی) دا دەڵێ:

تا چاو هەتەر دەکاتو هەتا دڵ دەڵێ بەسە
باغو درەختو عەرعەرو سەروو سنەوبەرە
غەملیوە سەر زەمینی بە خونچەی ئاتەشی
ئاوی لەتیفە، سافە، هەوای عەتر پەروەرە
فەرشی زومەڕەدی، گوڵی زەردو سوورو ئاڵ
تێکەڵ بووە، دەڵێی تەبەقی عودو مەجمەرە
وەك خێوەتی گوڵانە هەموو باغو چیمەنی
دامێنی کێوی، ئەتلەسو دیباوو مەخمەرە
نەرگس بەچاوی مەستەوە، سوسەن بە سەد زوبان
مەشغوولی زیکرو فیکری خوداوەندی ئەکبەرە
گەردن کەچە وەنەوشە، گوڵو بەرگی نەستەرەن
گوڵی یاسەمەن بەدارەوە، وەك میسكو عەنبەرە
شەونم لە چیهرەی گوڵی میناوو ئەتلەسی
باریوە، دانەی دەڵێی دورو گەوهەرە
وەك مەن مەلولە، لالە بە داغی فیراقەوە
سونبول بڵاوو خاوە، دەڵێی زوڵفی دولبەرە
گریانی گوڵی شلێرە ببینە عەزیزەکەم
فرمێسکی چاوی بە هەوری ئاوی موقەتتەرە

لەهەندێ دێرو نیوە دێرەکانی ئەم پارچەیەدا هەندێ وێنەی لێکچواندن بەدی دەکرێت، بەهۆی ئەوزارەکانی وەکو (وەك — دەڵێی) بەڵام وێنە وەسفییەکانی کە لە خودی ناوهێنراوەکاندا هاتوون، زۆر بە تینو گوڕو جۆشن، کە وێنە لێکچواندنەکانی خستۆتە ژێر سێبەری خۆیەوە. ئەم وێنە جیاوازو پەرشو بڵاوانە بە هەموویان هاوکاری دەکەن لە خستنە رووی وێنەو دیمەنێکی رازاوەی رەنگاو ڕەنگی بە هەشت

ئاسای سروستی ناوچەکە. ئەم وێنەیە کە بە وشەو دەربڕین چندراوە، دوور نییە لە خودی تەبیعەتەکە جوانترو رازاوەتر بێت. لێرەدا خەیاڵی شاعیرانە رۆڵێکی خولقێنەری گێڕاوە لە نەخشاندنی ئەم دیمەنە دلگیرە.

## جۆرەکانی وێنەی شیعری لە بەرهەمی سەیفی قازیدا:

### وێنەی رەوانبێژی:

#### أ. وێنەی لێکچواندن

- ئەستاری وەکو زوڵفی عەروسانە موسەلسەل
ئەلفازی هەموو گەوهەرە چەند جوانی ئەداکرد

د: ل٢٩

لێچوو: ئەستاری (دێرەکانی نامەی یار) لەوچوو: زوڵفی عەروسان
ئەوزار: وەکو رووی لێکچوون: موسەلسەل (ریزە بە ڕیزە).
وێنەکە لەسەر بنچینەی لێکچواندنی بەڕەڵلا دروست بووەو هەر چوار بنەماکەی لێکچواندن هاتوون.
لەنیوە دێری دووەمدا وێنەی لێکچواندنی جەختاو هەیە کە لەسەر هەرسێ رەگەزی: لێچوو: ئەلفازی، لەوچوو: هەموو گەوهەرە، لێکچوون: جوان، دروست بووە.

- هەر گوڵ شەکەری لێوە شفای دەردی نەخۆشان
سەر بێ بە فیدای کوڵمی گەش‌و چاوی نەخۆشی

د: ل٤٠

لێچوو: لێوی یار لەوچوو: گوڵی شەکەر لێکچوون: هەردوو لا دەرمانن بۆ دەردی نەخۆشان
ئەوزار: نەهاتووە، ئەم جۆرە وێنەیە لەسەر بنەمای لێکچواندنی جەختاو دروست بووە.

- زوڵفی وەك شەوەی رۆژی کردمە شەو
چرای سەر کوڵمەم لە بۆ رادێرە

د: ل٤٨

نیوە دێڕی یەکەم: لێچوو: زوڵفی یار لەوچوو: شەو ئەوزار: وەك لێکچوون: نەهاتووە

وێنەکە بە هۆی لێکچواندنی بەرەڵاوە پێکهاتووە، لە نیوە دێری دووەم لێکچواندنەکە ڕەوانە.

- دایم دڵم بە ناڵەو زاریو فیغان ئەڵێ
خۆش بەو شەوەی کە ڕۆژی ڕوخی دڵبەرم هەڵێ

د: ل٣٣

لێچوو: ڕوخی دولبەر لەوچوو: ڕۆژ

لە ئەنجامی هاتنی تەنیا دوو بنەما سەرەکییەکە، لێکچواندنی ڕەوان پێکهاتووە.

- کیژانی جوانی عێلی لە خێلی کە دێنە دەر
ئاسکن لە باسکو سوورە قورینگی شەتاویە

د: ل٧٦

لێچوو: کیژانی عێل لەوچوو: ١. ئاسکی باسکانو ، ٢. سوورە قورینگی شەتاوان

لەم جۆرە لێکچواندنە ڕەوانەدا شاعیر یەك شتی بە دوو شت چواندووە بۆتە لێکچواندنی لێکدراو. ئەڵبەتە گەشتو گەڕانێکی نێو شیعرو بەرهەمی شاعیر ژمارەیەکی زۆرمان لە وێنەی ڕەوانبێژی (لێکچواندن) بە هەموو جۆرەکانییەوە بۆ بەدیار دەخات. ئێمە بەم چەند نموونەی سەرەوە وازی لێ دەهێنین.

- قەوسو قەزەحە تاقی برۆت ئەوڕۆ بەوەسمە
بۆیە دڵەکەم لەتلەتە بەو خەنجەری ئەزرەق

د: ل٢٩

برۆی بە وەسمە شین هەڵگەڕاوی یار: لێچووە.
خەنجەری ئەزرەق: لەوچووە.
ڕووی لێکچوونیشییان: کەوانەیی بوونە.

- تفلی دڵم گڕوی شەکەری لێوی گرتووە
بەو دوو هەنارە ژیری کەوە بیخە باغەڵێ

د: ل٣٣

(هەنار) بۆ مانا دروستەکەی خۆی بەکار نەهاتووە، بەڵکو لێرە بۆ واتای (مەمك) خواستراوە، پەیوەندی لەنێوان (هەنار)و (مەمك)یشدا لێکچوونەو جۆری خواستنەکەش (ئاشکرا)یە.

- ئەی دڵ بە خەتا کەوتیە چینی سەری زوڵفی
لەم مارە عەجایب بە تەمای لەزەتو نۆشی

د: ل٤٠

**ب. وێنەی خوازەیی**

لێردا وشەکان بۆ دەبڕینی مانایەکی تر بەکاردەبردرێن بێجگە لەمانای خۆیان، ئەم مانایەش هەر ئەبێ لەکاتی بەکارهێنانا دەرکەوێ.[43] وەکو لەم نموونەیەدا روون دەبێتەوە:

- ئەمڕۆ حەسەن موئەززینی کوردانە بانگ ئەدا
هەستن لەخەو، وەخرِ بن، حی علی الصلاه

وشەی (خەو) وێنەیەکی خوازەییە، شاعیر بۆ مەبەستی بانگ کردنی کوردان بۆ هۆشیاربوونەوەو بێداری و کارکردن بەکاری هێناوە، قەرینەکەشی (موئەززینی کوردانە).

**ج. وێنەی خواستراو**

- تفلی دڵم گڕوی شەکەری لێوی گرتووە
بەو دوو هەنارە ژێری کەوە بیخە باغەڵێ

(هەنار) بۆ مانا دروستەکەی خۆی بەکارنەهاتووە، بەڵکو لێرە بۆ واتای (مەمك) خواستراوە. پەیوەندی لەنێوان (هەنار)و(مەمك)یشدا لێکچوونەو جۆری خواستنەکەش (ئاشکرا)یە.

- زوححاکە لەبێ باکی لەتەخریبی دڵان دا
خوێنخۆری گەلێك کردووە، ماری سەری دووشی

لە (زوححاك)و(ماری سەری دووشی) خواستن هەیە، کە بۆ (یار)و(زولفی یار) خواستراون.

**د. وێنەی درکەیی**

- یان خدری کە هاتی بە دووجام ئاوی بە قاوە
ئەم موردەیی هیجرەت بە تەمای عومری بەقا کرد

دیوان: ل٢٩

---

(43) رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردی، بـا: ٨٨.

له هێنانەوەی (بە تەمای عومری بەقا) درکە هەیەو هێمایە بۆ (نەمری)، وەکو چۆن لـە هێنانـەوەی (خـدر)و (دووجـام ئـاوی بـەقا) لێکـچواندن هەیـە بـۆ (یـار)و بـۆ (هەردووچاوانی).

### وێنەی فەلسەفی:

لەگـەڵ ئـەوەی ئـەم جـۆرە وێنانـەی وەکـو (فەلـسەفی، دەروونـی، ئەفـسانەیی) زیـاتر پەیوەندییان بەناوەرۆکەوە هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی شیرازەی باسەکەمان لێ نەپچڕێت، هێناومانـە لێـرەدا ریزمـان کـردوون و بـەخێرایی بەسـەریاندا تێدەپـەڕین. لەگـەڵ ئەوەشدا نموونە شیعرییەکان لـەڕووی شێوازناسییەوە لەوێنـەی ڕەوانبێـژی بـە دوور نین. وێنەی فەلسەفی گوزارشت لە هەڵوێستی شاعیر سەبارەت بە ژیان و بوون و کێشە جیاوازەکانی دەکات. بیرو باوەڕی شـاعیر لـە دوو تـوێی هۆنراوەکانیـدا دەر دەبـڕدرێن، کە ئەگەر بێت کۆبکرێنەوەو لێیان ووردبینـەوە، ئـەوا فەلـسەفەو جیهانبینیی شـاعیر سەبارەت بە دیاردەکانی سروشت و ژیان و مردن پێك دەهێنێ.[44]

لە قەسیدەی (ستایشی خواو پێغەمبەر)دا چەند وێنەیەکی فەلـسەفی بـەدی دەکـەین، لە نموونەی:

- بێ وێنە سانعێکی بە ئەمرێ دروست دەکەی
  ئینسان لە ئاوو، گوڵ لە گەڵاو، لە گل گیا
- ماسی لە شەوقی تۆیە لە بەحران دەکەن شەنا
  تەیران لە عیشقی تۆ لە سەمادا دەکەن سەما
- هـەڵکەی چرایەکی ئـەتۆ، قەت نـاکوژێتەوە
  ریشی دەسووتێ هەر کەسێ فووکا لە ئەو چرا

د: ل٢٤

### وێنەی دەروونی:

شـاعیر مرۆڤێکـی خـاوەن هەسـت و سـۆزێکی بـە پێـزو ناسـکە، بـە هەماهـەنگی و موتوربـەکراوی لەگـەڵ خـەیاڵ و ئەندێـشەی بـە پیـت و بـەرزەفڕی، وێنـەی شـیعری سۆزدارو دڵگیر لە ناخی دەروونیەوە هەڵ دەقوڵێ کە تەعبیر لە هەست و هۆش و سۆزو خەیاڵـەکانی دەکاتـەوە. لێـرەدا شـاعیران و نووسـەران (شـعوورو بـارە ویـژدانی و دەروونییـەکانی خۆیـان هەڵدێنجن بـۆ ئـەوەی لـە شـێوەیەك لـە شـێوەکانی ناسـراوی

---

(44) بنیاتی وێنەی هونەری: ٢٤٦.

ئـەدەبی دایـان بڕێـژن).[45] وێنــەی فەلـسەفی حـەزو خۆشەویـستیو هەڵـچونەکانی دەروونی شاعیر بەدیار دەخات، سـەنگی محـەکیش لەسـەرکەوتنی ئـەم جۆرە وێنەیـە ئەوەیـە کـە تـا چـەند هـەلگری سـۆزو هەڵـچوونو تـەعبیر کردنێکـە لـە ئـارەزووە کپکراوەکان. لە شیعری سەیفدا نموونەی وێنـەی دەروونـی ئـەوتۆ بـەدی دەکـەین، کـە لەگەڵ ئەوەی دەربڕینێکی راستەو ڕاستی هەیە، بەڵام سەرشارە لـە سـۆزو هەڵـچوونو ئەڤینی راستەقینە. وەکو لەم چەند دێرەدا بەدیاردەکەوێت:

- لە عیشقت مردم وصیەت بێ لە تۆ
بـۆ خـۆت بمـنێژە تـەلقینم دادە

د: ل٣٤

- لۆمـەی حەسـەن نەفعی نییە لابدە واعیز
عاشق هەموو گیانی دڵە ئەسلەن نییە هۆشی

د: ل٤٠

هەردوو وێنەکە لەم دوو دێرەدا بەهۆی گوزارشت کردن لە دەروونی شاعیر لە ڕێگەی تەعبیرەکانی (لە عیشقت مردم)، (عاشـق هـەموو گیـانی دڵـە) پێکهاتوون. ئەگەرچی زیـاتر وێنـەی مەعنـەوین، بـەڵام هەریەکـەیان دەلالـەت لـە سـۆزێکی قـووڵی شـاعیر سەبارەت بە یارو دڵدارەکەی دەکات.

### وێنەی داستانیو ئەفسانەیی

لە ڕێگەی هێنانەوەو ئاماژە بۆ کردنی داستانو بەسـەر هـاتی مێـژوویيو ئەفـسانەیی، شاعیر وێنەی شیعری دروست دەکاتو مەبەستی خۆی پێ دەرازێنێتەوە. لێرەدا چەند نموونـەیەك نیـشان دەدەین:

- بە جامی دیدەی جەمشـیدی جەمە
بە تەختی سـینەی وەك کەیقوبـادە
گوتم کوشـتومت، بە غەمزە فەرمووی
شێوەی شـیرینە رەسمی فەرهادە

- یوسفی میسری ویلایەت، ئەی خەلیلی باغی قودس
ناری نەمردووە دەروون، بێ تۆ دووچاوم بوونە گۆم

د: ل٤٣

---

(45) سەرچاوەی پێشوو: ٢٥١

- وەك مەجنوون لە دوت کەوتمە کێوان
رەفیقم گورگو پلینگو شێرە

د: ل٤٨

- پەنیر بۆ ئیکسیر، شیر ئاوی حەیات
وەکو ئەسکەندەر کەوتینە زولمات

د: ل٥٣

## وێنەی وەسفی راستەوخۆ

سەیف زۆر عاشقانە وەسفی ژن و سروشت و ژیانی کوردەواری کردووە بەتایبەت لە شیعرە برگەییەکانیدا، عیشق و جوانی و سروشت بەشێکی گرنگی بەرهەمی شاعیر پێك دەهێنن.

ـــ بەڵێ بەو شەرتە خۆشە وەسڵی دلبەر
کە دەم دەم دەم لەنێو دەم دەس لە باوەش
هەتاکو ساردو سڕ بوو مەیلی گەرمت
دەدەم جینگڵ وەکو ماری سەر ئاتەش
لەسەر روخساری زەردم ئەشکی خوێنین
لە دووریت دێتە خواریێ وەك گوڵی گەش

د: ل٣٨

ـــ شینی بەهارە عاسمان هەر دەگری
هەوریش ناڵە ناڵ رووی خۆی دەپچڕی
با لە کێوو دەشت خۆڵ وەسەر دەکا
گریانی کێوان بەحران پڕ دەکا

داری مێشەو باغ بەفرداپۆشین
پاك دەڵێی مردوون کفنیان پۆشین

د: ل٥١

## بنیاتی وێنە لە شیعری مستەفا شەوقی

دەقی شیعری رۆمانتیکی بەشێوەیەکی گشتی جۆرێك لە یەکێتی ئۆرگانیزمی تێدایە، یەکێتی ئۆرگانیزمیش بریتییە لەوەی کە سەرجەم وێنە تاکەکان بە یەکترەوە گرێدرابن و لەپێناو خزمەتکردن و پێکهێنانی وێنەیەکی گشتیدابن، لێرە وێنەی تاك

ساکارترین شێوەی وێنەی هونەرییە لە رووی پێکهاتنەوە، رۆڵێکی گرنگیش لە ناو قەسیدەدا دەگێڕێ لە گوزارشت کردنی ماناو مەودا دەروونییەکانی ئەزموونی شیعریدا.[46] هەر وێنەیەکی تاکیش لەسیاقی وێنەی گشتیی تێکستی شیعریدا (کارو وەزیفەیەکی تایبەتی ئەنجام دەدات، بەوەی کە گونجاوو رێك بێت لەگەڵ فیکرەو هەستی گشتی لە تێکستەکەدا)،[47] لەنگەری بایەخ دەخرێتە سەر وێنەی هەستیو مەعنەوی کە هەستو سۆز دەبنە کرۆكو پێکهێنەری سەرەکی ئەم جۆرە وێنانە.
لەم پێشەکییە کورتەوە کاتێ ئاوڕ لە ئەزموونی شیعری تارادەیەك جیاوازی مستەفا شەوقی لەگەڵ دوو شاعیرەکەی دیکەمان بدەینەوە، دەتوانین شوێن پێی ئەم جۆرە وێنە شیعرییە رۆمانسیانە هەڵبگرین لەگەڵ ئەوەی لە دوو تۆی تانو پۆی شیعری عەرووزیدا هاتوون.*

## شێوازەکانی بنیاتی وێنەی تاك لای شەوقی

**١. ئاڵوگۆڕکردنی درك پێکراو/**

أ. **بەرجەستەکردن ( تجسید ):** بریتییە لە بەرجەستەکردنی وشەی نا هەستی، ژیریو مەعنەوی بۆ وشەیەکی هەستی کە سیفاتی تازەی دەدرێتێ. واتە دەرخستنی شتە ژیرییەکانە بەشێوەیەکی هەستی لەبەرئەوەی پەیوەستە بەجەستەوە.[18]
شاعیر دەڵێ:

- بلا تێر ئاو ببێ بەو خوێنە سوورە گوڵ لە مێرگۆڵان
بە شوعلەی نووری ئومێدیان وەتەن با بێتە رووناکی

د: ل٢٢

---

(46) بنیاتی وێنەی هونەری: ١٢٧.
(47) النقد الادبي الحديث: ٤٤٦.
* ئەم جۆرە شێوازەی بنیاتی وێنەی شیعری لە ئەزموونی شیعری کوردیدا زیاتر لە قۆناغی شیعری رومانسیزمو قوتابخانەی شیعری سەربەستو رەمزیدا باون.
(48) بنیاتی وێنەی هونەری: ١٣٤.
جێگای ئاماژەیە لە ناولێنانو راڤەی ئەم شێوازە هونەریانەی وێنەی شیعری بەشێوەی سەرەکی پشتمان بەم سەرچاوەیە بەستووە.

- له غوربەت لاوی کوردان بۆ نیگای وەسلی تۆ مەحزونن
شەوو رۆژ ناسرەون بۆ شەهدی شیرین ژەهرە تریاکی

د: ل۲۳

- له رێگای دەوری (هیوی) یەعنی ئومێد دەست بەدەست دەگرن
بـە عیلمو مەعریفەت تێر ئاو بکەن جا خاکەکەی پـاکی

د: ل۲۳

- جەفایی نووری دیدەی من لەسەر دڵ گەورە کێوێکە
خودای شەفقەت وەرە قوربان دەسا جارێ بەغەمخواری

د: ل۲۵

- عەجەب توفان دەرە حیسی شەبابم هەڵدەچێ دایم
له قەلبی پڕ خرۆش ئەسرینی چاوم لەعلی رومانە

د: ل۲۵

لـەم نموونانـەدا شـاعیر لـە رێگـای خواسـتن‌و لێکـچواندن‌و وەسـفەوە کۆمـەڵێك شـتی ژیری‌و مەعنەوی لە شتی هەستیدا بەرجەستە کردوون، تاوەکو وێنەکان کاریگەرییان زیاتر بێت.

لە دێڕی یەکەمدا (ئومێد) کە شتێکی مەعنەوییە بـووە بـە (شـوعلەو خـاکی وەتـەنی روونـاك کردۆتـەوە) کـە ئەوەشـیان شـتێکی هەسـتییەو بـە ئاسـانی لـە هەسـتەوەری بینینەوە درکی پێ دەکرێت.

لەدێڕی دووەمدا لاوان بۆ (نیگای وەسلی نیشتمان) بە پەرۆشـن، شـتێکی مەعنەوییـە، تا بە (شەهدی شیرینی شاد بن، کە ئەمەی دواییان شتێکی هەستییە).

هـەروەها لـە سـێ دێڕەکـەی دواتـردا: (عـیلم‌و مەعریفـەت)، (نـووری دیـدە)، (حیـسی شەباب) هەموویان شتی مـەعنەوین، شاعیر بۆ مەبەستی گەیاندنی سۆزو هەسـتی بـە جۆشی وەریگێڕاون بـۆ شـتی هەستی‌و لەوێنـەی (تێـر ئـاو بکـەن)، (گـەورە کێوێکـە)، (تۆفـان دەرە) ئـاڵوگۆڕی پێکـردوون. هـەروەها لـەم دوو نموونـەی خوارەوەشـدا شـاعیر پەیڕەویی لەهەمان رێوشوێن کردووە.

- دە ئافاتی ئەمەل ئەورۆ سەرابە وەسڵی تـۆ دوورە
له بۆیە بە فەلسەفەی ژینێ له بۆ من بۆتە ئەفسانە

مەبەست (وەسڵ)ی نیشتمانە کە شتێکی مەعنەوییەو بووە بـە (سـەراب) کـە شـتێکی هەستییە.

- له شەریان و وەریدی جیسمی فانی من وەکو خوێن
مەلالی چاوی مەخموورت دەکا دەوران و سەیرانە

د: ل٢٧

(مەلالی چاوی مەخموور)ی یار شتێکی مەعنەوییەو لە ڕێگەی لێکچواندنەوە شاعیر ئاڵوگۆڕی پێکردووە کردوویە بە (خوێن) کە شتێکی هەستییەو لە دەمارەکانیدا لە دەوران و گەڕاندایە.

ب/ **بەکەس کردن (تشخیص)**: ئەوەیە کە شاعیر ژیان بە مادە بێ گیانەکان ببەخشێ و سیفات و خەسڵەتی مرۆڤیان پێ ببەخشێت. لێرەدا شاعیر لەڕێگەی خواستن و لێکچواندنەوە مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ شتە هەستی و بێ گیانەکان دەکات و دەیان دوێنێ. لەم بوارەدا شەوقی دەڵێ:

- ئەی بادی سەبا هەستە گوزەر کە بەوەتەندا
پەخشان بکە سەر ئەرزی وەتەن بۆنی گوڵاڵە
با بێت و بە تەئسیری فسوونی نەفەسی تۆ
وەك خونچە بپشکوێ دەمی ئەو کوردە کەڵاڵە
بابێت و سبەینان، ئەلەم و دەردی شەوی هەجر
بێژێ، کە لەوەی پاش خەوی مە، مەحزی وەباڵە

د: ل٢٠

شاعیر خەسڵەتی ئادەمیزاد بە (بادی سەبا) دەبەخشێت و بەوجۆرە مامەڵەی لە تەکدا دەکات. تکای لێ دەکات بێ دواکەوتن هەستێت و خاکی پاکی نیشتمان پڕ بکات لە بۆنی ئەفسووناوی گوڵاڵەکان. ئەوسا چۆن دەمی خونچە بە سروەکەی دەپشکوێت، بەهەمان شێوە دەمی کوردیش بپشکوێت. لە شوێنێکی تردا هاتووە:

- دابنێ سەر قەڵبی زارم ئەو سەرەی پڕ جۆشی خۆت
هەم بە لای لایەی دڵم بنووە، زەمانی هاتووە

د: ل٢٢

شاعیر (دڵ)ە پڕ لە هەست و خۆشەویستییەکەی لەوێنەی دایکێکی میهرەبان نیشان دەدات، تا سەری ماندووی یارەکەی بخاتە ناو باوەشی و بەلای لایەی ئەو (دڵە — دایکە) خەوی لێ بکەوێت.

٢. **شێوازی وێنەی روونبیژی /**

أ. **خوازە :**

- لەوەی پێش من دەمگوت براکان غەفلەتو بەس بێ
جەفات فەرموو، تەعنەت دا، کە شەوقی پووچە بازاڕی

(پووچە بازاڕی) خواستنێکی وینەییە، واتە شیعرو ئامۆژگاری شەوقی بە (بازاڕ) چوێندراوە، بۆ خواستراو کە (ئامۆژگاری)یە باس نەکراوەو (غەفڵەت) بەڵگەکەیەتی، لەمەدا خواستنێکی ئاشکرا هەیە.

- لە موڵکی خۆشەویستی تۆ دەخوێنی کوند سبەینان زوو
کە ئەی کوردی فەقیر تاکەی دەنووی هەستە چ قەوما بوو

(تاکەی دەنووی) واتای خوازەیی هەیە، بۆ ئەوە هێنراوەتەوە کە کورد راپەڕێو واز لە سستیو تەمبەڵی بهێنێ.

- لەنێو کوردان کەسێك موڵکی نەبێ خۆ نۆکەرە بێ شك
لەسەر خەڵقی لەبەر موڵکە، کە ئەمری ئێوە موجرا بوو

د: ل٣٢

(موڵك) واتاکەی خوازەییە، مەبەست خودی واتای دەربڕینەکە نییە، بەڵکو واتا هێما بۆ کراوەکەیەتی، کە (نیشتیمان)ە.

ـ بەڵێ زنجیری دەستت جەهلو غەفلەت بوو، رەقیبی تۆ
بە ئەفسوون بەستی قۆڵت، چونکە زانی مەستو مەسحووری

(مەست و مەسحوور) خوازەیەو لەبڕی کاڵفامی بەکارهاتووە.

ب. **درکـــــە :**

ـ بە مسکێنی مەڵێ دەستم بە زنجیر سەخت بەستراوە
کە ئەو زنجیرە وەهمە دەیپسێنێ چونکە پڕ زووری

(زنجیر) درکەیەو هەردوو واتای (نزیك)و(دوور) هەڵدەگرێت.

ج. **خوازەو درکـــە بەیەکەوە :**

- ئەوێستا تا لە بێخەی رۆژهەڵاتی تاو هەڵات رابە
بە ئازایی نەجات دە دەستی بەستراوت کە مەغدووری

ئێوە دێری یەکەم: (تاو : ئازادی) خوازەیەکی سەربەستەو لەسەر پەیوەندی هەوجێیەتی بنیاتنراوە.

نیوه دێری دووەم: (دەستی بەستراوت) درکەیە، چونکێ هەردوو واتای (نزیك و دوور / ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ) دروستن و ڕێیان تێ دەچێت.

**د. لێکچواندن :**

- جەبین مینایی زیو، گەردن هوما، خاڵ مشکی تاتاری
شەدەشل، چاو بەکل، ڕوو سوورە گوڵ، تەڕاڕو عەیاری

د: ل٢٥

لەم دێرەدا کۆمەڵێ لێکچواندنی ڕەوان بەدوای یەکتریدا هاتوون، کە هەریەکەیان سەربەخۆیەو بەوانی ترەوە نەبەستراوە.

لێچووەکان: جەبین - گەردن — خاڵ — ڕوو

↓ ↓ ↓ ↓

لەوچووەکان: مینای زیو — هوما - مشکی تاتار - سوورە گوڵ

هەموو لێچووەکان شتی هەستین، لەبەرامبەردا لەوچووەکانیش وەهان، بۆیە هەر یەکێك لەمانەی سەرەوە لێکچواندنی شتی هەستی بە هەستییە.

- خولاسەی مەقسەدی من زولفی کاڵ بوو، بۆیە لێم گێژە
سەراپا فیکرو جیسمم میسلی زوڵفی خاوی جانانە

د: ل٢٧

لێچوو: فیکرو جیسم — لەوچوو: زوڵفی خاوی جانان

ئەوزار: میسلی — لێکچوون: ------ نەهاتووە

جۆری لێکچواندنەکە قولەیە.

- مەلاحەت خەتمە سەرتۆ گەرچی وەك نێوت لەچاو دووری
لە بۆ شەوقی دوو کوڵمی پڕ ئەفسوونت تازە دیوانە

د: ل٢٧

لێچوو: کوڵم — لەوچوو: تازە دیوان

لێکچواندنی شتی هەستی بە هەستییە

لەدوا هۆنراوەی بەرهەمە کۆکراوەکانی شاعیر کە لە (٧) دێر پێکهاتووەو بەناونیشانی (مەگەر لێم عاجزی)[49] کۆمەڵێك دەستەواژەی خواستن‌و سیفاتی

---

(49) بڕوانە: بەشێك لە بەرهەمەکانی دکتۆر مستەفا شەوقی: ٣٤.

تەشبیهی هاتوون، کە هەمووشیان کۆن و سواوەو دووبارە کراوەن، لێرە تەنها ئاماژەیان بۆ دەکەین:

- تابووری موژە - تەوێلّی گرژ
- تیپی عاشق - برۆی کەچ
- گەنجی حوسن - موعەمای عالەمی کۆن
- قەلبی مەجروح - چاکی گریبان

**٣. وێنەی فەلسەفی:**

لەکۆ بەرهەمی شەوقی قەسیدەیەکی (٢٢) بەیتی هەیە، کە درێژترین پارچە شیعری بەرهەمی شاعیرەو لەژێر سەردێری (تەحەسوری جەوانی و تەرانەی وەتەن) دایە، کۆمەڵێك وێنەی فەلسەفی گرتۆتەخۆ، کە باس لە مەسەلەکانی عەشق و ژیان و مەرگی مرۆڤ و گەردون دەکات، لەشێوەی لێکچواندن و وەسف و هێماو دەربڕینی فەلسەفییانە، لێرەدا چەند نموونەیەکی دەهێنینەوە:[50]

- بەڵێ هەللاجم و ئەورۆ ئەسیری ڕەنگی بێ ڕەنگیم
بە سەودای تۆوە مەستم چونکە چاوت داویە پەیمانە

لێچوو: شاعیر لەوچوو: هەللاج

لێکچوون: هەردوو لا ئەسیری ڕەنگی بێ ڕەنگی بوون

لێرەدا شاعیر ئاماژە بۆ داستانی (مەنسووری هەلاج) دەکات، کە بە شەهیدی عەشقی ڕاستەقینە (حەقیقی) ناسراوەو شاعیر بەرگی ئەو دەپۆشێت یا بە واتایەکی تر (کەسایەتی ئەو دەنوێنێت)، کە لە زانستی دەروونندا بە (تقمص الشخصیه) ناودەبرێت.

- ئەسیری حوسنی تۆ چۆن مەعکەسی ئەنواری لاهووتە
لە تاریکی وجود گونجی ناسووت، ڕۆژی تابانە

(لاهوت و ناسووت) دوو زاراوەی سۆفیزمن یەکەمیان هێمایە بۆ پەروەردگارو نەمری، دووەمیان هێما بۆ ژیانی دنیاو مرۆڤ دەکات کە شتێکی ڕاگوزەرو کاتییەو مەحکومە بە فەنا. مەبەستی شاعیر ئەوە دەگەیەنێ ئەو مرۆڤانەی عاشقی ڕاستەقینەی (ڕووناکی ڕوخساری پەروەردگاری حەقن)، گونجی تاریکی ژیانی سەر دنیایان هەمیشە وەکو ڕۆژی درەخشان ڕووناکە. هەر لە درێژەی ئەو مەعنایانەدا شاعیر بەردەوام دەبێت:

---

(50) سەرچاوەی پێشوو: ٢٧.

ـــ چـــرای فكـــرم لـــەوێ دایـــم دەكـــاتن ئیقتیباســـی نـــوور
میـــسالی پـــیری مـــەیخۆران لـــە جـــامی لـــەعلی مەیخانـــە
لـــە ســـەحرای مێرغـــوزاری عالـــەمی ئـــەرواحی عیللـــیین
شەهنـــشەهـ بـــوو خـــەیاڵی فیكـــری ســـەربازم تاقانـــە
مـــوحیتی مـــن فەلـــەك بـــوو ئـــەوجی قودســـییەت نیـــشانی دڵ
مونـــەزەهـ بـــووم لـــە پابەنـــدی فـــسوونی جیـــسم‌و خومخانـــە

وشـــەكانی (نـــوور، پـیر، جـام، عالـــەمی ئـــەرواح، شاهنـــشەهـ....) زاراوەو مـــەدلولاتی سۆفیزمن‌و لەم دێرانەدا بۆ مەبەستەكانی ئەو باوەڕو فەلسەفەیە دەربڕاون.

وێنەی وەسفی راستەوخۆ/

شاعیر خـاوەنی هەستێكی ناسك‌و خـەیاڵێكی بـەپێزە، دەوروبـەرو رووداوەكانی ژیـان كاری لێ دەكەن، ئەنجا شـوێنەواری ئـەو كاریگەریانـە لـە وشـەو دەربڕینـەكانی رەنـگ دەداتــەوە، لــە وەســف‌و وێنەكێــشانی ئــەو دیمەنانــە تــا خوێنــەریش لەگــەڵ خــۆی هەڵگرێت‌و بیخاتە نێو ئەو دۆخەوە، (دیارە شاعیر وێنەكان وەكو خۆیان ناگوێزێتـەوە بـەڵكو خـەیاڵی خـۆی دەخاتـە سـەرو وێنەیـەكی جـوان‌و قەشـەنگ‌و دڵڕفێنیـان لـێ دروسـت دەكـات بـەجۆرێك كـە ئاوێنـەی هـیچ كامیرایـەك ناتوانـێ ئـەو وێنانـە بكێشێ).[51] شاعیر پەنا بۆ وەسـف‌و لێكچوون‌و فەرهـەنگی وشـەكانی زمـان دەبـات تـا رەنگ‌و دۆخ‌و كەش‌و هەوای وێنە شیعرییەكانی بەرجەستە بكات. دەردی دڵ لەتـەك نیشتمان دەكات، بەم شێوە وەسفی سروشتەكەی دەكات:

خـــەملیوە لەســـەر قـــەبری جـــەوانان گـــوڵ‌و لاڵـــە
یـــا ســـووریی خوێنـــە كـــە بڵێـــی رەنگـــەكی ئاڵـــە
پـــێش تابـــشی خورشـــیدی فەلـــەك وەقتـــی بـــەهاران
وەك چـــاو لـــە فرمێـــسكی منـــە قـــەترەیی ژاڵـــە

ب.ش/ ل٢٠

لە وێنەكێشانی یارو هاوڵی ماتەمداریشی دەڵێ:

چـــەندە مەحبووبـــە لەســـەر ئەنـــدامی ســـەروت جلكـــی رەش
تـــۆ بـــە فرمێـــسكی خـــوێن، ئـــەو رەنگـــە رووت بـــۆ شوشـــتووە
رەنگـــی تـــۆ خـــۆ زەردە زولفـــت كاڵـــە قامـــەت مامەشـــی
یـــا لـــەنێو پایتـــەختی رۆمـــی سوێـــسنەو پـــشكووتـــووە

(51) بنیاتی وێنەی هونەری: ١٤٦.

هەر لە درێژەی ئەم بابەتەدا دەڵێ:

چــار شــێوو دەسمــاڵی تــۆ شــەرحە لــە بــۆ تاریکــە شــەو
مــن لــە عــومرم مــانگ دەنێــو تاریکــە شــەو نەمبیــستووە
لــێم گــەڕێ نــەورۆ بــە دەســتماڵی حــەریر بــێم بــستڕم
دانــەیی مــرواری فرمێــسکت، هــەتیو هــەلکەوتووە

ب.ش/ ٢١، ٢٢

شاعیر سوودی لە وەسفو لێکچواندن وەرگرتووەو کۆمەڵێك وێنەی هەستی دلگیری کێشاوە، کە خوێنەر خۆی دەکەوێتە ناو حاڵەتەکەوە، یا رووبەڕوو لە بەردەم وێنەکاندا دەوەستێتو تێکەڵاویان دەبێت.

# باســـــی یەکـــــەم

## بنیاتی شـــیعری

### لـەنێوان یەکێتی بەیتو یەکێتی بابەتدا:

دیوانی شیعری کلاسیکی کوردی لەسـەر بنـەمای سیـستمی عـەرووز دامـەزراوە، لـەو سیستمەدا رەچاوی (یەکێتی بەیت، یەکێتی کێشو سەروا، پـەیڕەوی لـە هونـەرەکانی رەوانبێـژی) کـراوە. لـە رەخنـەی کـۆنی عەرەبیـدا (لـە روانگـەی یـەکێتی بەیتـەوە روانیویانەتـە هەڵبەسـتو بەلایانـەوە بـەیت یەکـەی هەڵبەسـت بـووەو پێوەنـدی بـە پـێشو دوای خۆیـەوە نـەبووە).[1] لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە شـیعری کلاسـیکیدا بـە رەچـاوکردنی نیزامـی عـەرووزیش، جۆرێـك لـە گونجانـدنو تـەبایی‌و یـەکێتی بـیر لەسـەرتاپای غـەزەلو قەسـیدەدا بـەدی دەکرێـت. شـاعیرانی کلاسـیکی لـە خـەمی ئەوەدابوون کە (پاژەکانی واتا لە ستوونی شیعردا بەیەکەوە ببەستنەوە بەوەی کە دەشێ بە یەکێتییەکی وێنەی ئەدەبی ناوببرێت).[2] یەکێتی بنیاتی وێنەی گشتی هـەر تێکستێکی شیعری لە ئاکامی بەیەکەوە بەستنی نیوەدێرو دێرەکانەوە دێتە دی، ئەم بەیەکەوە گرێدانە بە دوو رێگا ئەنجام دەدرێت:

١. بەیەکـەوە گرێـدانی وشـەکان لـە نیـوەدێرو دێرەکـان لـە رێگـەی هونـەرەکانی رەوانبێژییەوە (رازاندنەوەی وشە لە وێنەی جیناسو لێکچواندنو...).

٢. بەیەکەوە گرێدانی واتایی نیوە دێرو دێرەکان بەیەکەوە.[3]

بایـەخو گرنگی پێدانی شـاعیرانی کلاسیك بەتاکـە تاکـەی بەیتـەکان رێگـر نـەبووە لەبەردەم بەدیهاتنی جۆرێك لە یەکێتی بنیاتی تێکستی شیعری لـە شیعری قۆنـاغی کلاسـیکی، بەیتـەکان لـە سـیاقی تێکستی شـیعریدا تاڕادەیـەك سـەربەخۆیی خۆیـان دەبێـت لـە شـێوەی زنجیرەیـەك وێنـەو تەسـەوراتەوە بـەدوای یەکتریـدا دێـن، هـەر وێنەیەك لەوانی تر دابڕاوە بۆیە دەتوانین دێرەکان پاشو پێش بکـەین یـا نـاوە نـاوە

---

(1) بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا: ٣٨.

(2) النقد الادبي الحديث: ٢١٠.

(3) سبك شناسی شعر: ٣٦٥.

لێرەو لەوێ دێرێك بقرتێنین بێ ئەوەی كار بكاتە سەر سیمای گشتی تێكستەكە.[4] هۆیەكی دیكە كە لە خزمەت پاراستنی یەكێتی بنیاتی تێكستی هۆنراوە دابووە، پەنا بردنە بەر یەكێتی سەروایە، یەكێتی سەروا لەگەڵ ئەو كۆسپو گرفتانەش كە دەیهێنێتە سەر رێگای شاعرەوە، شێوەی شوورەو پەرژینێكی قایم بە دەوری تێكستدا دەكێشێو كۆی دەكاتەوەو بە توندی رێگە لەبەردەم لێك ترازانو هەڵوەشانی دەگرێت.[5] یەكێتی بنیاتی تێكست لە رێبازی رۆمانسیو شیعری نوێدا لە رێگای یەكێتی ئۆرگانیزمی وێنەی گشتی تێكستەوە، دێتە دی. ئەم یەكێتی ئۆرگانیزمییە بەهۆی تێكچڕژانو ئاوێتەبوونی پاژە وێنەكانەوە لە قەدو باڵای تێكستداو، پێكهاتنی وێنەیەكی گشتی یەكگرتووەیە. لە شیعری نوێدا یەكێتی بابەت، مەسەلەی پاراستنی یەكێتی بنیاتی تێكستی شیعری دەگرێتە ئەستۆ.

## بنیاتی شیعری لای شاعیرانی موكریان

**مەلا مارف:**

لە رەخنەی ئەوروپیدا باس لە شیعری راستەوخۆ (Direct Poetry)و شیعری ناراستەوخۆ (Oblique Poetry) دێتە پێشەوە كە بەرامبەر بە یەكتری دەوەستن، لە شیعری راستەوخۆدا گرنگی دەخرێتە سەر بابەتو بێ پێچو پەنا واتاكان دەردەبڕدرێت، وەكو لە شیعری ستایشو داشۆرین دەردەكەوێت كە تارادەیەك بابەتی نائەدەبین.[6] لە رەخنەی عەرەبیشدا ئەم جۆرە شیعرە بە (شیعری تەخت – الشعر المسكح) ناودەبرێت، ئەم جۆرە شیعرە لە دەوری بابەتی وەستاو دەخولێتەوەو شاعیر لە رێگەی هێنانەوەی وێنەو سۆزو لێكچواندنەوە جوولە دەخاتە تێكستەكەوە.[7]

بەشێكی بەرهەمی شیعری مەلا مارف دەچێتە چوارچێوەی شیعری راستەوخۆوە، كە رەگەزی گێڕانەوەو وەسفكردنی رووتی بەسەردا زاڵە، لە رووی ناوەرۆكیشەوە بەشی زۆری بەرهەمەكان ستایشو داشۆرینو گێڕانەوەی رووداوو چیرۆكن، كە جۆرێك لە

---

(4) قضايا الشعر المعاصر: ٢٤٣

(5) سەرچاوەی پێشوو: ٢٤٤.

(6) سبك شناسى شعر: ٢٥٦.

(7) قضايا الشعر المعاصر: ٢٤١.

یەکێتی واتاو گوزارە بە سەرتاپای هەر یەکێك لە تێکستەکان بەخشیوە، زۆرجار بەیەکەوە گرێدانی دێرەکان شێوازی تری وەرگرتووە بۆ نموونە:

کەسێ غەواسی بەحری عیلم‌و عەقل‌و فەزل‌و جەوهەر بێ
دەبێ سینەی سەفینەی عەزمی وەك سەدی سکەندەر بێ

کەسێ مەیلی خەزێنەی گەنجی ئەسراری نیهانی بێ
دەبێ مەردی تەعام‌و حەوتخوانی شێرو ئەژدەر بێ

کەسێ تالیب بە نێوو شۆرەت‌و روشدو شەجاعەت بێ
دەبێ ئامادە بۆ شمشێرو تیرو زەربی خەنجەر بێ

چ باکێکی لە تیرو تەعن‌و لۆمەی یارو ئەغیارە
کەسێ عاشق بە تاقی قەوسی ئەبرۆی یارو دڵبەر بێ

چ کارێکی بە وەعزو میمبەرو میحراب‌و مزگەوتە
کەسێکی مورشیدی مەیخانە یارەندو قەلەندەر بێ

کە من رووتم بە من چی، گەر لیباسی عالەمی دنیا
هەمو دیباو و ئەتلەس، یانەدارابوو، موجەسەر بێ

کە من نەقدی دوکانم بوو بە ئەسکین ناسی ئیفلاسی
بە من چی گەر هەموو کەس ساحیبی یاقووت‌و گەوهەر بێ

کە من شەمعی وجودم مالی بەیتولحوزنی وەحدەت بێ
بە من چی گەر هەموو دنیا نیزام‌و تۆپ‌و عەسکەر بێ

کە من جامی شەرابم پڕ لە ژەهری مارو ئەقرەب بێ
بە من چی شەربەتی تۆ پڕ لە شیرو شەهدو شەککەر بێ

لە خەتمی موستەقیمی قەلبو قالب من کە مەحرومم
بەمن چی گەر کوڕەی عالەم موحەدەب یا موقەعەر بێ

عەزیزم عەزمی هیممەت شەرتە بۆ چی هێندە مەئیوسی
دەبێ شاعیر قەویی قەلبو مەتینو سینە دەفتەر بێ

دیوان: ل٢٠ -٢١

ئەم تێکستە خیتابێکی ڕاستەوخۆیە کە شاعیر ئاراستەی هەر (کەسێ)کی دەکاتو یەکێتی بنیاتی تێکستەکە بە چەند ڕێچکەیەك بە دیهاتووە:

١. هەر دێرێك بریتییە لە ڕستەیەکی مەرجو ڕستەیەکی وەڵامی مەرج کە شێوەی پرسیارو وەڵامێکی وەرگرتووە، بەمە یەکێتی هەر دێرێك لەناو خۆیداو بە تەنهاو جیا لە دێرەکانی تر پارێزراوە.

٢. شاعیر پەنای بۆ (تیکرار) بردووەو وشەی (کەسێو کەسێکی) لە (٦) دێڕی یەکەمداو، (کەمنو بە من چی) لە پاشماوەی دێڕەکاندا دووبارەکردۆتەوە، کە بۆتە هۆکارێکی بەیەکەوە گرێدانی دێڕەکان لە پارچەکەدا.

٣. کەشوهەوای گشتی لە تێکستەکەدا: لە نیوەی یەکەمیدا جۆرێکە لە ئامۆژگاری ڕاستەوخۆو بەدیارخستنی فەلسەفەی ڕووتی ژیان، لەنیوەی دووەمدا بابەتەکە وەرگەڕاوە بۆ باسێکی کلۆڵیو ڕەشبینی کە پەیوەستە بە خودی دەروونی شاعیرەوە، بەلام هێڵی گشتی پرسیارو وەڵامەکان بەردەوامەو هەردوو بەشەکانی بەیەکەوە گرێداوەو بەمە گوێزانەوەی واتای تێکستەکەی لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە ئاسان کردووە.

٤. هەروەها نابێ ڕۆڵی یەکێتی کێشو ئاواز، یەکێتی سەرواو دووبارە بوونەوەی ڕەدیفی (بێ) لە کۆتایی سەرواکاندا، لەبەیەکەوە گرێدانی دێڕەکانو پاراستنی یەکێتی بنیاتی تێکستەکە لەبەرچاو نەگیرێت.

لە پارچەی (عەسای موساو تووری سینا) کە لە ٣٠ دێرە شیعر پێکهاتووە، شاعیر وەسفی عەباییێك دەکات کە بە دیاری بۆی هاتووە. بەم شێوەیە دەستپێدەکات:

عەبایێکم هەبوو، ئەمما عەبایێکی گەلێ چابوو
خەلاتی حەزرەتی شێخ یادگاری لوتفی مەولا بوو

لـــەنێو ئـــەهلی تەریقەتـــدا لیباســـێکی موقـــەدەس بـــوو
لـــەکن ئـــەربابی مـــەعنی مەزهـــەری نـــووری تەجـــەلا بـــوو

شاعیر لەسەر ئەم ڕێچکەیە پێدا هەڵدەچێت، بەدرێژایی تێکستەکە بە شانو باڵی عەباکەدا هەڵدەڵێت. پەراوێزو کەنارو حاشیەی، کەمەو کەیفو وەزعو جیسمی، سودو کەڵك لێ وەرگرتنی لەشەوو رۆژو کاتی سەرماو گەرمادا.... ئیتر چۆن تا وای لێهات کۆنو پەربووت بووو کونو کەلەبەری تیاکەوت.
ئەم نەسەقی چیرۆكو گێڕانەوەیە بنیاتێکی یەککگرتوو بە تێکستەکە دەبەخشێتو شاعیریش لە دێڕەکاندا ئازادو دەست ئاوەڵا دەبێت تا وەسفو پێداهەلگوتن بگەیەنێتە ئەوپەڕی خەیاڵ.
لە (سێلاوی بەدبەختی) کە رووداوی کارەساتی لافاوو سێلاوی شاری مهابادی ساڵی ١٩٣٦ دەگێڕێتەوە. دیسان رەگەزی گێڕانەوەو بەیەکەوە گرێدانی زنجیرەی وێنەو رووداوەکان یەك بەدوای یەك دادێنو سەرجەم وێنەیەکی گشتی دەدەن بەدەستەوە. ئەم قەسیدەیە (٥٤) دێرەو شاعیر سوودی لە لێکچواندن وەرگرتووە بۆ وێنەکێشانو بەیەکەوە گرێدانی دیمەنەکان:

عیمـــــاراتو قوســــوورو بــــاغو باغـــــاتو گوڵـــــستانی
هـــەزار ســوێندت دەخــوارد دەتگــوت بەحەشــتی بــاغی شــەدادە
موغــازەو قەیــسەریو دوکــانو حــوجرەی وا موجەلـــلــەل بـــوو
وەکـــو قەســری، کـــە بـــۆ قەیـــسەر کـــرا بـــێ ســازو ئامـــادە
لـــە گۆشـــەی پەنـــجەرەی شیـــشەی لـــەتیفو قەســری کـــافووری
نمایـــشیـــان دەدا خـــــانم وەکــــــوو حــــــۆریو پەریـــــزادە

کۆمەڵێك پارچە شیعری ستایش لە بەرهەمەکانی شاعیردا بەدی دەکەین، کە باس لە چاکەو پیاوەتیو سەخاوەتی ستایش کراوەکان دەکات. دوعای چاکەو خێریان بۆ دەکات ئەوەشیان بیر دەهێنێتەوە، کە لە (ئینعامو کەرەم)یان بێ بەشی نەکەن، ئەم بابەتو ناوەڕۆکە لە پارچەکانی: (گریانی هەوری تەبعو پێکەنینی گوڵ، شامی غەریبان، فیلو قالی مودەعی، خاڵە مینەو عالەمی شۆخی، خوانی یەغما، دەردی بێ دەرمان، بادی سەبا، گێژەلووکەی نەگبەتی، بۆ میرزا رەحمەتی شافیعی، سەیرو سیاحەت، هودهودی باغی سەبا، قەهقەهەی کەبکی دەری، خوانی یەغما، بۆ میرزا

کەریمی شاتری، کاکی چەلەبی، بۆ ئاغای بلووری) دووپاتە کراونەتەوە. لێرەدا جۆری مەبەستو ناوەڕۆکی شیعری، (کە لەمانەدا وەسفو ستایشو پیاهەڵگۆتن بووە) خۆی لە خۆیدا جۆرێك لە یەکێتی بنیاتو بابەتی بە تێکستەکان بەخشیووە، ڕەنگە جیاوازیی نێوانیان تەنها لە شێوازی تەعبیرکردن بێت لە شیعرێکەوە بۆ یەکێکی کە.
بەشێکیش لە بەرهەمەکانی شاعیر بەمەبەستی داشۆرین گوتراون، لە داشۆریندا باڵای تێکست بە تەوسو پلارو قسەو دەربڕینی زبڕ دادەپۆشرێت. لە پارچەکانی (قوتابخانەی تەدلیس، سیمی تەلیگرافات، خەیمەی بێ ستوون، سەیرو سەیاحەت، ڕەعناو سورەیا، ئیتاعەی ئەمری ئەعلا حەزرەت)، ماناو مەبەستی داشۆرین لەسەرەوە تا خوارەوەی پارچەکان هاتوون، لەهەر پارچەیەکداو هەموو دێڕەکان لە خزمەتی مەبەستێکی گشتیدا هاتوون.
چەند بەرهەمێکی شاعیر لە دەوری زانستپەروەریو نیشتمانو نەتەوەخوازیو ڕەخنەی کۆمەڵایەتیدا دەخولێنەوە کە هەر یەکێك لە تێکستەکان بەهەموو پێکهاتەکانی بۆ ئەو مەبەستە تەوزیف کراوەو تەعبیری لێ کراوەتەوە.

**سەیفی قازیو بنیاتی سادە:**

بەرهەمی سەیف زیاتر بەلای پارچەی لیریکدا دەشکێتەوە، زیاتریش لیریکی دڵدارین، چ لە شێوەی غەزەلدا هاتبن یا لە شێوەی پارچەی شیعری خۆماڵی سۆزدار.
هەر یەکێك لەم پارچانە خاوەن یەکێتی بنیاتێکی سادەن. لە بنیاتی سادەدا شاعیر تەنها بابەتێك هەڵدەبژێریو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، بەواتا یەکێتی بنیات لە ئاکامی ڕەنگدانەوەی یەك بابەتو یەك تاقیکردنەوەی شاعیرەوە هاتووە.[8]
غەزەل پارچەیەکی سەربەخۆیە تایبەتە بە تەعبیرکردن لە سۆزی خۆشەویستی.[9] ژمارەی دێڕەکانی زۆر نین، هەر تاکە دێڕێکیش (لەسەر بنەمای یەکێتی بەیت) ئەگەر حیسابی یەکەیەکی سیمانتیکی و دەلالیو تەرکیبی سەربەخۆشی بۆ بکرێت ئەوا هەر بەشێکی پێکەوە گرێدراوی پەیکەری غەزەلەکە پێك دەهێنێت، کە بێت هەر دێڕێك سەربەستو سەربەخۆیە لە هەمان کاتدا وا

---

(8) بنیاتی هەڵبەست، ٥١.

(9) النقد الادبي الحديث: ٢١٥.

بەستەو پەیوەستە بە دێڕەکانی دیکەوە.[10] لێرە بە نموونە ئاماژە بۆ غەزەلێکی سەیف دەکەین:

نامەیەك لە یاری خۆشەویستەوە
قاسید کە لە دەرهات و بە تەبلیغی وەفاکرد
حوجرەی منی حەسرەت دێهی سەت چین و خەتاکرد
پێم گوت لە خوتەن دێیەوە یا خوتتەیی تاتار
یا ئەهلی بەهەشتی کە دڵت پڕ لە سەفا کرد
یان خدری کە هاتی بە دوو جام ئاوی بەقاوە
ئەم موردەیی هیجرەت بە تەمای عومری بەقاکرد
یاخود لە تەرەف یارەوە دێی حامیلی نامەی

خاسییەتی ئاهوی خوتەن و چینی ئەداکرد
خاسییەتی بۆ چاوی منی خەستەو رەنجوور
وەك جامەیی یوسف کە بە یەعقووبی عەتاکرد
ئەستاری وەکو زوڵفی عەروسانە موسەلسەل
ئەلفازی هەموو گەوهەرە چەن جوانی ئەداکرد
نوختەی بە مەسەل خاڵە لەسەر رووومەتی یارم
یا وەك عەرەقی کوڵمی کە مەیلی بە جەفا کرد
هەر خۆم بەفیدای ئەو خەت و ئەو رەبت و بەیانە
عیجزو غەم و دەردی لە دڵم مەحوو فەناکرد
ئەم دەستە گوڵە بەستەیی ئەم دەست و بەنانەن
بۆیە وەکو بولبول حەسەنی نەغمە سەراکرد

یەکێتی بنیاتی شیعریی لە بابەتی غەزەل کە خۆشەویستییە، بەم شێوەیە هاتۆتەدی:

- هێڵی سەرەکی بنیاتی بابەتەکە لە دووبەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم، هاتنی قاسیدو هێنانی نامەیەکە لە تەرەف یارەوە. شاعیر لە کۆی (٩) دێڕی پارچەکەدا (٥) دێڕی بۆ

---

(10) شعر عمر بن الفارض: ١٢٩

هاتنی قاسید تەرخان کردووە. لە دێڕی یەکەمدا خەبەری گەیشتنی قاسید رادەگەیەنێ ئەنجا بەهۆی وروژاندنی کۆمەڵێك پرسیارەوە "کە دەشێ ئەم پرسیارانە بێ کۆتایی بن!" دێڕەکانی دووەم بە یەکەم، سێیەم بە دووەم، چوارەم بە سێیەم دەبەستێتەوە. دێڕی پێنجەم وەرگێڕانەکەیە بۆ بەشی دووەمی پارچەکە کە لە وەسفی چۆنیەتی نامەکەیە (دێرەکانی، بێژەکانی، نوختەو خاڵی، جۆری خەتو رەبتو بەیانی......) لە دوایشدا قفلی پارچەکە بە دێڕێك لە وەسفی نامەکە کە بەو دەستە گوڵەی، کە پێچراوی دەستو پەنجەی نەرمو ناسکی یارە، دەچووێنێ. شاعیریش بولبولە بە دیتنی گوڵ کەوتۆتە غەزەلخوانی. دوو بەشەکە (٤) دێڕ بە (٤) دێڕن لە هەر بەشێکیان یەکگرتوویی‌و یەکپارچەیی تەواوی بنیات هەیە، دێڕی پێنجەم لەرێگەی هێنانەوەی وشەی (خاسیيەتی) کە نموونەی (رد العجز علی الصدر) دەنوێنێ، هەردوو بەشەکەی بەیەکەوە شەتەك داوە، کە دووڕووی یەك مەوزوع پێکدەهێنن.

لە غەزەلەکانی دیکەشدا لە وێنەی (زولـی بەناحەق، تفلی دڵ، بۆ خۆت بم نێژە، بومە چاوەش، لۆمەی حەسەن مەکە، شەتی ئەشکم، سەمەندەر، گیرۆدە، شەوی یەڵدا) تاك تاکی دێڕەکان وەك دانەی مرواری بە داوی واتاکەیەوە بەستراون‌و لەسەرەوە تا خوارەوە لە خزمەت بابەتێکی گشتی دان، یەکێتی بنیات بۆ پارچەکە فەراهەم دەکەن. پارچە شیعرە درێژەکانی شاعیر کە لە شێوەی شیعری میللی‌و لەسەر کێشی برگەیی هۆنراونەتەوە، پڕن لە وێنەی جوان‌و دلگیرو پاك رازاوە، بە زمان‌و شێوازێکی رەوان‌و پاراوخراونەتە روو:

یار کە دێتە سەر گوڵ‌و ئەستێرە
سەیری ئەو دەکەن مانگ‌و ئەستێرە
روونـاکی وی بوو یان روونی ئاسمان
کە دێ بۆ کێوی دەبا گا گێرە
دەگەڵ یار لە بن سێبەری پالان
چەند خۆشە دۆی سارد دەگەڵ کولێرە
خۆزگەم بەو شوانەی لە دوای مێگەلان
یارم بە زولفان دەکا هاوێرە
شەرتی شوانیم ئەوەندە بەس بێ
یارم بێری بێ بۆ مەڕە بێرە

بەم شێوەیە لەسەر ئەم شێوازو ئاهەنگو نەسەقە ئەم پارچەیە بۆ (٤٧) دێڕ درێژبۆتەوە، لەهەر دێڕێکدا وێنەیەك هەیە، یادەبی لەنیوە دێڕێکدا وێنەیەك هەبێت، بەڵام وێنەکان لە دێڕەکاندا کە بەدوای یەکتریدا دێنو بەریز تێدەپەڕن هەموویان هاوپەیوەندن، لە ژیانو گوزەرانێك هەڵێنجراون کە زۆر لایەنی جوانو روونـاكو قەشەنگو دلگیری هەیە، شاعیر یەك لەدوای یەك وێنەکان ڕاودەکاتو لەتانو پۆی بنیاتی هۆنراوەیەکی لیریکدا دەیان هۆنێتەوە، ئەم نەریتەی شاعیر بە پارچەکانی تری وەکو:

عەزیز ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو زەردی رووی لێنام
دیسان بە ئاوڕی دوریت کەوتمە گیر
دنیام لێ ساردبوو بووبە زمهەریر

کە درێژترین شیعری شاعیرەو (٨٥) دێڕەو لەسەر شێوەی مەسنەوی هۆنراوەتەوە دیارو ئاشکرایە.

هەروەها بەهەمان شێوە لە:

زۆر توولی کێشا عەزیز هیجرانت
لال بم نابینم مەیلی جارانت
چ قەوما ئەو ساڵ لەبەرچاوکەوتم
چلۆنت دڵ هات لە دڵت دەرکردم

کە (٦٤) دێڕە، هەروەها لە پارچەی (نامەیەك) کە (١٢) دێڕە شاعیر لە دەستپێکدا دەڵێ:

نامەی گرامیت حەزرەتی نامی
پێم گەیشت لە دەست شەخسێکی نامی
نامەی گرامیت وەختێ پێم گەیشت
هێند کەیف خۆش بووم دنیا تێم گەیشت

هەروەها پارچەی (بخوێنن چاکە) کە (٤٢) دێڕە ئەمە سەرەتایەتی:

یـــــادم بـــــۆ ناكــــــەی یـــــادت بـــــەخێربێ
وەعـــــدەی زووهـــــاتن وەختـــــە زۆر دێـــــر بـــــێ
هێنـــــدەم تەماشـــــای ڕێـــــی هاتنـــــت كـــــرد
چـــاو خێـــل بـــوون لەســـەر ســـەریان و ســـەرگرد

ئەم چوار پارچەیەی دوایی كە بە پارچەی لیریكی میللی و خۆماڵی ناومان بردن، لە شێوەی گشتیی هەر پارچەیەك، دێرەكان بەشێوەیەكی وەسف و سەردی هاتونەتە خوارەوە، وەكو گوتمان لە پارچەو پاژە وێنەی جیا جیا پێكهاتوون كە هەموویان لەنێوان سنوورو چوارچێوەی گشتیی تێكستەكەدا كۆبوونەتەوەو یەكیان گرتووە، ئەنجا بنیات و مەبەستێكی تایبەتیان پێكهێناوە. لە كۆی بەرهەمەكانی سەیف چەند بابەتێكی نیشتمانی و سیاسی و كۆمەڵایەتی هەن، كە لە رووی یەكێتی بنیاتەوە، هێڵی گشتیی تێكستەكان هەر وەكو ئەوانی پێشتووترن. بۆ نموونە (ڕۆژی شادی) كە لە (٢٦) دێڕ دایە، یەك بابەتەو بۆ یەك مەبەست هۆنراوەتەوە كە ئەویش پیادا هەڵگوتنی ستالین و سوپای سوورو ئەو ئازادییە كە لەژێر سێبەری ئەو سوپایەدا بۆ كورد ڕەخساوە، ئیتر هەموو دێڕەكان لەتەوەری ئەو بابەتەدا دەخولێنەوە. هەروەها (پەیامی دوعاو سڵاو) كە (٥٩) دێڕەو لەسەر هەمان ناوەڕۆك و بابەتی شیعرەكەی پێشووە، باس لەسەركەوتنەكانی ئۆردوی سوپای سوور دەكات لە بەرەكانی جەنگ و ئەو سەربەستی و ئاسوودەییەی كوردستانی گرتۆتەوە لەسای ئەوانەوە. پاراستنی یەكێتی بنیات لە شێوازی گێڕانەوەو دەربڕینی چیرۆكیانەو هێنانەوەی نموونەی لێرەو لەوێ بەرجەستە دەبێ و ڕەنگە هەندێ جارحەماسەت و خەیاڵ شاعیر هەڵبگرێت و بۆ شتی لا بەلاش بچێت كە زۆر لەگەڵ بابەتی سەرەكی تێكستەكەوە پەیوەست نەبێت، بەڵام بە هەر جۆرێك بێت لە چوارچێوە گشتییەكە تێپەرناكات.

**بنیاتی یەكێتی بابەت لە شیعری مستەفا شەوقیدا**

مەبەست لە یەكێتی بابەت لە شیعری ڕۆمانتیكی دا یەكێتی ئۆرگانێكی تێكستی شیعرە، كە لە ڕەخنەی تازەدا گرنگی پێ دەدرێت و بەو جۆرە پێناسەكراوە، كە بریتییە لە یەكێتی بیرو بابەت و ئەو هەست و سۆزانەی كە بابەتەكە دەیان ورووژێنێ، تیایاندا وێنەو بیرۆكەكان بە شێوەیەكی مەنتیقی بەدوای یەكتریدا دێن، هەر وێنەو بیرۆكەیەك رۆڵێك لە چەمكێكی تێكستەكەدا دەگێڕێ لە خزمەت گەشەكردنیدا

دەبێـت و لـە ئاكـام تێكدەكەنـەوەو شـێوەی بنیـاتێكی زینـدوو بـە دەقـی شـیعری دەبەخشن.[11]

بەم چەشنە پەیوەستی نێوان دەقە شیعریەكە لەباری یەكێتی بابەت و بیرو ئەو سۆزەی بەرپای دەكات توندو تۆڵ دەبێت. لێرە ئەزموون و تاقی كردنەوەی شاعیر دەبێتە ئەو تەوەرەی كە بنیات و بابەتی شیعری لە دەور دەئاڵێ، ئەزموونیش خۆی (رووداوێكـی ویـژدانی یـا سـۆزدارییە كـە لـە مێـشك و هەسـت و دەروون و فیكـری ناوخۆیی و دەرەكییەوە دێتە دەرەوە).[12] لەم پێشەكییەوە بەرەو شیكردنەوەی بنیاتی شیعری مستەفا شەوقی هەنگاو هەڵدەگرین و چەند نموونەیەك دەهێنینەوە. شاعیر لە هۆنراوەی (حەسبوحاڵ دەگەڵ وەتەن)دا دەڵێ:

خـــەملێوە لەســـەر قـــەبری جـــەوانان گـــوڵ و لاڵـــە
یـــا ســـووریی خوێنـــە كـــە بلێـــی رەنگـــەكی ئاڵـــە

پـــێش تابـــشی خورشـــیدی فەلـــەك وەقتـــی بـــەهاران
وەك چـــاو لـــە فرمێـــسكی منـــە قـــەترەیی ژاڵـــە

ئـــەی بـــادی ســـەبا هەســـتە گوزەركـــە بەوەتەنـــدا
پەخـــشان بكـــە ســـەر ئـــەرزی وەتـــەن بـــۆنی گوڵاڵـــە

بـــا بێـــت و بـــە تەئـــسیری فـــسوونی نەفەســـی تـــۆ
وەك خونـــچە ببـــشكوێ دەمـــی ئـــەو كـــوردە كەلاڵـــە

بـــا بێـــت و ســـبەینان ئەلـــەم و دەردی شـــەوی هـــەجر
بێـــژێ كـــە لـــەوەی پـــاش خـــەوی مـــە، مـــەحزی وەبالـــە

---

(11) النقد الادبي الحديث: ٣٤٩.

(12)سوسۆلۆژیای شیعری كوردی: ١٤٩.

قــەهری فەلــەكو جــەوری رەقیــبو ســتەمی دۆســت
سەرناســیەیی پــڕ شــكەنی كــرد بــە قەباڵــە

شــەوقی وەرە لــەو غوربەتــە مائیــل بــە وەتــەن بــە
بــێ خــاكی وەتــەن عیزەتــی تــۆ مــەحزی خەیاڵــە

بــەو كــاكۆڵی رەش رەنگــە كــە بــۆزی فیراقــە
بــاڕام بــێ لــە بــۆت فــەزلو هونــەر چــونكە حــەلالە

بە سەرنجێكی سەر پێی لەناونیشانو دێڕەكانی تێكستەكە ئەوە ئاشكرا دەبێت كە شاعیر ئەزموونێكی خەماوی سەبارەت بە نیشتمان دەكات بە مەبەستو لەسەرەتاوە لە رێگەی چنینی وێنەی رۆمانسی بارگاوی بەسۆزو خۆشەویستی بۆ نیشتمانەكەی (هەر وێنەیەك لە دێڕێكو وێنەكان لە نیوە دێڕەكانی دووەمدا بە ئاكام دەگەن). گوڵو لالەی بەهار، كە بە خوێنی نەوجەوانی شەهید روواوەو سوور هەلگەڕاوە، خاكی وەتەنی ئارایشت كردووە، لە رێگەی وەسفو دیالۆگەوە مەبەستی شاعیر پەرەدەستێنێ، لە سروە با دەخوازێت بۆنو بەرامەی گوڵاڵەی بەهاری بە هەموو سوچێكی نیشتماندا بلاوبكاتەوە. (گوڵاڵەو رەنگی سوورو بەهارو شەونمو بۆنو بەرامو سروەی با) دێرەكانیان بەیەكەوە شەتەك داوە، یەكێتیو پەیوەندی ئورگانێكی لەم گونجانو تەبایيو بەدوای یەكتری داهێنەدا بەدی دەكرێت، دیمەنو تابلۆیەكی زیندوو بەرجەستە دەكات. ئەو سۆزەی كە لە دیمەنەكەوە هەڵدەقولێت، دەرژێتە نێو دەروونی خوێنەرەوە، بە چاوی هۆش دیمەنەكە درك پێدەكات. رایەڵەكە ناپچرێت لە دێرەكانی دواتر (بادی سەبا) جلەوی هەستو سۆزی خوێنەر بەدەستەوە دەگرێت، دەمی كوردی كلۆڵ دەپشكوێنێ، باس لە ئێشو ئازاری (شەوگاری غوربەت لە وەتەن)ی بە گوێدا دەچرپێنێ، تا وەخۆكەوێت، عیبرەت لە دەردو نەهامەتییەكانی وەربگرێت، لەگەڵ شاعیر روو لە وەتەن بكەنو بە فەزلو هونەر ئۆقرەو ئاسوودەیی پێ ببەخشن. وێنەی دەستپێكی تێكستەكە (گوڵاڵە سوورەی سەر مەزاری جەوانێكی كورد)ە، ئەنجا وردە وردە لە رێگەی گفتوگۆو وەسفو هاتنە ناوەوەی وێنەی ترەوە گەشە دەكاتو بەرەو پێشەوە دەچێت تا تابلۆی دیمەنەكە پڕ رەنگ دەبێت، ئەنجا خاڵی كۆبەندو كۆتایی خۆی فەرز دەكات. بەمجۆرە یەكێتی ئەزموونو بنیاتو بابەت

له شیعرەکەدا هاتۆتەدی، بابەتێکی نیشتمانی بەهۆی تەوژمێکی بەهێزی سۆزەوە لە بەرگ و ئارایشتێکی لیریکی دا خراوەتە روو.
له تێکستێکی دیکەدا کە بەناونیشانی (وەرەقێك لە دەفتەری خاتیرات)ەو تەعبیر لە ئەزموونێکی دلداری شاعیر دەکاتەوە هاتووە:

فیـــدای چـــاوت عـــەزیزم، ئەورۆکـــە حـــالم پەرێـــشانە
لـــە دووری تـــۆ دوو دیـــدەم غـــەرقی خوێنـــە بـــەحری عوممانـــە

عەجـــەب کۆرپـــەی دلـــم نـــادا هـــەدا شـــەوگاری تـــەنهایی
نـــەباتی قەنـــدی لێـــوی تـــۆی دەوێ بێـــچارە بـــێ زمانـــە

بـــەناز ســـاتێ وەرە دەســـتێ بنـــێ ســـەر قـــەلبی مـــەجروحم
خـــەناوی بـــێ بـــە ســـووری پەنجـــەکانت رەنگـــی مەرجانـــە

زبانـــت چـــونکە نازانـــێ، بـــە ئیمـــا شـــەرحی حـــالی کـــرد
کەبـــابە جـــەرگی مـــن ببیـــە، هەناســـەم بـــۆنی بریـــانە

هێلی گشتی مەبەستی شاعیر (شەرحی حالی خۆکردنە لە تاوی دلداری)، ئەدگاری باوی سازکردنی وێنەکان لە بنیاتی تێکستەکەدا شێوازی لێکچواندنە، (هەرچەندە بە کەرەستەو ستایلێکی کۆنە). رەگەزی گفتوگۆش لە سیاقی دێڕەکاندا بەدی دەکرێت، (بەناز ساتێ وەرە – ئەگەر چی تۆ – جانم لە مالەنگۆیە...) لە هەموو دێڕەکان دەردە دلەکە بەردەوامە، هەرچەند شێوازو دەربڕین و وێنەکان دەگۆڕێن، بەلام هەمیشە لە خزمەتی بابەتی سەرەکی دان و لێی لانادەن. شاعیر بەردەوام دەبێت:

دلـــت بەســـتم بـــە ئەفـــسوون ئـــەی کـــچی رۆمـــی چ فـــەتتانی
مەگـــەر دایکـــت ئـــەتۆی نێـــو نـــا لـــە بـــۆ تـــەلبیس و ئەفـــسانە
وەکـــو ئـــاهوی خـــەتا گەرچـــی ئـــەتۆ نـــارۆی لـــە پـــێش عاشـــق
خـــەتایی چـــاوی ســـەیادە کـــە بولبـــول نـــایتە هێلانـــە
مەلاحـــەت خەتمـــە ســـەرتۆ گەرچـــی وەك نێـــوت لـــە چـــاو دووری
لـــە بـــۆ شـــەوقی دوو کـــولمی پـــڕ فـــسوونت تـــازە دیوانـــە

لەسەر هەمان شێوازو نەسەقی دێڕەکانی پێشوو، ئەم دێڕانەی دوایی هاتوون، وەسف‌و ستایشی جوانی دڵبەر دەکەن، ڕەنگە شاعیر لە توانایدا هەبێت، یاخود سۆزو جۆش‌و خۆشەویستیەکەی هاندەری بێت چەند وێنەیەکی دیکەش لە باخچەی جوانی یارەکەی بهۆنێتەوە، بەڵام لە ڕستەی یەکەمی دێڕی کۆتایی ئەو ئامانجەی پێکاوە (مەلاحەت خەتمە سەرتۆ)، ئیتر حەقی خۆی داوەتێ‌و دوایی بە تێکستەکە هێناوەو وەك عەرەب دەڵێ (حسن الختام)ی بەجێهێناوە.

شەوقی قەسیدەیەکی هەیە بەنێوی (تەحەسوری جەوانی‌و تەرانەیی وەتەن) کە لە (٢٢) دێر پێکهاتووەو درێژترین تێکستی شاعیرە. ئەم قەسیدەیە لە سەرەتایەوە تا دوایی لە دەوری بابەتێکی فەلسەفی دەخولێتەوە کە ئەویش (فەلسەفەی عەشقی ئیلاهییە)، ئەگەر بە گوێرەی ئەو ئینتیباعەی لە ئاکامی خوێندنەوەی قەسیدەکە لای خوێنەر دروست دەبێ، قسە بکەین، دەبێ بڵێین کە ئەم تێکستە بەرەنجامی هەستێکی قووڵ‌و سۆزێکی ڕاستەقینەیە سەبارەت بە ژیان‌و بە سروشت. ئەمەش شتێکی ئاسان نییە کاتێك (لە تێکستی لیریکدا تەعبیر لە هەستێکی ڕاستەوخۆی شاعیر دەکرێت کە دیاردەیەکی تایبەت بە ژیان‌و بە سروشت لە دەروونی شاعیردا وروژاندویەتی، گرنگ لێرەدا نە خودی ئەو هەستەیەو نە تێگەیشتنە نێگەتیڤەکەیەتی، بەڵکو کاردانەوە پەنهان‌و ناوەکییەکەی ئەو ئینتباعەیە کە لە دەرەوە بەرپا دەبێت).[13] لە قەسیدەکەدا هاتووە:

بەبێ تۆ عالەمی دڵ، غەرقی دەریای یەئس‌و حیرمانە
تەماشاکە شەپۆلی ئەورۆ چلۆن سەر ڕێژی چاوانە

عەجەب تۆفان دەرە حیسی شەبابم، هەڵدەچی دایم
لە قەڵبی پڕ خرۆش ئەسرینی چاوم لەعلی ڕوممانە
دەئافاقی ئەمەڵ ئەورۆ سەرابە وەسڵی تۆ دوورە
لە بۆیە فەلسەفەی ژینێ لە بۆ من بۆتە ئەفسانە

ئەو نوختەیەی شاعیر دەبەر چاوی گرتووە، جوانی‌و خۆشەویستی وەسڵی یارە، یار بە مەعنای حەقیقی واتە (مەعشوق)، شاعیر (عاشق)ەوە پەروەردگاریش (مەعشوق)، کە

---

(13)موسوعة نظرية الادب — الشعر الغنائي: ٦.

جووتە بنەما بنەڕەتییەکەی (سۆفیزم) پێکدەهێنن. مەبەستی بەرودوای شاعیر (وەسڵ)ی مەعشووقەکەیەتی:

جوانیو نەشئەوو شەوقی حەیاتم بێ تۆ بەربادە
بەهار رابردو هاوین هاتو پایز وەقتی زستانە

خولاسەی مەقسەدی من زولفی کاڵ بوو بۆیە لێم گێژە
سەراپا فیکرو حیسسم میسلی زوڵفی خاوی جانانە
لە شەریانو وەریدی جیسمی فانی من وەکو خوێن
مەلالی چاوی مەخموورت دەکا دەورانو سەیرانە

شاعیر شێوازو کەرەستەو دەربڕینی دڵداری ئاسایی وەکو (زوڵفی کاڵ، زولفی خاوی جانان، مەلالی چاوی مەخموور...) دەکاتە زمانی دەربڕینی عەشقە راستەقینەکەی تا دەڵێ:

بەڵێ هەللاجمو ئەورۆ ئەسیری رەنگی بێ رەنگیم
بەسەودای تۆوە مەستم، چونکە چاوت داویە پەیمانە
ئەسیری حوسنی تۆ چۆن مەعکەسی ئەنواری لاهوتە
لەتاریکی وجوود کونجی ناسووت رۆژی تابانە
چرای فکرم لەوێ دایم دەکاتن ئیقتیباسی نوور
میسالی پیری مەیخۆران لە جامی لەعلی مەیخانە
لەسەحرای مێرغوزاری عالەمی ئەرواحی عیللییین
شەهنشەهـ بوو خەیاڵی فیکری سەربازم تاقانە

لەو دێڕانەی سەرەوە شاعیر بە هەستو سۆزو زمانو زاراوەی راستەقینەی فەلسەفەی سۆفیزم دەدوێ زاراوەکان - کە هەر یەکەیان لە وێنەی سیمبۆلێکەو وێنەو کێشەیەک لە دنیای سۆفیزم دا دەوروژێنێ:

هەللاج، ئەسیری رەنگی بێ رەنگی، مەعکەسی ئەنوار، لاهووت، وجوود، ناسوت، ئیقتیباسی نوور، پیری مەیخۆران، جام، عالەمی ئەرواحی عیللییین، شەهنشەهـ، خەیاڵ.....)، ئەم وێنەو سیمبۆلانە بە زنجیرە بە دوای یەکتریدا دێنو یەکێتییەکی مەعنەویو مەنتیقی بالا بۆ تێکستەکە فەراهەم دەکەن:

چلۆن تەبعی بەشەر مەخلووتی خاکی پاکی تینەت بوو
هبووتی کردووە فیکرو روحم هاتۆتە هێلانە

لـــەنێو دنیـــای خـــەیاڵم هەڵبــــژاردەی پاشـــی تــــەدقیق
لـــە جــــەرگەی ئاســـیادا مەئمـــەن و مــــەئوای شـــاهانە

مەلی روحی شاعیر لـە ئاسمانـەوە دادەبەزێتـە سـەر زەوی بـۆ نـاو ئـەو هێلانـەیـەی کـە ئارامی و ئاسوودەیی بە رۆحی شاعیر دەبەخشێ. ئەو هێلانەیەش لەسـەر زەوی خـاکی پاکی نیشتمانە، خاك لەگەڵ سروشت و تەبیعەتی ئادەمیزاددا یـەك دەگرێتـەوە، خـاك یەکێکە لەو رەگەزە بنچینەییانەی کە لە (خـەلق و تـەکوین)ی لەشـی زینـدووی مـرۆڤ بەشداره، بـەپێی تێڕوانینـی فەلسەفەی کۆن، هـەر تـەنێکی زینـدوو لەوانـەش تـەنی مـرۆڤ پێکهاتـەو ئاوێتـەی هـەر چوار رەگـەزی (خـاك، ئـاو، ئـاگر، بـا)یـە. بۆیـە سـۆزو خۆشەویستی گیان و لەشی مرۆڤی عاشق و سەوداسەر بۆ (خـاك) شـتێکی ئاسـاییە، کـە هات و ئەویش (خاکی پـاکی نیـشتمانی دایـك) بێـت ئـەوا سـۆزو عەشقەکە بـەتین تـر دەبێت.

لـــەوێ تێـــر ئـــاو دەبـــێ خولیـــای جـــوانی و رووحـــی غـــەمگینان
ئوفـــوولی ئەرغـــەوانی رۆژی رووی پـــاش مـــانگی تابانـــــە

کـــە خـــاکی پـــاکی وی لانکـــە لـــە بـــۆ ئێـــسقانی بابیرمـــان
لەســـەر قـــەبری جـــەوانان دیـــدەیی شـــللێرە گریـــانە.

خـاکی پـاکی نیـشتمان لـە وێنـەی بێـشکەیەو بـە میهرەبـانی لـەش و ئێسك و بروسـکی مرۆڤ دەگرێتە خۆی چونکە پەروەردەی خۆیەتی، لە کاتێکدا (گیـان)ەکـان بـۆ ئاسـمان هەڵـدەفڕن، لەســـەر خـــاك یادگـــارێکیش بـــۆ مـــرۆڤ بـــەجێ دەمێنـــێ کـــە ئـــەویش گلکۆکەیەتی.

ئـــەوێ مـــوڵکی قـــەدیم و مەوتـــەنی ئەجـــدادی پێـــشووتە
بـــە مـــەردی مەیروخێنـــە چـــۆن حـــەریمی مـــوڵکی بابانـــە

بـــە عـــیلم و مەعریفـــەت تێـــر ئـــاو بکـــە فیکـــری جوانیـــت تـــا
دەگـــەل شـــەوقی بـــە جووتـــە موتـــەفیق بـــن مـــەردو مەردانـــە

ئێسك و بروسکی باب و باپیرانیش لە هێلانەی ئەو خاکەدا گیرساونەتەوە، بۆیە بۆتـە مـوڵکی قـەدیم و مەوتـەنی ئەجداد. دەسـابا تێـر ئاوببـێ بـە زانـست و مەعریفـەتی عەشق و جوانی.

# بـــــــاســـــی دووەم

## ئـــاوازی شـــــیعری

ئاوازی شیعری یەکێکە لە رەگەزە پێکهێنەرەکانی شیعر، لە راستیدا ئەرستۆ خۆی شیعر بە زادەی دوو بنەمای سەرەکی دادەنێ، کە هەردووکیان لە سروشتی مرۆڤدا هەن، یەکەمیان لاسایی کردنەوەو ئەوەکەی دیکەیان ئاوازە.[14]

لە رەخنەی تازەدا ئاواز یەکێکە لە رەگەزە پێکهێنەرەکانی شیعرو لە راستیدا شیعر خۆی بریتییە لە (ئاوازی بێژەو وتەو واژەکان).[15] خودی ئاخاوتن خۆی لەکاتی ئەنجامداندا جۆرە ئاهەنگێکی هەیەو هەر کاتێك ئاهەنگی وشەو بێژەکان بەشێوەیەکی موتەناسیبو رێكو گونجاو دووبارە بوونەوە کێش دروست دەبێت. لێرەدا (کێش دەبێتە بەرەنجامی ئەندازەو پێوانەیی ئاوازی شیعر).[16] لەمەوە پێوەندی پتەوی بەیەکەوە بەستراوی نێوان شیعرو ئاوازمان بۆ روون دەبێتەوە. لەهەمان کاتدا ئەوەشمان لا ئاشکرا دەبێت کە هەر گۆڕانێك لە ئاوازدا گۆڕانێك لە کێش بەرپا دەکاو کێشەکانیش هەریەکەیان خاوەنی ئاوازو ئاهەنگێکی تایبەت بە خۆیان دەبن. سەبارەت بە هەڵبژاردنی کێشی شیعریش، شاعیران جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هەڵبژاردنی کێش بە مەیلو ئارەزوو نییە، بەڵکو ئەوە بابەتو سۆزە کاتێ لای شاعیر کامل دەبێو دەورووژێ ئەوا بۆ خۆی ئاهەنگو ئاوازێك (کێشێك) هەڵدەبژێرێ لەو چوارچێوەیەدا سەردەکا،[17] خاڵێکی دیکەش هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت ئەویش ئەوەیە کە ئاوازو مۆسیقای شیعر تەنها تایبەت نییە بە جۆری کێشەکانی شیعر، وەك ئەوەی عەرووزی یا برگەیی یا جۆرێکی تر بێتو بەواتا ئاوازی دەرەوە، بەڵکو جۆری پێکهاتو پەیوەندی وشەکان لەگەڵ یەکتریو ریتمەکانی شیعر ئاوازێکی دیکەی سەیری لێ هەست پێ دەکرێت کە لە ئاوازی کێشی

---

(14) هونەری شیعر: ٢٢

(15) موسیقی شعر: ٤٤

(16) فرهنگ اصطلاحات ادبي: ٥١٨

(17) هەواری خالی: ٨٤.

شیعر کەمتر نییەو بە ئاوازی ناوەوە دەناسرێت.[18] لەمەوە دەردەکەوێت کە بنیاتی ئاوازی شیعر دوو لایەنی هەیە:

١. ئاوازی دەرەوە: پەیوەستە بە کێشی شیعرەوەو تایبەت دەبێت بەجۆری شیعری کێشراو (الموزن)، جا چ عەرووزی بێت یاخود بڕگەیی.* لەم ئاستەدا دۆخی (نەزمی) شیعر مەبەستەو پەیوەندی راستەقینەی بە کێشی شیعرەوە هەیەو لەمەوە چەمکی کێش بریتییە لە هاوژمارەیی بڕگەکان لە هەردوو نیوە دێڕی شیعردا.[19] واتە مۆسیقای دەروە لە ئەنجامی هاوکێشی هەردوو نیوە دێری شیعردا دروست دەبێت.

٢. ئاوازی ناوەوە: پەیوەندی بە ریتمو ئاهەنگی وشەکانەوە هەیەو لە رێگەی رادەی گونجانو هاوئاهەنگی پێکهاتەی وشەکان لە لایەنی دەنگو فۆنیمو بڕگەکان جێبەجێ دەبێت. عەزیز گەردی دەڵێ: (ریتم لە جۆشانی دەروونەوە دروست دەبێو لە قاڵبی کێشەکانەوە گەڵاڵە دەبێو بە سیستمی دەنگسازیو زمانەوانی دەردەبڕێ).[20] سەبارەت بە شیعری عەرووزی لەم ئاستەدا هەر ئەوەندە بەس نییە کە نیوە دێڕەکان لە بڕگەدا هاو ژمارە بن بەڵکو دوو مەرجی دیکەش پێویستە:

یەك/ پێویستە هەر چەند بڕگەیەك (٣، ٤، ٥)، لە کۆمەڵەیەکدا کۆببنەوەو یەك بگرن بۆ پێکهێنانی هەنگاوەکان (التفعیلە).

دوو/ پێویستە هەنگاوەکان لە نیوە دێری یەکەمو دووەمی شیعردا هاوتا (متناچر) بن، واتا لە رووی جۆرو ژمارەو ریزبوونەوە وەکو یەك بن، هەر بەو سیستمەش لە دێڕەکانی دواتردا دووبارە ببنەوە.[21] لە رەخنەی تازەدا باس لە (ئاوازی لاتەنیشت — الموسیقی الجانبیە) هاتۆتە ناوەوە کە بە (سەروا)ی شیعرەوە بەستراوەتەوە، لە تەك ئاوازی دەرەوەی کێشو ئاوازی ناوەوەی وشەکان، ئاوازی سەرواش مایەی لێکۆڵینەوەو سەرنجدانە، تەنانەت رەخنەگرێکی وەکو د. شەفیعی کدکنی دەڵێت (یەك لە گرنگترین هۆکارەکانی بایەخی سەروا لایەنی مۆسیقاییەکەیەتی).[22] ئەو لای وایە کە

---

(18) موسیقی شعر: ٥٠

* لەبەرامبەر دوو جۆرەکەی شیعری کێشراودا، دوو جۆری تری شیعرمان هەیە کە کێشییان نییە، وەکو شیعری سەربەستو پەخشانە شیعر.

(19) کێشو ریتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی: ١٦٩.

(20)کێشی شیعری کلاسیکی کوردی: ٧٧.

(21) کۆ وانەکانی کێش ناسی،د. محمد بکر،١٩٩٤.

(22) موسیقی شعر: ٥٢

سەروا جۆرە تایبەتمەندییێك بە شیعر دەبەخشێو بۆ پشت راستکردنەوەی رایەکەی دەڵێ: ئەگەر دوو قەسیدە بە هەمان مەبەستو هەمان کێش بهۆندرێنەوە، بەڵام سەروایان جیاوازبێت ئەوا کاریگەریشیان جیاواز دەبێت. ناوبراو بە راگواستن لە (دکتۆر شەوقی چیف)وە دەڵێ: ئەو جۆرە (ترجیع)و کەرتکردنەی لە هەندێ دێرە شیعری عەرەبیدا دەکرێت، جۆرێك لە مۆسیقای لاتەنیشتی زۆر بەهێز بە شیعرەکە دەبەخشێ. بۆ نموونە لەم دێرەی امرو القیس دا:

مكَرٍ ، مفرٍ ، مُقبلٍ ، مُدبرِ معاً

كجُلمودِ صَخرٍ ، حَطَهُ السَيلُ منْ عَلِ

بۆیە ئەو سەروا ناوەکیانە رۆڵێکی مۆسیقایی زۆر بەهێزیان هەیە.[23] هەروەکو کامیل ژێر ئاماژە بۆ رۆڵی گرنگی ئاوازەیی سەروا بە راگواستن لە دکتۆر ئیبراهیم ئەنیسەوە کردووەو دەڵێ: (سەروا توخمێکە لە توخمەکانی بینای هەڵبەست، سەروا نرخێکی مۆسیقایانەیە کە ژمارەیەك دەنگ لە کۆتایی دێرەکانی هەڵبەستدا دووبارە ئەبێتەوە. ئەم دووبارە بوونەوەیەش بەشێکی گرنگ دروست دەکات لە مۆسیقای هەڵبەست. سەروا وەك نێوەندە مۆسیقاییەکانە کە گوێگر چاوەڕوانی دووبارەبوونەوەیان ئەکاتو چێژێك وەرئەگرێ لەو جۆرە دووبارە بوونەوانە کە لە پەردەی گوێ ئەدات لە ماوە کاتییە رێكو پێکەکان).[24]

لەم تێروانینەوە، بە پێویستمان زانی لە باسی ئاوازی شیعریدا بڕگەیەکیش بۆ مۆسیقای لاتەنیشت تەرخان بکەین کە تایبەتمەندییەکانی لەلایەنی سەرواو رەدیفو کەرتکردن لە شیعری شاعیرانی ماوەی باسەکەی ئێمەدا رەنگی داوەتەوە.

ئاوازەی دەرەوە : کێشی شیعری:

ـ لە بەرهەمی مەلا مارفی کۆکەیی:

بەو هۆیەی شیعری کلاسیکی کوردی هەر لە کۆنەوەو لە سەردەمی بابە تایەرەوە لەباری کێشو قافیەدا پێڕەوی لە عەرووزی عەرەبی کردووە، بۆیە کێشو قاڵبە کێشەکانی عەرووزی بەهەمان پێودانگ لە شیعری شاعیرانی ناوچەی موکریانیشدا رەنگی داوەتەوە. ئەوەی لەم بوارەدا بە زەقی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە برێك لەو کێشە عەرووزیانە لە نموونەی (هەزەج، رەمەل، موزاریع، سەریع) بوون بە کێشی

---

(23) سەچاوەی پێشوو: ٥٣

(24) بەرگری لە هەڵبەست، گ/ رۆشنبیری نوێ، ژ/١٣٦: ١١١.

باوی ناو شیعری کوردیو شاعیرانی کورد زیاتر ئاوڕیان لێ داوەتەوە.[25] هەروەها وەکو هەوڵێك بۆ خۆ بواردن لە کۆتو بەندی قورسی ئەم کێشانە شاعیرانی کورد زیاتر بەلای مەجزوئاتی ئەم کێشانەوە چوونو بەکاریان هێناون.[26]

هۆکاری ئەم ئاراستەیەش بۆ دوولایەن دەگێڕنەوە: یەکیان ئەوەیە کە ئەم کێشانە (زۆرتر دەنگونجێن لەگەڵ خەسائیسی فۆنەتیکی زمانی کوردیدا).[27] دووەمیش ئەم کێشانە لە رووی ئاهەنگو ئاوازەوە گورجو سووكو سافو بە ئاهەنگنو لەگەڵ زەوقی گۆرانی ویستی کوردیدا گونجاون).[28]

لەمەوە ئاوڕێك لە بەرهەمی شیعری مەلا مارفی کۆکەیی دەدەینەوەو بەو مەبەستەی وێنەکە لەلامان روونتر بێت لێرەدا ئامارێك نیشان دەدەین، کە لەژێر رۆشنایی دیوانی شاعیروبە پشتیوانی (رابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی:ل ٥٤٣ – ٥٤٨ ) رێکخراوە:

| زنجیره | کێش | قاڵبە کێش | ژمارەی پارچە | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|
| ١. | هەزەج | | ٢٢ | ٪٤٩,٩ |
| | أ. | هەزەجی هەشتی تەواو | ١٤ | |
| | ب. | هەزەجی ٨ ی ئەخرەبی مەکفووفی | ٤ | |
| | ج. | مەحزووف | ١ | |
| | و. | هەزەجی ٨ ی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ١ | |
| | هـ. | هەزەجی ٨ ی ئەخرەب | ١ | |
| | و. | هەزەجی ٨ ی مەحزووف | ١ | |
| | | هەزەجی ٦ ی مەقسوور | | |
| ٢. | رەمەڵ | | ١٦ | ٪٣٢ |

(25) کێشی شیعری کلاسیکی کوردی: ١٣٨

(26) دانیشتنێك لەگەڵ گۆران، گ/ بەیان، ژ/٢: ٥ .

(27) سەوداو سنوور: ١٥٩.

(28) کێشو مۆسیقای هەڵبەستی کوردی: ٦٧.

| ژ | | کێش | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | أ. | رەمەڵی ٨ی مەحزووف | ١٣ | | |
| | ب. | رەمەڵی ٨ی مەخبوونی ئەسڵەم | ١ | | |
| | ج. | رەمەڵی ٨ی مەقسوور | ١ | | |
| | و. | رەمەڵی ٦ی مەحزووف | ١ | | |
| ٣. | موزاریع | | | ٦ | ٪١٠,٩ |
| | أ. | موزاریعی ٨ی ئەخرەبی مەکفووفی | ٥ | | |
| | ب | مەحزووف | ١ | | |
| | | موزاریعی ٨ی مەکفووفی مەقسوور | | | |
| ٤. | موجتەسر | | | ٢ | ٪٣,٩ |
| | أ. | موجتەسی ٨ی مەخبوونی مەقسوور | ١ | | |
| | ب | موجتەسی ٨ی مەخبوونی ئەسڵەم | ١ | | |
| ٥. | خەفیف | | | ٢ | ٪٣,٩ |
| | أ. | خەفیفی ٦ی مەخبوونی مەحزووف | ٢ | | |
| | | | | ٥٠ | ٪١٠٠ |

لەمەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کەوا:*

ـ سەرجەمی شیعری مەلا مارف لەسەر (٥) کێش و قاڵبە کێش هۆنراوەتەوە.

ـ کێش و قاڵبەکێشە باوەکانی (هەزەج و ڕەمەڵ) لە ٨٠٪ی بەرهەمی شاعیریان داگیر کردووە، ئەم دوو کێشە لە بازنەکانی خەلیلدا سەر بە بازنەی (موجتەلیب)ن.[29]

---

★ ئەم خشتەیە لەژێر ڕۆشنایی دیوانی شاعیردا ڕێکخراوە، لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ دوو هەڵە بکەین کە (ڕابەری کێشی کلاسیکی کوردی) تێی کەوتووە:

١. هەردوو قەسیدەی (سێڵاوی بەدبەختی، بەزمی فەغفور) کە لە سەر کێشی هەزەجی هەشتی تەواون، دووجار حیساب کراون.

٢. پارچەیەکی چوار بەیتی لە دیوانەکەدا هەیە بەناوی (دۆزەخ و جەنەت) لە ڕابەردا پەڕێندراوە. بەمە سەرجەمی بەرهەمی کۆکراوەی شاعیر دەبێتە (٤٩) پارچە.

٣. لەو نوسخە دیوانە چاپکراوەی لەبەردەستە، دوو لاپەڕەی (٦٧ -٦٨)ی تیادا نییە.

بڕوانە:

ـ دیوانی مەلا مارفی کۆکەیی: ٣٦-٤٠، ٨٤ — ٩١.

ـ ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی: ٥٤٣ — ٥٤٧.

(29) کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی: ٥٦.

- ئەم دوو کێشەو باقی کێشەکانی دیکەش لە بەرهەمی شاعیردا پەیڕەویکراون، زۆرتر بایەخ بە قاڵبە کێشەکان بەواتە (مەجزوئاتی) کێشەکان دراوە.

- بەپێی (رابەری شیعری کلاسیکی کوردی) هەزەج (٢١) قاڵبە کێشی لە دیوانی شیعری کلاسیکی کوردیدا بەکارهاتوون، کەچی لای مەلا مارف ئاوڕ لە (٦) قاڵبی ئەو کێشە دراوەتەوە، کێشی رەمەلیش بەهەمان ئەندازە (٢١) قاڵبە کێشی بەکارهاتوون و لای مەلا مارف ئاوڕ لە (٤)یان دراوەتەوە.

موزاریع و موجتەس کە لە بەرهەمی مەلا مارفدا هەریەکەیان دوو قاڵبە کێشی لێ بەکارهاتووە، بەڵام یەکەمیان خاوەنی (٦)و دووەمیان (٥) قاڵبە کێشن.

شاعیر یەك بەرهەمی تاقانەی لەسەر کێشی خەفیف هۆنیوەتەوە کە خۆی خاوەنی (٥) قاڵبە کێشە.[30]

**کێش لە بەرهەمی سەیفی قازیدا:**

بەرهەمی شیعری کۆکراوەی سەیف لە دیوانەکەیدا بریتییە لە (٢٤) پارچە، لەوانە (١٨) پارچەی عەرووزییە کە یەکێکیان بریتییە لە تاکە بەیتێك، ئەوانی دیکەش لەنێوان غەزەلی (٥) بەیتی تاوەکو قەسیدەی (٥٩) دێری تیایەو قاڵبی کێشە عەرووزییەکانی دیوانی شاعیر بەم شێوەیەیە:

| زنجیرە | کێش | قاڵبە کێش | | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١. | هەزەج | | | ١٢ | ٪٦٦,٦٦ |
| | أ. | هەزەجی ٨ی تەواو | ٥ | | |
| | ب. | هەزەجی ٨ی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٢ | | |
| | ج. | هەزەجی ٨ی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ١ | | |
| | و. | هەزەجی شەشی مەقسوور | ٢ | | |
| | هـ. | هەزەجی شەشی مەحزووف | ٢ | | |
| ٢. | موزاریع | | | ٥ | ٪٢٧,٧٧ |
| | أ. | موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٤ | | |
| | ب. | موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ١ | | |
| ٣. | ڕەمەڵ | | | ١ | ٪٥,٥٥ |
| | أ. | ڕەمەلی هەشتی مەحزووف | ١ | | |
| | | | | ١٨ | ٪١٠٠ |

---

(30) رابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی: ١٥ -٣٩.

| ڕێژه | ژماره | قاڵبه کێش | کێش |
|---|---|---|---|
| | ٦ | ده برگەیی (٥ + ٥) له هەر نیوه دێرێکدا | کێشی بڕگەیی |

لەگەڵ کەمیی بەرهەمی شاعیردا، کێش‌و قاڵبه کێشه بەکارهێنراوەکانیشی کەمن، له هەزەج (٥)و له موزاریع (٢)و له ڕەمەل تەنها (١) قاڵب. ئەوەی مایەی سەرنجه له بەرهەمی شیعری سەیفی قازی، ئەوەیه که شاعیر جگه له بەرهەمه عەرووزییەکانی ئاوڕی له کێشی بڕگەییش داوەتەوەو کۆمەڵێك له شیعرەکانی لەسەر ئەو جۆره کێشه هۆنیوەتەوە. د. خەزنەدار ئاماژەی بەم لایەنه کردووەو دەڵێ: (حەسەن هەردو کێشی عەرووزی‌و سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە).[31] ئەم نەریتەی بەکارهێنانی کێشی برگه یاخود (سێلاب) له پێش سەیفیشدا لای شاعیرانی موکریان‌و یەکێکی وەکو وەفایی ئاوڕی لێدراوەتەوە، وەکو چۆن له شیعری شاعیرانی دیکەدا له وێنەی (مەولەوی‌و وەلی دێوانەدا) پەیڕەوی لێ کراوە.[32]

بۆ مەسەلەی کێشی جۆری دوایی شیعرەکانی سەیفی قازی چەندوچونێك نییه که سیستمی بڕگه یاخود (سێلاب) وەڵامدەرەوەی تەواوی پرسەکانی کێشداری ئەم بابەته هۆنراوانه دەبێتەوە، (واته پارچەکان لەباری کێشەوه دروست‌و ڕێکن) به بەراورد لەگەڵ شیعری فۆلکلۆری کوردیدا، وەڵێ مەسەلەیەك هەیه که له ڕەخنەی تازەی کوردیدا وروژێندراوەو پوختەکەی ئەمەیه، که ئەم جۆره شیعره بڕگەییانەی شاعیرانی کورد له ئاستی (ڕیتم)و ئاهەنگدا له شیعری فۆلکلۆری کوردی جیادەبنەوە،[33] بۆیه ناوبردنیان به (خۆماڵی) ڕەنگه کارێکی ئاستەم بێت، بەڵام ئەم بۆچوونه له ڕەسەنایەتی‌و کۆنیی ئەم جۆره کێشه کەم ناکاتەوه که له زمانه ئێرانییەکاندا مێژووی بۆ سەدەکانی بەر له ئیسلام دەگەڕێتەوە. شیعره بڕگەییەکانی سەیف له ڕووی زمان‌و زاراوەو شێوازەوه ڕەوان‌و سادەو ساکارن‌و له بەرگی شیعری میللی‌و خۆماڵییەوه نزیکن، سیستمی کێش لەهەر نیوه دێرێکدا (٥ + ٥) بڕگەیه، له

---

(٣١) مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٥ : ٣٤٤

(٣٢) عەرووزی کوردی: ٩٠.

(٣٣) کێش‌و ریتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی: ١٠٥ -١١٢

هەندێکیاندا یەکێتی قافیە پارێزراوە، هەندێکی تریش بەپێی سیستمی جووت سەروا (مەسنەوی) هۆنراونەتەوە، وەکو لەم نموونانە بەدیار دەکەوێت:

زولفی وەك شەوەی، رۆژی کردمە شەو
چرای سەر کولمەم لە بۆ رادێرە
لە باغی حوسنت وەختی زەکاتە
فەقیری خۆتم هەر بۆ من خێرە
بە رستەی زولفان دڵم نێچیرە
لە دارو بەردی بەس دە مەیگێڕە
هەر کەس عیشقی تۆی لەسەر دانەبێ
بێ شك حەیوانە پڕو پانێرە
ئەوانە شیعرن عەزیز بە مەرگت
موخلیست بێ تۆ وەجاغی کوێرە

سیستمی کێش لە نیوە دێڕەکاندا بەم شێوەیە دامەزراوە:

زول فی وەك شە وەی　　رۆ ژی کرد مە شەو
- ب - ب –　　- ب - ب –
(٥ + ٥)

چ رای سەر کوڵ مەم　　لە بۆ را دێ رە
ب – – – –　　ب – – – ب
(٥ + ٥)

لەمەوە تێبینی ئەوە دەکرێت کە پارچەکە لەگەڵ پاراستنی یەکێتی قافیەشدا کە زیاتر ئەدگارێکی شیعری عەرووزییە، بەڵام سیستەم و چۆنیەتی ریزبوونی بڕگە کورت و درێژەکان لە هەنگاوەکانی نیوە دێڕەکاندا لەگەڵ سیستمی (تەفعیلە) تێك ناکاتەوە. بۆیە ئەم جۆرە هۆنراوەیە پێویستە لە دەرەوەی شیعری عەرووزیدا حسابی بۆ بکرێت.

لە پارچەیەکی جووت قافیەدا دەڵێ:

دەردی بێ دەرمان هەر دووری تۆیە
بە بایەك دەمرم دەژیم بەو بۆیە
هێندەم تەماشای رێی هاتنت کرد

چـــاو خێـــل بـــوو لەســـەر ســـەربان و ســـەرگرد
ژیـــان بـــە بۆنـــەی عـــەزیزم خۆشـــە
هـــەر کـــەس تـــۆی نـــەوێ بـــێ هـــۆش و گۆشـــە

دەر دی بێ دەر مان هەر دوو ری تۆ یە
ـ ب ـ ب ـ ـ ـ ـ ـ ب
(٥ + ٥)

بە با یەك دەم رم دە ژیم بەو بۆ یە
ب ـ ـ ـ ـ ب ـ ـ ـ ب
(٥ + ٥)

سیستمی کێش لە شیعری فۆلکلۆری کوردیشدا هەمان ڕێچکە دەگرێتەبەر وەك لەم نموونەیەدا دیارە:

گو ڵا لە سوو رەی سەر کوڵ می یا رم
ب ـ ب ـ ـ ـ ـ ب ـ ـ
(٥ + ٥)

وا گە شا یە وە بۆ حا ڵی زا رم
ـ ب ـ ب ب ـ ـ ـ ـ ـ
(٥ + ٥)

لەمەوە دڵنیا دەبین کە شیعرە برگەییەکانی سەیف لەگەڵ شیعری گۆرانی فۆلکلۆری کوردیدا لە باری کێشەوە لەسەر یەك سیستم دامەزراون.

## کێشی شیعری مستەفا شەوقی:

شەوقی بەرهەمی شیعری کەمە، ئەوەی تا ئێستا دۆزراوەتەوە لە دوو تویی نامیلکەیەکدا بڵاوکراوەتەوە، لە ژمارەی پەنجەی هەردوو دەست تێپەڕ ناکات. ئەگەر کێش ئەدگارێکی سەرەکی رووخساری شیعری بێت، ئەوا شیعری شەوقی لەباری کێشەوە پێڕەوی لە شاعیرانی کلاسیکی کوردی کردووەو شتێکی تازەی نەهێناوەتە ئارا. بەرهەمەکانی دەچنە خانەی شیعری لیریکی رۆمانسیانەوە، بۆیە شاعیر قاڵبە کێشێکی ئاوەزداری پشوو درێژی بۆ هۆنراوەکانی هەڵبژاردووە کە کێشی (هەزەج)ە،

بەتایبەت قاڵبە کێشە تەواوەکەی هەشت هەنگاوی، وەکو لەم نەخشەیەدا بەدیاردەکەوێت* :

| زنجیره | کێش | قاڵبەکێش | | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١. | هەزەج | | | ٨ | |
| | أ. | هەزەجی هەشتی تەواو | ٧ | | ٪٨٨,٨٨ |
| | ب. | هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ١ | | |
| ٢. | ڕەمەڵ | | | ١ | |
| | أ. | ڕەمەڵی هەشتی مەحزووف | ١ | | ٪١١,١٢ |
| | | | | ٩ | ٪١٠٠ |

وەکو خاوەنی (کێش‌و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی) ڕوونی کردۆتەوە، (هەزەج) خۆی لەلای عەرەب جۆرە گۆرانییەك بووە، لەبەر کورتیی بڕگەکان‌و سووکی کێشەکەی زۆربەی گۆرانی گوتنی عەرەبی بەم کێشە بووەو یەکێکە لە کێشە بڵاوەکانی شیعری فارسی‌و لای ئەوان گەڵێ لق‌و پۆپی لێ بۆتەوە.[34] لە دیوانی شیعری کلاسیکی کوردیدا پایەی یەکەمینی هەیە، هەر شاعیرێکی کورد کە شیعری عەرووزی گوتبێ بەدی ناکەین شیعری لەسەر ئەم کێشە نەبێ. ئەم کێشە نەفەس درێژی‌و توانای دەربڕینی بە شاعیر داوە تا وێنە ئیستاتیکییەکانی (سروشت‌و جوانی‌و نیشتمانی) پێ بکێشێت. تەنانەت تاکە قاڵبە ناتەواوەکەشی (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف)، ڕیتم‌و ترپەیەکی ئاوازی خۆماڵی پێداوەو قاڵبێکی بە جۆشی گۆرانی ئامێزەو خۆی لە

بەدوای یەکدا هاتنی دوو بڕگەی درێژو دوو بڕگەی کورت لە دێرێکی چواردە بڕگەییدا پێك دێت:[35]

---

* کاتێك نامیلکەی شیعرەکانی مستەفا شەوقی‌مان خستە بەردەست، د. عەزیز گەردی بە سوپاسەوە کێش‌و قاڵبەکێشەکانی بۆ دەستنیشان کردین.

(34)کێش‌و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی: ٦٧.

(35) سەرچاوەی پێشوو: ٧٤.



وەستان و پشوودان لێرەدا، نە لەسەر بنەمای رێکی تەواوی برگەکان و نە لەسەر بنەمای تەفعیلەکان دەبێت، بەڵکو بە گوێرەی بنیاتی سیمانتیکی گرێ و رستەکان دەبێت، بەم شێوەیە:

خەملێوە لەسەر ( ــ ــ ب ب ــ )،

قەبری جەوانان ( ــ ب ب ــ ــ )،

گوڵ و لاڵە ( ب ب ــ ــ )،

یا سووریی خوێنە ( ــ ــ ب ب ــ ــ )،

کە بلێی ( ب ب ــ )،

رەنگەکی ئاڵە ( ــ ب ب ــ ــ )،

شەوقی تاکە غەزەلێکی لەسەر قاڵبەکێشی رەمەڵ هۆنیوەتەوە کە (رەمەلی هەشتی مەحزووفە)، کە شاعیرانی ناسک خەیاڵی وەکو مستەفا بەگی کوردی و حەریق هۆنراوەی ناوازەیان لەسەر هۆنیوەتەوە وەك:

- لە یلەکەی بێ مەیلەکەی مەحبووبەکەی عەییارەکەم

شۆخەکەی پڕ حەملەکەی بێ رەحمەکەی غەددارەکەم

کوردی

- چاوەکەم دوێنێ لە گوڵشەن گوڵ بەعیشوە خۆی نواند

نەك نمەك گیر بم بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەم دواند

حەریق

شەوقیش گوتوویە:

---

* بەپێی دەستووری عەرووز برگەی کورتی کۆتایی دێر حیسابی برگەی درێژی بۆ دەکرێت.

• ئەم بزوێنە کورتە لە کاتی درکاندندا ماوەی بزوێنی درێژی (ا) وەردەگرێت.

| بۆچ | دە نا | لێ | نی لە | سەر لێ | وت لە | بۆچ بار | کەو تو وە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| لەش ك | ری زوڵ | | فت کە خا | وو | کا ڵە | بۆچ رووی | گر تو وە |
| ـ ب ـ ـ | | | ـ ب ـ ـ | | ـ ب ـ ـ | | ـ ب ـ |
| فاعلاتن | | | فاعلاتن | | فاعلاتن | | فاعلن |

ئەم قاڵبە کێشەی رەمەڵ هەر لە کۆنەوە لای شاعیرانی کورد زۆر پەسەند کراوەو بەرهەمێکی زۆری شیعری کلاسیکی کوردی لەسەر هۆنراوەتەوە. رەمەڵ لە پەیڕەوکردندا لە شیعری کوردی بە پلەی دووەم‌و لە دوای هەزەجەوە دێت. حەوت پارچەکەی دیکە کە بڕی زۆری بەرهەمی شیعری شەوقییە لەسەر قاڵبە کێشی (هەزەجی هەشتی تەواو) هۆنراونەتەوە، کە لەبنەڕەتدا لای عەرەب لە شەش هەنگاوی (مفاعیلن) پێکدێ، لای کوردو فارس کراوەتە هەشت هەنگاو، بەمە ماوە لەبەردەم دەربڕینی شاعیر فراوانتر دەبێت بۆ ئەوەی وێنەو تەعبیری جوان‌و شاعیرانە بخاتە ناو چوارچێوەی دێڕەکانەوە، بە نموونە شەوقی دەڵێ:

| جەبین مینا | ی زیو گەردن | هوما خاڵ مش | کی تا تاری |
|---|---|---|---|
| شە دە شل چاو | بە کل روو سوو | رە گوڵ تەڕ ڕا | رو عەییا ری |
| ب ــ ــ ــ | ب ــ ــ ــ | ب ــ ــ ــ | ب ــ ــ ــ |
| مەفاعیلون | مەفاعیلون | مەفاعیلون | مەفاعیلون |

لە شوێنێکی دیکەشدا دەڵێ:

| بە بێ تۆ عا | لە می دڵ غەر | قی دەر یای یەئـ | سو حیر ما نە | (١٦ برگە) |
|---|---|---|---|---|
| تە ما شا کە | شە پۆڵ ئەو ڕۆ | چ لۆن سەر رێـ | ژی چا وا نە | (١٦ برگە) |
| ب ــ ــ ــ | ب ــ ــ ــ | ب ــ ــ ــ | ب ــ ــ ــ | |
| مەفا عیلون | مەفا عیلون | مەفا عیلون | مە فا عیلون | |

وەکو بەدیار دەکەوێت سیستمی عەرووزی شیعر رێگە لەوە ناگرێت کە هەردوو نیوە دێر لە لایەنی برگەوە لە هاوکێش بوونیان بڕوانرێت، ئەم خاسیەتە لە هەموو شیعری جیهاندا هەیە، بەڵام لەباری (ریتم)و (سترێس)ەوە سیستمەکان لێك هەڵاواردە دەبن.

ئاوازی لاتەنیشت: سەروا ـ رەدیف ـ سەروای ناوەوە:

لێرەدا مەبەست ئەوەیە رووناکی بخەینە سەر ئەو رۆڵەی کە هەر یەکە لە: سەروا، رەدیف (پاش سەروا)، سەروای ناوەوە، لەبنیاتی ئاوازەیی شیعردا دەیگێرێتو لە رووی پراکتیکییەوە لە شیعری ناوچەی موکریان کە مەبەستی باسەکەمانە نیشانی بدەین.
لە رەخنەی کۆندا سەروا دەخرایە پاڵ کێشو لە بواری ئاوازی دەرەوەی شیعر لێك دەدرایەوە، هەردوو هونەرەکەی (رەدیفو سەروای ناوەوە)یش لەگەڵ (جیناسەکانو زاراوەسازی) دەکرانە بنەمای مۆسیقای ناوەوەی شیعر.[36] ئێمە بە پەیرەوی لە تیۆرە تازەکانی زمانەوانی، کە لە ئاستی ئاسۆییدا لە وشەو گرێو رستە دەکۆڵێتەوە، واتە (تەوەری تەرکیبیو ئاستی تەولیدی زمان)ی شیعری،[37] کاتێك وشە لە سیاقی رستەیەکی شیعریدا جێگیر دەبێت بەرگی واتا زمانیو فەرهەنگییەکەی فرێ دەداو بە پەیوەندی لەگەڵ کەشو هەوای تازەو دەوروبەرەکەی لە دێرێکی شیعریدا دەلالەتی تازە پەیدا دەکات، بەو ئیعتیبارەش بەیت یاخود دێری شیعر یەکەیەکی سەربەخۆیە لە بنیاتی قەسیدەدا، بۆیە بنیاتی ئاواز لە ئاستی ئاسۆییدا دەبێتە پێویستییەکی سەربەخۆو جیا لە ئاوازی دەرەوەو ناوەوەی دێری شیعر.
جێگەی خۆیەتی گوتەیەکی جان کۆهین بهێنینەوە کە دەڵێ: (هەر یەکە لە کێشو لە ریتم هەمان ئەرکی سەروا دەگێرن، کە ئەویش ئەرکی دابین کردنی دووبارەبوونەوەی دەنگیان هەیە کە جەوهەری نەزم پێك دەهێنێ).[38]
سەروا – رەدیف – سەروای ناوەوە/ لە بەرهەمی مەلا مارف:
لە ئەدەبی عەرەبیدا زاراوەی (شعراو الدیوان) ئەو شاعیرانەی خاوەن دیوان دەگرێتەوە کە بەرهەمی شیعرییان لەلایەنی سەرواوە هەموو پیتەکانی ئەلفبای هیجایی زمانی عەرەبی دەگرێتەخۆ. لە شیعری کوردیدا هەرچەندە سەروەری شاعیرانی کورد نالی گوتویە: نالی ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە دیوانی هەیە. کەچی لە دیوانەکەیدا زۆر پیتو هیجا هەن کە ئاوڕی لێ نەداونەتەوەو بە شایانی ئەوەی نەزانیون بیانکات بە سەروای شیعرەکانی. لێرەدا مەبەست دوایین دەنگی دێڕە شیعرە کە وەکو ناسنامە بۆ سەروا سەیری دەکەین. چاوگێڕانێك بە دیوانی کۆکەیی ئەو

---

(36) بڕوانە:
ـ کلیات سبك شناسی: ٢١٦، ٢١٧.
(37) زبانشناسی ونقد ادبی: ١٠.
(38) بنیة اللغة الشعریة: ٤٦.

راستییه وەدەردەخات کە شاعیر سەرواکانی (٣/٢)ی بەرهەمی شیعری لەسەر دوو دەنگی بزوێنی درێژی (ی) کە لە (١٧) پارچەداو، بزوێنی کورتی (ە) لە (١٤) پارچەدایە دەمەزراندووە.(ی)ی بزوێنی درێژ وەکو لە نازناوەکەیەوە دیارە لە گروپی (حروفی مەد)ەو دەنگێکی نەرمی ئاوازدارەو لەکاتی درکاندا بەراحەتی دەتواندرێت درێژەی پێ بدرێت:

هەرچی زاراتی عەرزو عاسمانە
کوراتی بەر هەتاوی لانساری......
لە دێری رووپەڕەی دەورو زەمانی
بەهەر نەخشێ تماشاکەم دیاری.......
عەزیزی تۆ لەهەر لا خۆشەویستە
زەلیلی تۆ بە کەس نابەت قوتاری.....

لەهەر تێکستێکا شاعیر سەرواکەی لەسەر دەنگی (ی) دامەزراندبێ، ژمارەیەکی زۆری وشەی ئاهەنگداری دۆزیوەتەوە تا مۆسیقای قافیەکەی پێ برازێنێتەوە:

تەماعم بوو بکەم مەتحی خەلیفەی شاهی زەنبیلی
کە تێفکریم لە قووەت خاریجە تەشریحو تەفسیلی
سوئالم کرد لە نوستادی تەبیعەت بۆ چی بێدەنگی
گوتی چ بکەم تەخەیول ناکرێ تەسویرو تەشکیلی
فەقەت بیستوومە زۆر ئەهلی گوزەشتو عەفوو ئیغمازە
بە شەرتێ لێم نەرەنجێ حازرم بۆ خەتمو تەکمیلی

ددیوان: ٧١

شاعیر زۆربەی شیعرەکانی لە بابەت ستایشو هەجوو داشۆرینی لەسەر ئەم قافیە گوتون:

ئەی جەنابی شێخ دەزانم تۆ خەلیفەی بەر حەقی
وەك دەڵێن شەخسێکی ساحیب ئیحتیرامو رەونەقی
دەنگی زیکرو خەتمو تەهلیلت فەزای پڕ کردووە
زەلزەلەی خستۆتە خەیمەی بێ ستوونی ئەزرەقی
ئافەرین سەد ئافەرین بۆ غیرەتو بۆ هیمەتت
تۆ کە مەحسووری لە چوار لاوە کە چەپڵەت لێ تەقی
با وجوودی ئەم هەموو حەملەو فشارو گورگە ڕاو
مەرکەزت خالی نەکرد وەك شێر لە مەیدانێ چەقی

دیوان: ٧٨

هاتنی سەروا لە کۆتایی دێری شیعردا هێمای ئیست کردنو خۆئامادەکردن دەبێت بۆ دێڕی دواتر، ئەم وەستانو ئیستکردنە بایەخێکی ئاوازەیی هەیە، بەتایبەت لە کاتی پەیڕەوکردنی یەکێتی قافیە لەسەر لەبەری تێکستدا، بنیاتی یەکێتی مۆسیقایی سەرجەم قەسیدەو غەزەل دەپارێزێت، سەرباری ئەوەی خاسیەتی ئاهەنگو ئاوازەییەکەی یارمەتی بەیەکەوە گرێدانەوەی شیعرو گۆرانی دەدات.[39]

بزوێنی کورتی (ە)یش لە دەنگە نەرمەکانەو کاتێ لە کۆتایی دێری شیعر شوێن دەگرێتو گوێگر بە روونیو بە ڕەوانی وەری دەگرێت:

که حوسنی یارو ئەغیارم، لە میزانی خەیاڵم دا

بە دڵ دیتم، هەموو لایێکە، ئەو تەنیا لە لاییکە

خەزینەی روومەتی لەعلی، لەبو سیمی زەنەخدانی

گوتم بێ تۆ خودا بیدا، عەجەب گەنجو تەلاییکە

ئیشارەی کردە لامی زوڵفی، ئەلفی قامەتی، یەعنی

جەوابی قەددی داڵی تۆ، فەقەت لا مەل فەلاییکە

دیوان: ٢٥

رەدیف (پاش سەروا)، وشەیەکە دوابەدوای سەروا لە کۆتایی هەموو دێڕەکاندا دووبارە دەبێتەوە. بوونی پاش سەروا ئەندازەی ئاوازی دێرە شیعر بەرەو پێش دەبات، (بەو پێیەی هەر چەندێ تەرازووی هاوبەشی دەنگو وشەی سەروا بەرەو سەر بڕوات هەست بە ئاهەنگی زیاترو لە ئاکامیشدا بە چێژی زیاتر دەکەین)،[40] هەر بۆ نموونە با ئەم چەند دێرەی شاعیر بخوێنینەوەو گوێ بۆ دەنگو ئاوازی سەرواو پاش سەرواکەی هەڵخەین:

باز ئەوا شابازی فیکرم مەیلی پەروازی هەیە

بۆ شکاری لوتفی تۆ زۆری نییە نازی هەیە

هەوری تەبعم مایلی گریانو بەرقو بارشە

بۆیە گوڵ کەیفو دەماغێکی تەڕو سازی هەیە

موددەتێکە عەندەلیبی باغی شێعرم ساکیتە

لەم گوڵو گوڵزارە یەك دنیا، گلەو ڕازی هەیە

دیوان: ٤٩

---

(39) بنية الايقاع في الخطاب الشعري: ١١٣.

(40)موسیقی شعر: ٦٨.

له هەر یەکێك لە نیوەی کۆتایی نیوە دێرەکانی دووەمدا گرێیەکی بە ئاهەنگو ئاوازداری درێژی پڕ بە پشوو دووبارە بۆتەوە کە نەشئەو خۆشیەکی زۆرمان پێ دەبەخشێت:

............زۆری نییە نازی هەیە.

............ دەماغێکی تەڕو سازی هەیە.

............... یەك دنیا گلەو رازای هەیە.

لەلایەکی دیکەوە بوونی پاش سەروا ئاسۆ لەبەردەم شاعیریشدا والا دەکات بۆ تەداعیو هێنانەوەی وشەی پڕ مەعنای جوانو رێك، بە واتا ئەو سنوورو مەحدودیەتەی سەروا لەبەردەم شاعیر دروستی دەکات دەکاتەوەو شاعیر ئازادتر دەبێت، وەکو چۆن زمانی شاعیر دەکاتەوە لە ئاست هێنانەوەی تەرکیباتو رەگەزدۆزی دلگیر، هەروەکو لەم نموونەیەشدا بەدی دەکرێت:

عەینەکی عەینم عەزیزم من بە تۆ تەقدیم دەکەم

مەخزەنو میفتاحی قەلبی خۆم بە تۆ تەسلیم دەکەم

بۆ بە شارەت نەقدی جانو قیسمو ئەنواعی غەزەل

کامەیان چاکن بەوە بۆ تۆ ئەمن تەعزیم دەکەم

ئەوەلی شەو شێعری شوکرو نیوە شەو شێعری بەقا

ئاخیری شەو شێعری حوسنی عاقیبەت تەنزیم دەکەم

توتیی تەبعم بەیادی قەندی لوتفو سوحبەتت

شەککەر ئەفشانە منیش هەر شوکری تۆی تەعلیم دەکەم

دیوان: ٨٩

دیاردەی دەرکەوتنی چاوگی "بوون" و "هەبوون"[41] نموونەکانی وەکو (بوو، نەبوو، دەبوو، دەبێ، ئەبێ، هەیە، نییە.....) خاسییەتێکی وای بۆ زمانی کوردی بەتایبەت زمانی شیعر پێکهێناوە کە وەکو پاش قافیە، هەم لە پێناوی تەواوکردنی گوزارەو هەم زیادکردنی بڕەوی ئاوازی شیعری لەلایەن شاعیرانەوە بەکار ببرێت، تەنانەت شاعیرێکی وەکو نالی لە (٢١) غەزەلو قەسیدەیدا پاش قافیەی بەکارهێناوە لەوانە

(41) چاوگی بوونو هەبوون لە زمانی کوردیدا، گ/ رۆشنبیری نوێ، ژ/١٠٩: ٢٢٩.

ژمارەیەکیان پاش قافییەکانی کاری بوونو هەبوونن وەك، (هەیە، نییە، نەبوو، بوو...).[42] هەروەکو لەم نموونەیەی کۆکەییدا بەدیار دەکەوێت:

عەباییێکم هەبوو، ئەمما عەباییێکی گەلێ چا بوو

خەڵاتی حەزرەتی شێخ، یادگاری لوتفی مەولا بوو

لە نێو ئەهلی تەریقەتدا لیباسێکی موقەدەس بوو

لەکن ئەربابی مەعنی مەزهەری نووری تەجەللا بوو

لەحەددو رەسمی تامی چونکە عاجز بوو، قەڵەم نووسی

لە سەنعەت کاری شامو سورمەکاری تووری سینابوو

ئەگەر چی کاری ئوستادانی سەنعەت بوو لەواقیعدا

نموونەی سوندسو ئیستەبرەقی فیردەوسی ئەعلابوو

مەتاعێك بوو هەتا ئەورۆ لە زانستگەی عەبابافی

بە تەسدیقی موسەددیق، موفرەدێکی لا موسەننابوو

دیوان: ٢٨

شاعیر لەگەڵ ئەوەی ئاوڕی لەم هونەرە داوەتەوە، بەڵام رادەیەکی باوو بڵاوی نییەو تەنیا لە چوار پێنج دەقی شیعریدا بەدی دەکرێت.

سەروای ناوەوە: ئەوەیە کە دوو وشە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە رووی دارشتنو ئاوازەوە لەگەڵ یەکتری هاوپەیوەند بن.[43] سەجع لە کۆندا زیاتر لە پەخشانو مەقاماتدا سوودی لێ وەرگیراوە، بەڵام شاعیران بەمەبەستی بەرزکردنەوەی بنیاتی ئاوازو ئاهەنگی دێرە شیعر سوودیان لێ وەگرتووەو بەمە تەرازووی تەناسووبو گونجانی نێوانی وشەکانی هەردوو نیوە دێڕ بەرزتر بۆتەوەو کاریگەری زیاتری پێ بەخشیوە. کۆکەیی لە دێڕی دەستپێکی (تیپو سوپا)دا دەڵێ:

/ تماشا ئەمرو فەرمانی/ عەجەب/ فەرخوندە شاییێکە/

/ بنۆڕە سەففی موژگانی/ عەجەب/ تیپو سوپاییێکە/

نموونەی ئەم جۆرە سەجعە کە (هاوتەریببوون) (موازنە)،لە بنیاتی پێکهاتەی هەردوو نیوە دێڕەکەدا دیارە، دەبێتە (تەناسووبی دەستووری)، کە تیادا وشەی

---

(42) دیوانی نالیو فەرهەنگی نالی : ١١٧، ١١٣، ٨٧، ٨٨، ٨٩، ١١٤.

(43) زیباشناسی سخن پارسی: ٤٢.

هاوسەنگ‌و هاوکێش لە هەردوو نیوە دێڕەکەدا لە بەرامبەر یەکتر دەوەستن.[44] لە نموونەیەکی تری هەمان دەقدا هاتووە:

خەزینەی روومەتی لەعلی، لەبو سیمی زەنەخدانی
گوتم بێت‌و خـودا بیدا، عەجەب گـەنج‌و تـەلاییکە

لێرەدا هاوسەروایی تەنیا لەنێوان دوو بەشەکەی نیوە دێڕی یەکەمدا بەدی دەکرێت. لە قەسیدەی (سێلاوی بەدبەختی)دا هاتووە:

- لە زێرو زیوو نەغدینە/ لە گەنج‌و ماڵی زێڕینە
ئەوەی لەو شارەدا مابێ فەقەت ئیسـمی مهابادە

- لەبەر حوزن‌و تەئەسـوف ئەم قەسـیدەم بۆ تەواو نابێ
تەبیعەت گەرچی سەرشارە/ قەریحەش گەرچی نوستادە

- نەمن تەنها پەرێشانم هەموو کەس مات‌و غەمگینە
ئەوی مەسرورو دڵشادە/ فەقەت حەسسادو گەوادە

لەنیوە دێڕێکی هـەر یـەکێك لـەم دێڕانـەدا، شـاعیر پـەنای بۆ سـەجع بـردووە، بـەڵام نەگەیـشتۆتە پلـەی کـەرتکردنی تـەواو کـە بـە (تەرصـیع - گەوهـەر نیـشانی) دەناسرێت،[45] وەك ئەم نموونەیەی کە لە هەمان قەسیدەدا هاتووە:

/وەکو فەیئو غەنیمەت/ بۆ مەتاعی موفت‌و بێ قیمەت/
دەیان هێنـا بەبێ زەحمەت/ بە بارو کۆڵ‌و عـەڕادە

بە گشتی ئەم هونەرە، سەجع یاخود سەروای ناوەوە، لە بەرهەمی شیعری کۆکەییدا کـەم وەبەرچـاو دەکـەوێت لـەو چـەند نموونەیـەش کـە خرایـە ڕوو شـاعیر زۆر سەرکەوتوو نەبووە. کۆکـەیی لـە هـەموو بەرهـەمی شـیعریی خۆیـدا کـە لـە درێـژی‌و کورتیـدا جیـاوازن‌و لـەنێوان قەسـیدەی پـەنجا بـەیتی‌و پارچـەی چـوار دێـڕی دان، پەیڕەوی لە یەکێتی قافیە کردووەو لێی لانەداوە.

**سەروا لە بەرهەمی سەیفی قازیدا:**

نەخشەو ئاماری سـەروا لای سـەیفی قـازی دوو جـۆرە، یەکـەمیان ئـەو تێکـستانەی لـە قـاڵبی قەسـیدەو غـەزەل دان لەسـەر بنـەمای یـەکێتی سـەروا دامـەزراون، بـەگوێرەی دەنگی کۆتایی دێڕ تەنها یەك پارچەی لەسەر هەر یەکێك لە دەنگەکانی (ر، ز، ش، و،

---

(44)دربارە ادبیات ونقد ادبی: ٣٩١.
(45) زیباشناسی سخن پارسی: ٤٤

ق، د، ێ)دا هۆنیوەتەوە، بۆ دەنگەکانی (م، ت، ی) دوو پارچەو بۆ (ێ) سێ پارچەو لەسەر دەنگی (ە ـ ه) چوار پارچەی هەیە. دەستپێکی دیوانی شاعیر قەسیدەیەکی ٣٩ بەیتییە لە ستایشی خواو پێغەمبەردا، لەسەر دەنگە سەروای درێژی (ێ) دامەزراوە، ئەم دەنگە هەر خۆی لە خۆیدا، ئاهەنگێکی کشاوی لە دوعاو نزاو پارانەوە، بە دێڕەکان بەخشیوە:

بۆ تۆیە، هەر بۆ تۆیە، دەتوانم بکەم سەنا
ڕۆژو شەوێ تۆ دێنیو دەبەی مەغریبو عیشا
گەورەو گرانو بێ کەسو بێ جێو بێ مەکان
بۆ بێ کەسی، بۆ بێ جێیەکان پەنا
تەنهاو بەر قەراری، هەر بویو هەر دەبێ
بێ ئارەزوو نیازی بێ باو بێ برا

شاعیر پارچەیەکی دیکەی هەیە کە (٩) دێڕەو پەنای وەبەر هونەری (تەصریع) بردووە، کە تیادا هەموو نیوە دێڕە هاوتاکان لە (صەدرو عەجز)ی غەزەلەکەدا لەسەریەك سەروا هۆنراونەتەوە:(46)

هەتا عەیشو تەرەب بێ ڕۆژی نەورۆز
هەتا گوڵ بن لە باغدا مەجلیس ئەفرۆز
هەتاکو زوڵفی مەحبووبان بێ ئاڵۆز
هەتا مۆژگانی چاو جوانان بێ دڵ دۆز
هەتاکو خاڵی سەر کوڵمی جگەر سۆز
هەتا نەو ڕەستەگان بن عیشوە ئامۆز

لەسەروا بەندییەکی لەم شێوەی سەرەوە، بنیاتی ئاوازی سەروا لەسەر هەردوو ئاستی ئاسۆیی و ستوونی یەکانگیر دەبێو دەفرێکیش بۆ یەکێتی بابەت پێك دەهێنێ کە لەگەڵ ئاهەنگی تێکستەکەدا تێکەڵاو دەبن.

لە دێری یەکەمی تێکستی (شەتی ئەشکم)دا هاتووە:

دەبا / ساتێکی / ساکیت / بێ / لەنالین/ قەڵبی/ خوێن/ بارم
دەبا / تاوێکی/ فاریغ / بێ / لە گریان/ چاوی/ خەم/ بارم

---

(46) بنية الايقاع في الخطاب الشعري: ١١٨

بــه روونــی مەســەلەی هاوتــەریبی (تــوازی) لــه وشــەو رســتەکانی ئــەم دێــڕەدا بەدیاردەکەوێت، بەو مەعنایەی هەر یەکێك لە وشەکانی نیوە دێڕی دووەم، لە رووی جۆرو رەگەزەوە لە بەرامبەرەکەیان دەچن لەنیوە دێری یەکەمدا، لە پێشدا ئەمەمان ناونا ( تەناسوبی دەستووری) :

| دەبا | ساتێکی | ساکیت بێ | لە | نالین | قەلبی | خوێن بارم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دەبا | تاوێکی | فــاریغ بێ | لە | گریان | چاوی | خەم بــارم |
| ئامرازی خۆزی | ئاوەلکار | کاری لێکدراو | ئامراز | چاوگ | ناو | ئاوەلناوی لێکدراو |

لە قەسیدەیەکدا کە بۆ ناودارێکی موکریانی نووسیوە شاعیر دەڵێ:

کەسێك بەختی سـەعیدی بێ دەبێ حــازر لـه دیوانت

مەلازو مەنزلی تۆیە نەسیبی وی لەسەر خوانت

کە قووتی رووحە میهری تۆ لەسەر سەفحەی مەحەببەتدا

هەمیشە حازری وەختە حەسەن بێو بێتە میوانت

میسالی چینی زولــفی دلبەرە تــا چین پــلاوی تــۆ

لەدوی هەر دانەیێکی دڵ، هەزاران دێتە پێشخانت

شاعیر لـەم تێکستەدا کە (٢٠) دێـرە، سـەرواکەی لەسـەر دەنگـی (ت) جێنـاوی کەسـی دووەمی تاك دامەزراندوە، ئەم دەنگە بەشێکی ئەسڵیی نییە لە وشەکانی کە سەروای هۆنراوەکە پێك دەهێنن[47] لەبەرئەوە وەکو پاش سەروا حسابی بۆ دەکرێت.

شــاعیر لــه هــەردوو تێکسـتی (نامەیـەك لـە یـاری خۆشەویـستەوە)و (شـەوی یەلـدا) پەیڕەوی لە هونەری پاش سەروا کردووەو ئاوازی دێرەکانی پێ رازاندۆتەوە:

(١) قاســید کــە لــە دەرهــاتو بــە تــەبلیغی وەفــا کــرد

حــوجرەی منــی حەســرەت دێهــی ســەت چیــنو خــەتاکرد

پــێم گــوت لــە خوتــەن دێیــەوە یــا خوتتــەیی تاتــار

یــا ئــەهلی بەهەشــتی کــە دڵــت پــڕ لــە ســەفاکرد

---

(47) فنون الشعر الفارسی: ٣٤٢.

(٢) له عالەم فاش‌و مەشهووره كه من مەستی مەیی عیشقم
بە حوققەی دەم بە جامی دیدە مەمكی تونگی مینا بێ

لە حوجرەی عیشقدا ئەمشەو موتالام حاشیەی زولفە
بەلالەی شەمعی گولگوونی بەدوو شەمعی هەلایسابێ

كاتێك شاعیر پەنا دەباتە بەر پاش سەروا، وشەی سەروا لە سیاقی دێردا دەبێت بە دووان، (خەتاكرد ـ سەفا كرد)، (مینا بێ ـ هەلایسابێ)، بۆیە بەهاو زەمەنی مۆسیقای دێره شیعرەكەش دەبێتە دوو چەندان. جۆری دووەمی سیستمی سەروا لە بەرهەمی سەیف لەو تێكست‌و قەسیدانە بەدی دەكرێت كە بە گوێرەی رێوشوێنی سیستمی كێشی برگەیی هۆنراونەتەوە، ئەم تێكستانە ژمارەیان (٦) دانەیە، لە دوانیاندا لەگەل ئەوەشدا كە لەسەر سیستمی كێشی برگەیی دامەزراون، كەچی لەولاوه شاعیر پەیرەوی لە یەكێتی قافیە كردووە، دیارە وشە سەرواكانیش لەهەمان زمانی شیعریی پەتی‌و سادەی ئەو تێكستانە هەلبژێردراون، كە وشەی ئاوەزەدارو چێژ بەخشن:

یار كە دێتە سەر گول‌و ئەستێره
سەیری ئەو دەكەن مانگ‌و ئەستێره
رووناكی رووی بوو یان روونی ئاسمان
كەدێ بۆ كێوی دەبا گا گێره
دەگەلْ یار لە بن سێبەری پالان
چەند خۆشە دۆی سارد دەگەل كولێره

شاعیر لەم تێكستەدا (٤٧) دانە وشە سەروای هاوئاهەنگی لە كۆتایی (٤٧) دێڕی هۆنراوەكەدا بەدوای یەكتریدا رێزكردوون. چوار تێكستەكەی تر شاعیر لەسەر سیستمی جووت سەروا (مەسنەوی) دایمەزراندوون‌و لە وێنەی نامەی شیعری دان، شاعیر لە سۆزی دیدارو خۆشەویستی دۆستێكی خۆیدا دایناون:

(١) عەزیز ئارەزووت، زۆری بۆ هێنام
فرمێسكم سوور بوو، زەردی رووی لێ نام
دیسان بە ئاوری دووریت كەوتمە گیر
دنیام لێ سارد بوو، بوو بە زمهەریر

دنیـــــا وا پـــڕ بـــــوو لـــــه بـــــەفرو ســـــیخوار
فرمێـــــسکی ســـــوورم، بـــــه ســـــپی هاتنـــــه خـــــوار

(٢) راســـــتت پـــــێ بڵـــــێم عـــــەزیز براکـــــەم
نـــــاژیم نـــــامێنم بـــــێ تـــــۆ هەڵناکـــــەم
شـــــەوانم شـــــینو گریـــــەو ڕۆڕۆیـــــە
ژیربـــــوونی ڕۆژێـــــم بـــــه بۆنـــــەی تۆیـــــە
هەناســـــەی ســـــاردم فرمێـــــسکی گـــــەرمم
بـــــه ســـــتوویه لەســـــەر رووی زەردی نـــــەرمم

(٣) ئەگـــــەر دەپرســـــی وەزعـــــی زەمانـــــە
میللـــــەت پەرێـــــشان ئـــــەمان ئەمانـــــە
کـــــاری کـــــوردان هـــــەر خۆزگـــــە بـــــه پـــــارە
هـــــەر کـــــەس بـــــه دەردێـــــك چـــــو گرفتـــــارە
جـــــەمعێك بـــــه بیـــــانووی تەجدیـــــدی نـــــەزەر
ســـــەرگەردان کـــــران لـــــه قـــــاپیەو لـــــەدەر

سەبارەت بە کێشی ئەم تێکستانە کە (١٠) بڕگەیین لەهەر نیوە دێڕێکداو، لەم جۆرەدا وەستان لە ناوەڕاستی نیوە دێڕەکاندا دەبێت: ( ٥ ـــــــــ ٥) (٥ ـــــــــ ٥ )، ئەنجا ئەم پێڕەوە دەبێتە مایەی پێکهاتنی دیاردەیەکی ریتمی بۆ هەر یەکێك لە دێڕەکانی سەرباری ئاهەنگی سەرواکان، لەمەوە پارچەی نیوە دێڕەکان لە ریزبەندییەکی تازەدا ڕێك دەکەونەوە:

عەزیز ئارەزووت — زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو — زەردی رووی لێ نام

★ ★ ★

دیسان بە ئاوری — دووریت کەوتمە گیر
دنیام لێ سارد بوو — بوو بو زمهەریر

★ ★ ★

دنیا وا پڕ بوو — لە بەفرو سیخوار
فرمێسکی سوورم — بە سپی هاتنە خوار

لەمەوە ئاوازێکی سوارو خێرا بۆ هۆنراوەکە دەخولقێ‌و لە ئاهەنگی شیعری میللی‌و گۆرانی فۆلکلۆری نزیك دەکەوێتەوە.

سەروا لە شیعری مستەفا شەوقی:

لێرەدا هەوڵ دەدەین لە چەند رووییێکەوە لەسەرواو وشە سەروا لە بەرهەمی شیعری شەوقیدا بکۆڵینەوە:[48]

١. لە رووی دەنگسازی (کێش‌و ئاوازە)وە:

ـ ئەو تێکستانەی کە وشەی سەرواکانیان هاوکێش‌و هاو ئاوازن، بریتین لە (١. هاواری دایکێ، ٢. تەحەسووری ٣. جەوانی‌و تەرانەیی وەتەن، ٤. وەرەقێك لە دەفتەری خاتیرات، ٥. مەگەر لێم عاجیزی):

(١) لە تەئسیری فسوونی رۆژی تابان عالەمی شۆری
مەگەر تۆ چاوەکانم مێری کوردان هێشتا مەخمووری
لەناز بالینجی خەو ساتێ هەڵێنە سەر تەماشاکە
لەمێر گوڵان دەخوێنن بولبولی شەیدا بە رەنجووری

باقی وشە سەرواکانی تێکستەکە بەم جۆرەیە (سەمتووری، مەهجووری، بەرمووری، سەربووری، خاپووری، پڕ زووری....تاد).

(٢) بەبێ تۆ عالەمی دڵ غەرقی دەریای یەئس‌و حیرمانە
تەماشاکە شەپۆڵ ئەورۆ چلۆن سەر رێژی چاوانە
عەجەب تۆفان دەرە حیسی شەبابم هەڵدەچێ دایم
لە قەڵبی پڕ خرۆش ئەسرینی چاوم لەعلی روممانە

وشە سەروەکانی تر: ئەفسانە، زستانە، جانانە، سەیرانە....تاد.

(٣) فیدای چاوت عەزیزم، ئەورۆکە حاڵم پەرێشانە
لە دووری تۆ دوو دیدەم غەرقی خوێنە بەحری عوممانە
عەجەب کۆرپەی دڵم ناداهەدا، شەوگاری تەنهایی
نەباتی قەندی لێوی تۆی دەوێ، بێچارە بێ زمانە

---

(48) بڕوانە:

ـ سەروا : ١٤٥.

وشە سەرواکانی تریش لەم شێوەیەن، مەرجانە، میهمانە، بریانە...تاد.

(٤) لە من بۆ چ زیزی عەمرم، چاوەکانم، ماهی تابانم
تەوێڵت بۆ چی گرژە؟ یا چ قەوماوە، چییە تاوانم
لە پێشا پێشی تابووری موژەت هەر دوو برۆت کە چ بوو
دەڵێ بۆ تیپی عاشق زولفە قارەتیغی بوڕڕانم

وشە سەرواکانی تریش ئەمانەن: دەستانم، وێرانم، جوانم، گریانم، گریبانم. وشەی سەروا لەم تێکستانەدا بریتییە لە (٣) بڕگەی درێژی (فا عیـ لون)، کە هاوکێش و هاو ئاوازن و لە هەموو دێڕەکاندا بەم پێیە دووبارە دەبنەوە. لە تێکستەکانی (حەسبوحال دەگەڵ وەتەن، جەوانان، فەریاد) دوو بڕگەی کۆتایی وشە سەرواکان لە دێڕەکاندا هاوکێش و هاو ئاوازن کە لە راستیدا هەر ئەوان سەروای پارچەکە پێك دێنن:

(١) خەملیوە لەسەر قەبری جەوانان گوڵ و لاڵە
یا سووریی خوێنە کە بڵێی رەنگەکی ئاڵە
ئەی بادی سەبا هەستە گوزەرکە بە وەتەندا
پەخشان بکە سەر ئەرزی بۆنی گوڵاڵە

(٢) هەڵستاون جەوانانی وەتەن دیسان بەبێ باکی
لە حەسرەت دەردی کۆنە ملکی بابیان هاتنە چالاکی
دەدڵ عەزم و لەسەر شۆڕی جەوانی هاتوو دەخوازن
کە بڕژێنن لەسەر خاکی وەتەن خوێنیان بەسەر پاکی

(٣) جەبین مینای زیو، گەردن هوما، خاڵ مشکی تا تاری
شەدەشل، چاو بەکل، روو سوورە گوڵ، تەڕڕارو عەییاری
بەلەنجەو لارەکەت وا دیارە نەشئەی تۆ لە کوردانە
وەئیلا چۆن دەبێتن پێکەوە زولم و وەفاداری

لەم سێ تێکستەدا دوو بڕگەی درێژی کۆتایی وشە سەرواکان بریتیین لە (عی لون) کە لە رووی کێش و ئاوازەوە وەکو یەکن.

٢. لە رووی وشەسازییەوە: لە تێکستی (لە بۆ کوردان) وشە سەرواکان وشەی لێکدراون‌و بە یارمەتی کاری بێ هێزی هەبوون (بوو) سازکراون، بەمە وشەی سەرواکان لە هەموو دێرەکاندا بووەتە چاوگی لێکدراو:

لە مولکی کوردەکان ئەورۆ تەپو مژ هێندە پەیدابوو
دەڵێی حەشری خەزانە لە رۆژئاوا خۆر ئاوابوو
کەپووری بێکەس‌و خوشکی هەتیوت چاو بە فرمێسکن
کە ماڵی باب‌و باپیرت سەراپا چۆڵ‌و رووخا بوو

پاشماوەی وشە سەرواکانی تریش هەر بەو شێوەیە: سووتا بوو، بەسترابوو، خنکابوو، کوژرابوو،....تاد.

- لە تێکستی (لە بۆ هاواڵی ماتەمدار) وشە سەرواکان وشەی لێکدراون‌و بە هۆی پاشگرەی (وە) سازبوون و تافی رابردووی تەواویان وەرگرتووە:

بۆ چ دەناڵێنی لەسەر لێوت لە بۆ چ بارکەوتووە
لەشکری زولفت کە خاوو کاڵە بۆ چ رووی گرتووە
ئاهی تۆ وەك بای سموم هات‌و قەڵبی دادڕیم
ئەی فەلەك گرپەت کە ئەو جارە بۆ وات کردووە

وشەکانی تریش بەم شێوەیە پێکهاتوون، شوشتووە، پشکوتووە، دەرکەوتووە...تاد.

٣. لە رووی وشەسازی‌و دەنگسازی پێکەوە: هەر دوو تێکستی (تەحەسوری جەوانی‌و تەرانەی وەتەن)و (مەگەر لێم عاجزی) وشە سەرواکان لە دوولاوە وەکو یەکن، لەباری رۆنانەوە، وشە سەرواکان لەهەردوو تێکستدا بریتین لە وشەی سادەو لە رووی جۆریشەوە یا (ناوی سادە)ن یاخود (ئاوەڵناوی سادە)و لە رووی کێش‌و ئاوازیشەوە هەریەکەیان لە (٢) برگەی درێژی (فا عیـ لون) پێکهاتووە، وەکو لە نموونەکانی پێشەوەدا بەدیار دەکەوێت.

**ئاوازی ناوەوە ( ریتم ):**

مەبەست لە ئاوازی ناوەوە دەستنیشانکردنی ئەو دیاردە دەنگییانەیە کە لەسەر ئاستی دەنگسازی‌و وشەسازییدا لە دێری شیعری بەدی دەکرێن‌و لە تەك ئاستی کێش دا یەکانگیردەبن‌و جۆرە ئاهەنگ‌و ئاوازێکی تایبەت‌و دڵگیر بەدێڕەکە دەبەخشن.[49]

---

(49) بڕوانە: ـ کێش‌و ریتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی: ٥٨ ـ ادوار شعر فارسی: ٩٦.

بنیاتی ئاوازو مۆسیقای شیعر لەبنەڕەتدا لە دوو چاوگەوە دەخولقێ، کە بریتین لە فرەچەشنیو دووبارەبوونەوە، کە بێت هەر جۆرە رەنگدانەوەیەکی ئەم دوو چەمکە، واتە (تەنوعو تیکرار)، لەسەر ئاستی دەنگ بریتی دەبێ لە (یەکگرتنو رێکەوتنو دووبارە بوونەوەی پیتە دەنگدارو بێدەنگەکان) لەسەر ئاستی دووبارەبوونەوەی وشەش لە جۆرەکانی رەگەزدۆزی دا ئاشکرا دەبێ، ئەم هونەرانە زایەڵەی زەنگو ئاوازێکی شاراوە بەرپادەکەنو بنیاتێکی ئیستاتیکی شاکار بە دەقی شیعری دەبەخشن کە لە رەخنەی تازەدا بە (ئورکستراسیون)ی شیعر ناودەبرێت.[50]

ریتمو ئاوازی ناوەوە پەیوەندی بەزمانەوە هەیەو بەهۆی سیستمی دەنگسازیو زمانەوانی ئەو زمانەوە دەردەبڕدرێ، هەروەها رەگەزێکی میکانیکی رووتیش نییە کە بەدوای یەکدا هاتنی جۆرەکانی دەنگ بیسەپێنێ، بەڵکو جوولەیەکی زیندووە لە تاقی کردنەوەی شیعرییەوە هەڵدەقوڵێو لە ئاستی جوولەی ناوەوەی تەرکیبی شیعردا گەڵاڵە دەبێو لە ئاستی دەنگی دەرەوەدا رەنگ دەداتەوە.[51]

لە زمانی کوردیدا لەسەر ئاستی دەنگسازی، فۆنیمو نافۆنیم، دەنگدارو بێدەنگ، دەنگداری درێژو کورت، بێ دەنگی نەرمو کپو گڕمان هەیە، چۆنیەتی تەبابوونو یەکگرتنو دووبارەبوونەوەی ئەمانە لە ناوخۆیانداو لە چوارچێوەی وشەدا، وشەی (١ : ٢ : ٣ )برگەیی، وشەی لێکدراو تەناسوقو تەرکیباتی رێزمانی جیاجیا...تاد ئەمانە هەموویان لە شیعردا دەبن بە دیاردەو خرۆشو ئاوازی ناوەوە سازدەکەن. بۆیە وا پێویست دەکات ئێمە بەدوای ئەم دیاردانە بگەڕێینو لە بەرهەمی شیعریی ماوەی باسەکەماندا بەدیاریان بخەینو تیشك بخەینە سەر رەنگدانەوەی نرخو بەهای ریتمو ئاوازەی ناوەوەی ئەم دیاردانە لە دوو توێی دەقو تێکستەکاندا.

ئاوازی ناوەوە لە بەرهەمی مەلا مارفدا:

یەکەم تێکستی دیوانەکەی شاعیر، پارچەیێکە کە ستایشو پاڕانەوە لە یەزدانی مەزن، لێرەدا چەند دێرێکی دەخەینە روو:

(١) گوڵــــستانو گـــــوڵو گـــــوڵزارو گوڵـــــشەن
نـــــەیو شمـــــشادو ســــــەروی جوێبـــــاری

---

(50) موسیقی شعر: ٣٩٢.

(51) کێشی شیعری کلاسیکی کوردی: ٧٧.

(٢) نـــــەواوو ناڵـــــەوو گریـــــانی قـــــومری
فوغـــــانی بولبـــــولی ســـــەر شـــــاخاری

(٣) زریـــوەی مـــەڵ، لەســـەر پـــەل، یـــا لەســـەر گـــوڵ
چـــــریکەی هـــــودو هـــــودو ســـــەوتی هـــــوزاری

(٤) ســـــەڵاوو حەقحـــــەقی مورغـــــانی یـــــا حـــــەق
کەدەنگیـــــان دێ لەســـــەر عـــــودی قومـــــاری

هاتنی ناوەکانی (گوڵستان، گوڵ، گوڵزار، گوڵشەن) بەدوای یەکتریدا کە لەسەر ئاستی بێژەو مەعنا بریتین لە کۆمەڵێك موتەشابیهات دەنگی (گ) کە پێش قەرەوڵیانە، نەزمو ئاهەنگێکی تایبەتی بە نیوە دێڕەکە بەخشیوە، لە (نەواوو ناڵەوو فوغانی بولبولی) چەند بار (ن، و، ل) دووبارەبوونەتەوە، (نەواو ناڵە) زۆر رێك بەدوای یەکتری دا هاتوون لەنێوان: / نەواوو / ناڵەوو/،/ فوغانی / بولبولی /، هاوتەریبیەکی گونجاو پێکهاتووە.
لە دێڕی سێیەمدا لەنێوان (مەل، پەل)دا رەگەزدۆزی ناتەواو پێکهاتووە، جگە لەوەش گواستنەوە لە (مەلو پەل) بۆ (گوڵ) کارێکی گونجاوەو چونکە لە بێژەدا لە یەك نزیكو لە پێکهاتەدا (یەك برگەیی یا یەك مۆرفیمی)ن. لەنیوە دێڕی دووەمدا دەنگی (ھ) لە (هود هودو هوزار) وشەکانی بەیەکەوە گرێدراوە. لە دێڕی دواییدا (حەق) سێبارە بۆتەوەو درکاندنی دەنگە نەرمەکانی (ی، م، ە، ن) وەکو ناوبەندی نێوان وشەکانو بەیەك گەیشتنەوەیان لە وشەی (قوماری)دا، دێڕەکە رەوتێکی سازگارو بە ئاهەنگی وەرگرتووە:

ـــــ شـــــاعیر وەرە قوربـــــانی قەریحـــــەو قەڵـــــەمت بم
بینووســـــە لـــــە بـــــۆ ئـــــاکرەو ئامێـــــدو لورســـــتان

د/ ١٩

هاتنی دەنگی (ق) لەسەرەتای وشەکانی (قوربان، قەریحە، قەڵەم) جۆرێك تەنسوبو هاوئاهەنگی لەنێوان هەر سێ وشەدا پێکهێناوە، هەروەکو دەنگی کشاوی (ئا) لە (ئاکرە، ئامێد، ستان) ئاوازێکی هەڵکشاوی خولقاندووە. لەم قەسیدەیەدا کە بەناوی (راپەڕین بۆ عیلمو سەنعەت)ە، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین رێژەی

دووبارەبوونەوەی هەر دوو دەنگی (س، ش) لە وشەکاندا گەلێ زۆرە، بەڕادەیەك لە کۆی (١٠) دێڕی یەکەمی تێکستەکەدا کە لە نزیکی (١٠٠) وشە پێکهاتووە، ئەم دوو دەنگە لە (٢٥) وشەدا هاتوون، واتە ڕاێژەی چوار یەکی وشەکان پێك دێنن، ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا لە ریزی دەنگە ئاوازودارەکانن‌و باوەڕێکی وا هەیە کە دووبارە بوونەوەی زۆریان ڕادەی ڕاستگۆیی دەروونی شاعیر نیشان دەدات.(52)

- مەعاریف عیلمی تەییارەو گەرامافۆن‌و بێ سیمە
ئەوەی تۆپێی دەڵێی عیلم‌و مەعاریف چاوەکەم نەنگە

لەم دێڕەدا (عیلم‌و مەعاریف) بە ئاوەژوویی لەنیوە دێڕی دووەمدا دووبارەبۆتەوە، ئەمە لە پێناوی جەخت کردنە لەسەر واتا.

- هەتاکەی کونجی تەنهایی وەرە زاهید تماشاکە
کە خەیمەی شای شەکەر لێوان چ قەسرو بارەگاییکە

ئەگەر سەرنجێ لەباری‌و گونجاوی (شای شەکەر لێوان) بدەین هەست بە ئاوازێکی دەروونی پڕ لە تام‌و چێژدەکەین، لێرەدا ڕۆڵی کارامەیی شاعیر لە هەڵبژاردنی وەسف‌و وشەی گونجاو بەدیاردەکەوێت.

- کە حوسنی یارو ئەغیارم لە میزانی خەیاڵم دا
بە دڵ دیتم هەموو لاییکە ئەو تەنیا لە لاییکە

لە پێکهاتەی (بە دڵ دیتم) ئاوازێکی مەعنەوی بە جۆش هەیە.(*) لەنێوان هەردوو وشەی (لاییکە)دا ڕەگەزدۆزی تەواو بەدی دەکرێت.

- بەڵێ ئیسمی عەبابوو، سورەتەن ئەمما لە مەعنادا
وەکو خێری خودا وابوو، عەسایی دەستی موسا بوو

---

(52) تحليل النص الادبي: ٥١

(*) دکتۆر شەفیعی کەدکونی لە گۆشە نیگایەکی فەلسەفە ئامێزەوە پێ لەسەر ئەو جۆرە ئاوازەی شیعر ( ئاوازی مەعنەوی) دادەگرێ‌و ڕای وایە هونەرەکانی واتاناسی لە ڕەوانبێژیدا دەچنە ژێر باڵی ئەم جۆرە ئاوازەوە. بڕوانە:

- موسیقی شعر: ٣٩٢.

بەدوای یەکداهاتنی (بوو) لە نیوە دێڕەکاندا کە دەنگێکی کشاوی خشۆکەو جۆرێکی لە سەروای ناوەوە بۆ دێڕەکە پێکهێناوەو ریتمو ئاهەنگێکی خولقاندووە کە لە کۆتایی دێڕەکەدا تەواو هەست بە چێژەکەی دەکرێت.

- لە هەوری ماتەمی ئەربابی فوقدانی کەرەم دیتم
بە بەفری غەم، هەموو گیانی بە وێنەی یەدی بەیزا بوو
تەماحم بوو بنووسم بۆ جەبون ئاغا، سەقیل باشی
ئەگەر چی قەیسەرو دارا نەبوو، قاروون‌و دارابوو

دیوان: ٣٠

لە کۆکردنەوەو رێکەوتنی (ماتەم، کەرەم، بە بەفری غەم) ئاوازێکی ئینسیابی هەست پێ دەکرێت، لە دووبارە کردنەوەی (دارا) لەنیوە دێری دووەمدا رەگەزدۆزی تەواو دروست بووە.

- لە ترسی مەنزلی قووەی بەرەق‌و رەعدی ئایەتی (یَتوا)
مەقام‌و مەنزلی مەعلوومی عیلمی حەق تەعالا بوو

لە خۆفی لەشکری سوڵتانی مەنسووری (فلا تنهَر)
گەهێ تەحتە سەرا بوو مەسکەنی، جارێ سورەییا بوو
بنووسە بۆ جەنابی موهتەدی (یا ایها الهادی)
عروسی فیکری بیکرم سەردەمێکی شۆخ‌و رەعنا بوو

دیوان: ٣١

لە کۆکردنەوەی (قووەی بەرق‌و رەعد)، هێزی بروسکەمان لە لا بەرجەستە دەبێت، لە ریزبوونی دەنگەکانی (م، ن، ل، ع، ی، ا) ئاوازێکی ئیستیمراری هەیە. لە کۆکردنەوەی (سەرابوو، سورەییا بوو) (موهتەدی، هادی) جۆرێك لە جیناس‌و هەروا (ئیماله – لارکردنەوە)ش هەیە، لەنێوان (فیکرو بیکر) جیناسی ناتەواو هەیە.

- یەك سەعات‌و یەك دەقیقە دەس لە من هەڵناگرێ
روو لە هەر لایێ دەکەم هەر قاوە قاوم لێ دەکا
گەرچی دنیا بۆ مەلا عەینەن بووەتە بەیتول خەلا
زاڵمە داوای گوڵ‌و عەترو گولاو وم لێ دەکا
هەرچی فیکری لێ دەکەم رێگەی خەلاسیم بۆ نییە
بەم چلەی زستانە داوای تاوو ساوم لێ دەکا

روو لـــه بـــازاڕیش دەکـــەم، ئـــەمجارە ئـــەربابی تەلـــەب
هـــەر کەســـێ تووشـــم دەبـــێ داوای دراوم لـــێ دەکـــا

دیوان: ٣٤.

له (یەك سەعاتو یەك دەقیقە) (قاوەقاو) دووبـارە کردنـەوە هەیـە، لـە کۆکردنـەوەی (دنیا، مەلا، خەلا) دەنگی هەڵکشاوی (ێ)ی کۆتایی وشـەکان هاوسـەروایيەکی پـەنهانی خولقانـدووە، لـەنێوان (گـوڵو گـوڵاو)دا پەیوەنـدی ئیشتیقاق هەیـە، لـەنێوان (تـاو، ساو)دا جیناسی ناتەواو هەیە، لە دوو کەرتی یەکەمی هەردوو نیوە دێردا ئـاوازێکی هاوتەریبی هەیە، جۆرێك لە هاوسەنگی لە نێوانیاندا بەدی دەکرێت:

/ روو / لە / بازاڕیش / دەکەم/
/ هەر/ کەسێ / تووشم / دەبێ/

له قەسیدەی (سێلاوی بەدبەختی) ئەم دیاردانە بەدی دەکرێت:

بەهـــەر کوچـــەو محەللێکـــدا دەڕۆم هـــەر شـــینو گریانـــە
کـە گـوێ دەگـرم هـەموو هـەر شـێوەنو هـەیهاوو هـەی دادە
موغـازەو قەیـسەریو دوکـانو حـوجرەی وا موجەلـەل بـوو
وەکـــو قەســـرێ کـــە بـــۆ قەیـــسەر کرابـــێ ســـازو ئامـــادە
فتـــوورەی پـــڕ فتـــووری رووسو ژاپـــۆنو بـــەریتانی
مـــەتاعی هینـــدیو مـــاڵی فـــەرەنگو چـــینو کانـــادا
لـــە هـــەوری قـــودرەتی بـــاری قـــەریبی نیـــو ســـەعات بـــاری
چ بارانێـــــك نـــــەبارانێ کـــــە مـــــەعهودو موعتـــــادە
خوداوەنـــدا چـــە تۆفانێکـــە وا بـــێ عاتیفـــەو روحمـــە
خـــوداوەنـــدا چ ســـێلاوێکە ئـــەم ســـێڵاوە بـــێ دادە

لـە هێنانـەوەی ئـەم هـەموو دەنگـەی (ه) لـە (هـەموو، هـەر شـیوەنو، هـەیهاوو، هـەی دادە)دا ریتمێکـی بـە تـەرتیب پێکهـاتووە. لـە کۆکردنـەوەی (قەیـسەری، قەسـرێ، قەیسەر) گونجانو هاو نـەژادی دەنگـی هەیـە. لـەنێوان (فتـوورە، فتـوور) رەگـەزدۆزی ناتــەواوو لـە نێـوان (بـاری، بـاری)دا رەگـەزدۆزی تـەواو هەیـە، لـە تیکـرارو پرسـیارو وەڵامی (چ بارانێك نەبارانێ) پەیژەیەکی ئاوازی لە بڵندەوە بۆ نەوی دروست بووە.

ـ عێلات کە رووی رەشە، لە شەرەف پاکی بێ بەشە
ئەمما بڵێن بە خانو خەوانینو میرو قوڵ

تاکەی وەتاغی بەرزو ژنی تەرزو تەرکی فەرز
لێتان حەرام بێ سوحبەتی خاتوونی نەرمو نوڵ

مەیرپێسە بەسیە شاعیری چەپرەك بڵێ بڵێ
رەبیی وڵاتی کوردی ببینین بە چۆڵو هۆڵ

دیوان: ۲۷، ۲۸

لەنیوە دێڕی یەکەمدا سەروای ناوەوەی نێوان دوو کەرتەکە، جۆرێك لە هاوسەنگیو هاوئاهەنگی پێکهێناوە، لەنێوان (خانو خەوانین)دا پەیوەندی ئشتیقاق هەیە، لە کۆکردنەوەی (بەرز، تەرز، فەرز) رەگەزدۆزی ناتەواو پێکهاتووە. لە دووبارەکردنەوەی (بڵێ بڵێ) تەئکید هەیە، پەیوەندی (چۆڵ، هۆڵ) جیناسی ناتەواوە. شاعیر لە (گریانی هەوری تەبعو پێکەنینی گوڵ)دا دەڵێ:

باز ئەوا شابازی فیکرم مەیلی پەروازی هەیە
بۆ شکاری لوتفی تۆ زۆری نیە، نازی هەیە

مودەتێکە عەندەلیبی باغی شێعرم ساکیتە
لەم گوڵو گوڵزارە یەك دنیا گلەو ڕازی هەیە

یادی لوتفی تۆ سەبەب بوو کەوتە سەر نەشئەو دەماغ
قەهقەهەی کەپکی بەهاری چەهچەهەی بازی هەیە

لە دێڕی یەکەمدا پەیوەندی لەنێوان (باز، باز)دا جیناسی تەواوە لەگەڵ (ناز)دا جیناسی ناتەواون، هاتنی (پەرواز) لەگەڵ ئەمانەدا هاوئاهەنگیەکی گونجاوی دروست کردووە. پەیوەندی (گوڵ، گوڵزار) هاونەژادیو پەیوەندی نێوان (بەشو گشت)ە. بەراوردی نێوان (گوڵ زار)و (گلەوراز) هەڵگەڕانەوەی لەفزی، یا رەگەزدۆزییەکی هەڵگەڕاوە نیشان دەدات. لەنێوان (قەهقەهە)و (چەهچەهە)دا یەکێتی سروشتی پێکهاتن هەیەو هەردوو لاشیان لە دەنگە سروشتییەکانی باڵندەوە سازکراون.

شاعیر لەم تێکستەدا لەگەڵ دەنگی (ز)دا حەشرێکی خولقاندووە. جگە لەوەی وشە سەرواکان (ز)دارن، لەهەر نیوە دێڕو دێڕێکدا لانی کەم یەك یا دوو وشەی تری خاوەنی ئەم دەنگەی هێناوەتەوە، بەمە زنجیرەیەکی لە وشەو بێژەی (ز)دار هۆنیوەتەوە هەر لەسەرەتاوە تا بە کۆتایی هەڵبەستەکە رادەگات بەردەوام دەبێت.

— ئەی حەسەن ئەی ساحەبی وەجهی حەسەن
مەزهەری فەرمایشی جەدول حەسەن

سەیری سێ پاتەکردنەوەی (حەسەن)و گونجانی لەگەڵ (ساحەبی) چ سۆزو ئاوازێکی داهێناوە.

- لەوێ رۆژێ کە تۆ رۆیی لە شاریو هیجرەتت فەرمووو
وشك بوو نەهری شیعرو بەحری فیکرو نیکتەپەردازی

لەنێوان (نەهری شیعرو — بەحری فیکر)دا تەناسوبێکی رێك هەیە.

کە تێفکریم سەنەی تەئریخی عومری
موعاسیر بوو لەگەل تالوتو جالوت

لەنێوان (تالوتو جالوت)دا جیناسی ناتەواو هەیە.

- گەرچی دەوڵەمەندو ساحێب پووڵو پارەو سەروەتی
مالیکی گامێشو مێشو گوێ درێژو گوێ لەقی

شاعیر لە کۆکردنەوەی (گامێشو مێش) هەروەها (گامێشو گوێ درێژو گوێ لەق) ئاوازێکی لەباری داهێناوە.

- دەماغو مەغزو تەبعم مەستو مەخموورو موعەتتەر بوو
وەکو بولبول بە گوڵ، حافز بە مەحبووبانی شیرازی

لەهەموو وشەکانی نیوە دێڕی یەکەمدا (م)ێك بەشداری دەکات لە بنیاتی وشەکەدا کە سیانی یەکەمیان ناون و بەدوای یەکتریدا ریزکراون، ئەو سێیەکەی دواتریش ئاوەڵناون.

— عەینەکی عەینم عەزیزم من بە تۆ تەقدیم دەکەم
مەخزەنو میفتاحی قەڵبی خۆم بە تۆ تەسلیم دەکەم

هاتنی سێ (ع) له سێ وشەی دوای یەکی نیوه دێڕی یەکەمدا رسته ئاوازێکی دروست کردووه، له کەرتی دووەمی هەردوو نیوه دێڕدا، هاوتەریبیو هاوتەرکیبی رێزمانی هەیە:

/ من / به تۆ / تەقدیم / دەکەم/

/ خۆم به تۆ/ تەسلیم / دەکەم /

ئەم لایەنانەی له بەرهەمی شاعیردا خرانه روو مشتێکه له نموونەی خەروارێك، بێ گومان پشکنینو سەرنجدانیووردو بەحەوسەله زۆر دیاردەی تری دەنگیو وشەییمان لەو بەرهەمانەی بۆ روون دەکاتەوه، به تایبەت له مەیدانی دووباره بوونەوەی پیتە دەنگدارو بێ دەنگەکانو رۆلگێڕانیان لەبەرپاکردنی ئاوازەی وشەکان.

بۆ مەسەلەی وشەی ئاوێتەو تەرکیباتی تازەو زاراوەسازی تازەو داهێنراو که رۆلێکی گرنگ له خولقاندنی بنیاتی ئاوازی ناوەوه دەگێڕن، ئێمه لەکاتی توێژینەوەمان له مەسەلەی زمانو شێواز له سەرەتای باسەکەماندا، به ئەندازەی پێویست روونمان کردۆتەوەو تیشکمان خستۆته سەر ئەولایەنه له بەرهەمی هەر یەکێك له شاعیرانمان، بۆیه دووبارەکردنەوەی لێرەدا به شتێکی پێویست نەزاندرا.

**ئاوازی ناوەوه له بەرهەمی سەیفی قازیدا :**

دووبارەبوونەوه یاخود (تیکرار) بەتایبەت له شیعرو هۆنراوەدا یەکێکه لەو بنچینانەی که بنیاتی مۆسیقای ناوەوه پێك دەهێنێ، تیکرار خۆی دوو شێوەی هەیە: یەکەمیان تیکراری مەعنەوییه، که دەبێته مایەی رۆشنیو جەختکردنی ئاخاوتن، ئەمەیان دەچێته خانەی واتاناسییەوه، دووەمیان تیکراری لەفزی (بێژەیی)یە، که هەم جەختکردن دەنوێنێو هەم خرۆشو ئاهەنگێك پێك دێنێ که دەبێته هەوێنی رازانەوەو جوانکاری شیعر.[53] ئەمەشیان بریتییه له دووبارەبوونەوەی دەنگ یا دووبارەبوونەوەی وشه، بەلام هەموو دووباره بوونەوەیەکیش نا، بەلکو له هەندێ حالەتدا دەبێته مایەی لەکەدارکردنی شیعرو ئاخاوتن. لەمەوه چاوێك به بەرهەمی شیعری سەیفدا دەگێڕینو پەرده لەسەر رووی چەند لایەنێکی ئەم هونەره لادەبەین.

له دیوانی شیعری کلاسیکی کوردی دا بۆته داب که به شیعرێکی ئاینی دەست پێ بکات، بەو شێوەیە دیوانی سەیفی قازی به قەسیدەیەك له (ستایشی خواو پێغەمبەر) دەست پێدەکات. شاعیر روودەکاته قاپی خوداو دەپاڕێتەوه، لەم پاڕانەوەیدا ئەوەی

---

(53) درباره ادبیات ونقد ادبی: ٥٦٥.

سەرنج رادەکێشێ زۆری دووپاتکردنەوەی (تۆ، ئەتۆ، بە تۆیە...)ی جێناوی سەربەخۆی کەسی دووەمی (موخاتەب)ە، بە هاورێتی جێناوی لکاوی (ی) کە وەکو زەروورەتو دەنگدانەوەیەکە بۆ هی یەکەم:

بۆ تۆیە، هەر بۆ تۆیە، دەتوانم بکەم سەنا
رۆژو شەوێ تۆ دێنیو دەبەی مەغریبو عیشا
هەر چاویان لە تۆیە، هەر ئومێدیان بە تۆیە
هەرچی غەنی فەقیرە لەهەر لا گەداو شا
ماسی لە شەوقی تۆیە لەبەحران دەکەن شەنا
تەیران لە عیشقی تۆ لە سەمادا دەکەن سەما

دووبارەکردنەوەی ئەم جێناوە کەسییانە جۆرە جیناسو هاوئاهەنگییەکی گونجاوی لەگەڵ چەمکی (تۆی باڵاو تاکو تەنیای پەروەردگار)دا پێکهیناوە. شاعیر لە سیاقی (٣٩) دێڕدا هەر لە وەسفو ستایشی ئەو (تۆ)یەیە، ئەنجا لەگەڵ وشەی دیکەدا ئاوێتە دەبێ ئاوازەی ناوەوەی رستەو گوزارەکان قووڵتر دەکات.

گەورەو گرانو بێ کەسو بێ جێ بێ مەکان
بۆ بێ کەسان کەسی بۆ بێ جێیەکان پەنا

چەند بارەبوونەوەی (بێ) لە پێش وشەکاندا، هەروەها پاتەبوونەوەی (کەسی، کەسان، کەس) جیناسو گەردانکردنی تیایە.

تەنهاو بەرقەراری هەر بوویو هەر دەبی
بێ ئارەزوو نیازی، بێ بابو بێ برا

لە باری دەنگەوە (ب)ەکان ئاوازێکی سازکردووە، وەکو چۆن، هەر + کاری هەبوون، بێ + باب، بێ + برا، بێ بەش نین لە بنیاتێکی مۆسیقایی کە لە سیاقی رستەکاندا بەرپابوون.

هەرچی پەڕی گوڵانە، لە بۆ زیکری تۆ زمان
هەرچی گەڵای بەدارەوە دەستن لە بۆ دوعا

بێجگە لە جوانی بایسو وێنە هونەرییەکەی لەم دێڕەدایە، لەنێوان (گوڵو گەڵا)دا تەناسوبێکی جوان هەیە.

/ موحتاجی / روحمی/ تـۆیه/، نـەبی بێ، ئەگەر وەلی
حەیرانی / وەسـفی/ تـۆیه /، ئەگەر شێخ ئەگەر ت مەلا
/ ماسی / لەشەقی / تۆ یه /، له بەحران دەکەن شەنا
/ تەیران/ لـه عیشقی/ تۆ /، لەسـەمادا دەکەن سـەما

لەکەرتی یەکەمی هەردوو نیوه دێڕی هەر یەکێك لـه دێڕەکان، هاوتـەریبی هەیـه، هەروەکو لەباری پێکهاتەی ڕێزمانیشدا یەکن.

تـــۆ زیــــاتری لەهەرچــــی خـــەیاڵاتی لــــێ دەکـــەی
نـــەوەك کەســـی، نەکـــەس وەك تۆیـــه، نـــه کـــەس وەهـــا

له (وەك)، (کەس) دا دووباره بوونەوه (تیکرار) هەیه.

بەخسوس شەفیعی ئێمەیه، ئەو خۆشەویستەکەت
شـابازی دەشتی مەروه، شـەهی شارەکەی سەفا

هـــاتنی دوو دەنگـــی خـــشۆکی (ش)و (س) لـــه وشـــەکانی دوو نیـــوه دێڕەکـــەدا هاوئاهەنگییەکی ناوەتەوه.

هـــــاتو چـــــوو، بیـــــستی، زوو گەڕایـــــەوه
ئـــالقەی دەرهـــەر دەلـــەرزی چـــرای ماڵـــێ هـــەرگرا

لەم دێڕەدا ئاهەنگساز سیستمی پاتەبوونەوەی وشەکانه لەسەر ئاستی بڕگەو مۆرفیم له نیوه دێڕی یەکەمدا:

هاتو چوو ، بیستی، کوتی، زوو، گەڕایەوه
٢ + ١ + ٢ + ٢ + ١ + ٣

یانی نەملكو ماڵه له بۆ مه، نه حاڵو باڵ
بێ جـاهو بێ جەلالو بێ حاڵو بێ سەلا

لەکۆکردنەوەی (مال، حاڵ، باڵ) ڕەگەزدۆزی ناتەواو هەیه، (بێ جاهو بێ جەلالو بـێ حال)، تەرکیباتی هاوئاهەنگن.

نه مەدرەسه، نەعیلم، نه دەرس‌و ، نه سەنعەتێك
زوله لەگەڵ مه، هـەر که بەچاوێك نەکەن نیـگا

پاتەکردنـــەوەی ئـامرازی نـەرێی (نـه) لـه بـەرایی وشـەکان ریتمێکـی سەنجراکێـشی پێداون، له گرێی (زوڵمه لەگەڵ مه) ئاهەنگێك سازبووه.

دامەزراندنی هەموو سەرواکان لەم قەسیدەیەدا لەسەر دەنگی کشاوی (ێ)دا، تەرجیعێکی بۆ دێڕەکان سازکردووە، کە لەگەڵ ئاوازی پاڕانەوەو (دوعا)و (نزا)دا ڕێك دێتەوە.

* * * * * *

ـ پێم کوت، لە خوتەن دێیەوە یا خوتتەیی تاتار
یا ئەهلی بەهەشتی کە دڵت پڕ لە سەفا کرد

ئاهەنگی (ت) باڵی بەسەر نیوە دێڕی یەکەمدا کێشاوە بە هاتنەوەی لە چەند وشەیەکدا بەخەستی.

/ ئەستاری/ وەکو/ زولفی/ عەروسانە/ موسەلسەل/
/ ئەلفازی/ هەموو/ گەوهەرە/ چەن جوانی/ ئەداکرد/

هاتنی چەند جارەی (س) لەنیوەی یەکەمداو هاوتەریبی نیوە دێڕەکان، ریتمو ئاهەنگێکی هاوسەنگی داهێناوە.

ئەم دەستە گوڵە بەستەیی ئەم دەستو بەنانەن
بۆیە وەکو بولبول حەسەنی نەغمە سەراکرد

لەنێوان (دەستە)و (بەستە)دا جیناسی ناتەواوو لەنێوان (دەستەو دەست)دا جیناسی مەزید هەیە.

- دەرژێنیٚ بە یەك غەمزە نیگات خوێنی سپایەك
دەشکێنی بە رووی تۆ بەشکەن، تاقی خەوەرنەق

لەنێوان (دەشکێنیٚ)و (شکەن)دا پەیوەندی گەردانەییو لە هاتنی (ق) لە دوو وشەی دواییدا زەق بوونەوەی ئاواز هەیە.

ـــ ڕێی وانە کەهکەشانو ڕێی ئێمە بەردەڵان
جێی وانە تەختو بەختو جێی ئێمە بەردو چێو

لەهێنانەوەی دووبارەی (ڕێی) لەنیوە دێڕی یەکەمو دووجار (جێی) لە نیوەی دووەم هاوسەنگی هەیە، کەهکەشانو بەردەڵان هاوکێشو هاوسەرواو هاوئاوازن. لە (تەختو بەخت) ڕەگەزدۆزی هەیە.

لا هەڵداڕاوو، جەرگ بڕاوو، فڕیٚ دراو
بیٚ شوێنو بیٚ نیشانو پەرێشانینو پەشێو

(ڕ) بنیاتی ئاهەنگێکی دەروونی لە پێکهاتەی هەر سێ کەرتی نیوە دێڕەکانی یەکەم خولقاندووە، سەرباری بەدوای یەکدا هاتنی (و)ی سەرواکان. لەنیوەی دووەمدا (ش) ئەرکی سازدانی ئاهەنگێکی نەرمو خشۆکی گرتۆتە ئەستۆ، لەگەڵ هاتنی دوو (بێ) لەسەرەتای دوو وشەی یەکەمو دوو (پ) لەسەرەتای دوو ووشەی دوایی.

ــ فکـرێ لـە حـالی خۆکـەنو بگـرین بـە حـاڵی خـۆ
هــەر بــێ ســەریو عــەداوەتی خۆتــان دێتــە رێ
لــە دووبارەبوونــەوەی، حــالی خــۆ، تەئکیــد هەیــە.
ــ سەرچــوونی تــەختی رۆینــی ســەرداری پــێ دەوێ
خۆشــیم لــەو شــەهادەتی شــخانە، نێــو بــەنێو

دووبارەبوونـەوەی (ی) لـە کۆتـایی وشـەکاندا، ئـاواز بەندییـەکی لەنێوانـدا دروسـت کـردوون، لـەنیوەی دووەمـدا بـەدوای یەکـدا هـاتنی (ش) خۆشـییەکە دەکاتـە دوو چەندان.

ـ بۆ وانـە هەرچی جوانـە، لـە جێ، دێ، لـە ژن لـە مـاڵ
هــەر شــاخو داخــە بــۆ مــە، کــوڕی رەش کـچی دزێـو

لە ریزبوونی (وانە، جوانە ــ جێ، دێ)دا جیناسی ناتـەواو هەیـە، لـەنیوەی دووەمـدا دوو (خ) دوو (ك)، ئاوازی چۆن یەکیان بە وشە لێك نزیکەکان بەخشیوە.
تێکستی (بوومە چاوەش) سەرەتاکەی بەم شێوەیەیە:

چ خۆشــە مــن نــەخۆشو یــاری مــەهوەش
لــە رێگــەی لوتفــەوە بمخاتــە بــاوەش
پەرێــشانم لەبــەر زولفــی بــڵاوت
نــەخۆشو مەســتی ئــەو دوو نێرگــسی گــەش
نیــشانم دە فیــدات بم جووتــە خاڵــت
لــە ئــەوەل نــەردەوە چــەند خۆشــە دوو شــەش
بــە دەردی ئــاهی مــن رەشپۆشــە گــەردوون
بــە ڕووو تــا خــاڵو پەرچــەم بــوون مــشەوەش

کێشی شیعرەکە رەوتـی ئاهـەنگێکی خێـرای بـە دێڕەکـان بەخـشیوە، تێکئاڵقـانی پێیـەکانی ئـەم ئاهەنگـە خێرایە لەگـەڵ دیـاردە دەنگییـەکانی نـاو وشـەکان سـۆزو

ریتمێکی رازاوەی داهێناوە، لەهەر دێڕێکدا زایەڵەی (ش)، دەنگەکانی تری خستۆتە ژێر سێبەری خۆی تا لە کۆتایی دێڕەکەدا لەگەڵ (ش)ی سەرواکەدا تێکەڵاو دەبێتەوە، لە (خۆش)و (نەخۆش)دا جیناس‌و نەفی کردن هەیە.

کزو زیزی لە کەم مەیلی عەزیزم
عەیامێکە عەوامە، تەبعی سەرکەش

(ز) لەنیوەی یەکەمدا جڵەوی ئاوازەی گرتۆتە دەست‌و لە نیوەکەی تردا گۆڕاوە بە (ع). لەنێوان (عەیامێکە)و (عەوامە) لارکردنەوە هەیە کە سۆزێکی ئاوازەیی هەیە.

وەرە جاریٚ بە جاریٚ لامەدە لێم
دەبیٚ وابیٚ وەفای یارانی مەهوەش

★ ★ ★

بەڵیٚ بەو شەرتە خۆشە وەسڵی دولبەر
کە دەمەدەم دەم لەنێو دەم دەس لە باوەش

لە (جاریٚ)دا جیناسی تەواو هەیە، لە (دەبیٚ) (وابیٚ) ئیبدال واتە جێگۆرکێی دەنگی هەیە، لە هێنانەوەی (دەم)ەکانی (دەم دەم، دەم لەنێو دەم)، هەم جیناس‌و هەم گونجان‌و هەم هاوئاهەنگی هەیە.

ـ تا دیدە بە دیداری مونیرت نییە رەوشەن
وەك کانییەکەی قوڵقوڵەیە، قوڵ قوڵ‌و جۆشی

لەنێوان (دیدەو دیدار) پەیوەندی ئیشتیاق‌و جیناسی موحەرەفە هەیە، لە (قوڵقوڵەو قوڵ قوڵ) دا جیناسی هاو بناغەیی هەیە لە دارشتندا، هەر دووك لە دەنگی سروشتی هەڵقوڵینی ئاوەوە وەرگیران.

ـ دەبا / ساتێکی/ ساکیت/ بیٚ / لە / نالین/ قەڵبی/ خوێن/ بارم
دەبا/ تاوێکی/ فاریغ/ بیٚ / لە/ گریان/ چاوی/ غەم/ بارم

هاوتەریبی لەنێوان پێکهاتەکانی هەردوو نیوە دێڕدا لە هەردوو لایەنی وشەسازی‌و رستەسازیدا بەدی دەکرێت کە ئاهەنگێکی هاوسەنگی بە هەریەك لە وشەو ئامرازەکانی لە هەردوولادا بەخشیوە. (دەبا)ی ئامرازی خۆزی، لە دەستپێکی نیوە دێڕەکان ئاهەنگی پاڕانەوە دەبەخشی، (سا)ی دەستپێکی (ساتێکی/ ساکیت) پێکەوەی گرێداون، لە لەتی دوهەمیان (تیك — کیت) هەڵگەڕاوەی یەکتر ین.

ـ شەتی ئەشکم هەتاکەی بێ مەگەر سەیحون و جەیحونە
بە چاوم کوت دما بەس بێ، کوتی جۆبارو رووبارم

لە (سەیحون و جەیحون) و (جۆبارو رووبار) رەگەزدۆزی هەیە، گونجانی دووتایی هەر یەکێکیان لە کێش و سەروادا هاوسەنگی ئاوازەیی پێ بەخشیون.

ـ لە تاوی زولفی چین چینت، ئەسیری چین و ماچینم
لە سایەی رۆژی رووت گا رۆژ پەرست، گا بەستە زننارم

لە نێوان (چین چین)و (چین و ماچین) جیناس و زاڵبوونی دووبارەبوونەوەی ئاوازەی (چ) رۆشنە، (رۆژ)و (گا) لە لەتی دووەم پاتەکردنەوەیە.

ـ قەدی یا سەروی جۆباری ئەتۆ ئەی زولفی لاولاوی
سەراپا حەڵقە حەڵقە وا لە باڵای بەرزی هاڵاوی

هاتنی چەند جارەی (لا) لە (لاولاو، باڵا، هاڵاو) ئاوازێکی هەڵکشاو بە وشەکان دەبەخشێ، (حەڵقە حەڵقە)، دووپاتەی یەك مۆرفیمە، وشەیەکی لێکدراوی دوو کەرتی سازکردووە.

ـ لەبی/ وەك/ قەندی/ شیرینە: جەبین/ وەك/ عەقدی/ پەروینە
دوو کوڵمی لالەیی حەمرایە، رووی وەك تیغی خوێناوی

نیوە دێڕی یەکەم بەهۆی کەرتکردنەوە بووە بە دوو بەشی هاوتا کە لە پێکهاتەی رێزمانیدا وەکو یەکن بۆیە ئاوازی هاوتەریبی وەرگرتووە.

ئەو تێکستانەی سەیفی قازی لە وێنەی نامەی شیعریدا نووسیونی، کە بەشێکی شیعرو بەرهەمی شاعیر پێك دەهێنن لەباری کێش و ریتمەوە لەگەڵ شیعرە عەرووزییەکانی جیاوازن، لە شوێنی خۆیدا ئەوەی پەیوەندی بە کێش و بە ئاوازی دەرەوەی ئەو تێکستانەوە بێت روونکرایەوە، بۆ مەسەلەی ریتم و ئاوازی ناوەوەش ئەوا ناشێت بە پێودانگی شیعری عەرووزی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، چونکە ئەم جۆرە شیعرە لە ئاهەنگی ناوەوەدا لەگەل شیعری میللی و فۆلکلۆری کوردیدا سەبارەت بە کێش و پێیە برگەییەکانی تێك دەکاتەوە، وەکو چۆن لێکۆڵینەوە تازەکانیش دەریان خستووە کە (هێزو سترێس) رۆڵی بنەرەتی دەگێڕن لە سازکردنی ئاهەنگ و ریتمی ئەم جۆرە هۆنراوەیە، کە ئەویش لە (شیعری گۆرانی کوردیا لەسەر بنچینەی دووبارەکردنەوەی ژمارەیەکی دیاریکراوی سترێسی بنەچەیی دادەمەزرێت).[54] بۆیە

---

(54) کێش و ریتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی: ١٥٩.

ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی هەیە، کە لە دەرەوەی سنووری باسەکەی ئێمەدایە.

**ئاوازی ناوەوە لە شیعری شەوقیدا:**

لە باسی زمانو شێوازو وێنەی هونەریدا ئاماژە بۆ ئەو لایەنە کرا کە شاعیر لەگەڵ ئەوەی لە باری کێشو قافیەوە رەچاوی بنەماکانی شیعری کلاسیکی کردووە، کەچی شیعرەکانی لە رووی ناوەڕۆکەوە رێچکەو سروشتێکی رۆمانسییانەیان وەرگرتووە، لە شیعری رۆمانسیدا شاعیر زیاتر لە رێگەی وەسفو وێنەی هونەرییەوە سۆزو خەیاڵەکانی بەرجەستە دەکات لە بری ئەوەی پەنا بۆ وێنەی رەوانبێژیو وشەئارایی وەکو، جیناسو تیباقو تیکرارو جۆرەکانی بەرێت. لێرەدا وەستاییو هونەرکاری لە هەڵبژاردنی وشەی رێكو گونجاوو دلگیر، لە سیاقی رستەو دێڕە شیعرەکاندا بۆ پێکانی مەبەستو رازاندنەوەی وێنەکان، شوێنی ئەو هونەرانە دەگرێتەوە. بەو پێیەش ئاوازو ریتمی ناوەوە لە سازانی زمانو شێوازو جۆشو خرۆشی وێنەکانەوە بەرپا دەبێت. بۆیە ئەم لایەنەی وشەئارایيو هونەرە قسەییە ئاشکراکان لە شیعری (شەوقی)دا کزو کەم بایەخەو، لەبەرامبەردا لایەنی زمانو شێوازی شیعریو داهێنانی وێنەی هونەری بەهێزن کە لە شوێنی خۆیدا تیشکمان خستوونەتە سەر، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ دەدەین چەند لایەنێك لەو هونەرانەی هاوکاری دەکەن لە پێکهاتنی ریتمو ئاوازی ناوەوەی شیعری شەوقی روون بکەینەوە:

لە (هاواری دایکێ)دا هاتووە:

(١) / لە تەئسیری فسوونی رۆژی تابان / عالەمی شۆری /
/ مەگەر تۆ چاوەکانم مێری کوردان / هێشتا مەخمووری /

(٢) سەدای هاتو نەهات دەنگی زەنگۆڵ قۆری کاروانە
کە بارت کۆچی کردو دەستەداوێن هێشتە مەهجووری

(٣) ئەوێستا تا لە بیخەی رۆژهەڵاتی، تاوهەڵات ڕا بە
بە ئازایی نەجات دە دەستی بەسڕاوت کە مەغدووری

(٤) دەژینێ حەقی خۆت سابیت بکە بۆ یارو ئەغیاران
بە دەستڕە بسڕە فرمێسکی شەوقیو چاوی بێ نووری

له دابەشبوونی هەردوو نیوە دێڕی (١)دا بۆ سەر دوو کەرتی هاوتەریب، ئاوازێکی کشاوی درێژ سازبووە، لە (٢) دا پەیوەندی (هاتو نەهات) نەفی کردنە، ئاوازی ئەم دوو دەنگی (ە)یە لە نیوە دێڕی یەکەمدا لەگەڵ دوو (ە)ی (هێشتە مەهجووری)دا پێك دەگەنەوە. لە (٣)دا لە (رۆژهەڵات، تاوهەڵات) تیکرار هەیە، تەئکیدی مەعنا دەگەیەنێ، (س) هەر دوو وشەی (دەستو بەستراو)ی بەیەکەوە گرێداوە. لە (٤)دا لەنێوان (یارو ئەغیار) بڕگەی (یار) کە دەنگی کشاوی (ێ) ناوکەکەیەتی، یەکێتی ئاهەنگی بەهەردوو وشەکە بەخشیوە ئەگەر چی لە رووی واتاوە پێچەوانەن. لە (بەدەستڕە بستڕە)، بڕگەی کۆتایی (ڕە) هەردوو وشەکەی لە رووی ئاوازەوە بەیەکەوە بەستۆتەوە.

لە (حەسبوحاڵ دەگەڵ وەتەن) شاعیر دەڵێ:

> با بێتو بە تەئسیری فسوونی نەفەسی تۆ
> وەك خونچە بپشکوێ دەمی ئەو کوردە کە لاڵە
> با بێتو سبەینان ئەڵەمو دەردی شەوی هەجر
> بێژی کە لەوەی پاش خەوی مە، مەحزی وە باڵە

هاتنەوەی وشەی خۆزی (بابێت) لە سەرەتای هەردوو دێڕەکەدا بە مەبەستی بەیەکەوە گرێدانەوەیانە. دەنگی (س) لە ناوەراستی وشەکانی (تەئسیری، فسوونی، نەفەسی)دا ئاهەنگێکی رێکی بەردەوامی بە دەستەواژەکە بەخشیووە.

لە تێکستی (هاوڵی ماتەمدار)دا هاتووە:

(١) بۆ چ دەناڵێنی، لەسەر لێوت لە بۆ چ بارکەوتووە
لەشکری زولفت، کە خاوو کاڵە، بۆ چ رووی گرتووە

(٢) قەڵبی شەوقی چۆن حەریمی عیشقە جێی دێرینە تە
بۆ چ دەناڵێنی، لەسەر لێوت، لە بۆ چ بارکەوتووە

(١). هاتنی وشەی پرسیار (بۆچ ، چ، لەبۆچ، بۆچی...) لە دووتوێی دێڕە شیعرەکەداو پاتەکردنەوەی بۆ سەرەنجڕاکێشانو پێ داگرتنە لەسەر مەعنای پرسیار لە بارەوەگراوەوە، هەرچەندە هەڵوەستەیەکی ئاهەنگییش دروست دەکات، ئەم نەریتی پرسیارکردنە لە شیعری شەوقی دا دیارو ئاشکرایە:

لــه مــن بــۆچ زیــزی عــەمرم؟ چــاوەکانم، مــاهی تابــانم
تــەویڵت بــۆ چــی گــرژە، یــا چ قەومــاوە چــیە تــاوانم

★ ★ ★ ★

ســەراپا مەوتــەنی ئەجــدادی پێــشووت جــا تەماشــاکە
لــە بۆ چ رووخــاوە؟ بــۆ چ سووتاوە؟ کاکت بۆچــی خنکابوو

★ ★ ★ ★

وەتــەن ئــەی مــوڵکی بــاپیرم، لــە بــۆچ ئەورۆکــە رووخــاوی
لــە بــۆچ جــێو مەســکەنی وەحــشو تیــوورە خاکەکــەی پــاکی

لەلایێکی تـرەوە وەکـو لـە (١)دا هـاتووە دەسـتپێکی ئـەم تێکسته نیـوە دێـڕی (بـۆچ دەناڵێنی لەسەر لێوت لە بۆچ بارکەوتووە)یە، وەکو لـە (٢)شـدا هـاتووە نیـوە دێـڕی کۆتایی تێکستەکەشە، واتە هـەمان نیـوە دێـڕ بۆتـە (دەسـتپێكو کۆتـایی) تێکستەکە، لێرەدا دووبارە بوونەوەی میسراعی یەکەم لە کۆتایی پارچەکەدا جۆرێك لە قوفڵو کۆتایی هێنان (خیتام) بۆ تێکست پێك دەهێنێ.[55]

لە تێکستی (فەریاد)دا هاتووە:

(١) جەبین مینای زیو / گەردن هوما / خاڵ مشکی تاتاری/
شەدەشل / چاو بەکل / روو سوورە گوڵ / تەراڕو عەییاری

(٢) کە ئـاوی جۆگەڵەی سابلاغێ نەشئەی چاوی مەخموورت
لە مێرگۆڵەی سەهەندو کێوی لاجانێ بەفر بۆ عالەمێ باری

(٣) وەرە تـا شــەرحی ئەحواڵی دڵی خۆمت لە بۆ بێژم
وەرە تا من بە فرمێسکم بشۆم بۆت پەردەیی تاری

(٤) علیم الله لە پاش تەشریفو چوونی تۆ لە سابلاغێ
وەتەن وێرانو ماڵ سوتاوو کیژ بێ لاوو خوێن باری

(٥) بە زوڵمو جەوری دوژمن بوو بەهاریان زەردە پاییزێك

---

(55) قضايا الشعر المعاصر: ٢٨٠.

له دابەشبوونی هەردوو نیوە دێڕی (١)دا بۆ سەر دوو کەرتی هاوتەریب، ئاوازێکی کشاوی درێژ سازبووە، لە (٢) دا پەیوەندی (هاتو نەهات) نەفی کردنە، ئاوازی ئەم دوو دەنگی (ه)یە لە نیوە دێڕی یەکەمدا لەگەڵ دوو (ه)ی (هێشتە مەهجووری)دا پێك دەگەنەوە. لە (٣)دا لە (رۆژهەلات، تاوهەلات) تیکرار هەیە، تەئکیدی مەعنا دەگەیەنێ، (س) هەر دوو وشەی (دەستو بەستراو)ی بەیەکەوە گرێداوە. لە (٤)دا لەنێوان (یارو ئەغیار) برگەی (یار) کە دەنگی کشاوی (ێ) ناوکەکەیەتی، یەکێتی ئاهەنگی بەهەردوو وشەکە بەخشیوە ئەگەر چی لە رووی واتاوە پێچەوانەن. لە (بەدەسترە بسترە)، برگەی کۆتایی (رە) هەردوو وشەکەی لە رووی ئاوازەوە بەیەکەوە بەستۆتەوە.

لە (حەسبوحاڵ دەگەڵ وەتەن) شاعیر دەڵێ:

بــا بێــتو بــە تەئــسیری فــسوونی نەفەســی تــۆ
وەك خونــچە بپــشکوێ دەمــی ئــەو کــوردە کــە لاڵــە
بــا بێــتو ســبەینان ئەلــەمو دەردی شــەوی هــەجر
بێــژی کــە لــەوەی پــاش خــەوی مــە، مــەحزی وە باڵــە

هاتنـەوەی وشـەی خـۆزی (بابێـت) لـە سـەرەتای هـەردوو دێڕەکـەدا بـە مەبەسـتی بەیەکەوە گرێدانەوەیانە. دەنگی (س) لـە ناوەراسـتی وشـەکانی (تەئـسیری، فسوونی، نەفەسی)دا ئاهەنگێکی رێکی بەردەوامی بە دەستەواژەکە بەخشیووە.

لە تێکستی (هاواڵی ماتەمدار)دا هاتووە:

(١) بۆ چ دەناڵێنی، لەسەر لێوت لە بۆ چ بارکەوتووە
لەشکری زولفت، کە خاوو کاڵە، بۆ چ رووی گرتووە

(٢) قەڵبی شەوقی چۆن حەریمی عیشقە جێی دێرینە تە
بۆ چ دەناڵێنی، لەســەر لێوت، لە بـۆ چ بارکەوتووە

(١). هاتنی وشەی پرسیار (بۆچ ، چ، لەبۆچ، بۆچی...) لە دووتـوێی دێـڕە شیعرەکەداو پاتەکردنــەوەی بــۆ سەرەنجراکێــشانو پــێ داگرتنــە لەســەر مــەعنای پرســیار لــە بارەوەکراوەوە، هەرچەنـدە هەڵوەستەیەکی ئاهـەنگییش دروسـت دەکات، ئـەم نـەریتی پرسیارکردنە لە شیعری شەوقی دا دیارو ئاشکرایە:

لــه مــن بــۆچ زیــزی عــەمرم؟ چــاوەکانم، مــاهی تابــانم
تــەویڵت بــۆ چــی گــرژە، یــا چ قەومــاوە چیە تــاوانم

★ ★ ★ ★

ســـەراپا مەوتـــەنی ئەجـــدادی پێـــشووت جـــا تەماشـــاکە
لە بۆ چ رووخـاوە؟ بــۆ چ سووتاوە؟ کاکت بۆچـی خنکابوو

★ ★ ★ ★

وەتـــەن ئـــەی مـــوڵکی بـــاپیرم، لـــە بـــۆچ ئەورۆکـــە رووخـــاوی
لــە بــۆچ جیّو مەســکەنی وەحــش‌و تیــووره خاکەکــەی پــاکی

لەلایێکی تـرەوە وەکـو لـە (١)دا هـاتووە دەسـتپێکی ئـەم تێکسـتە نیـوە دێـڕی (بـۆچ دەناڵێنی لەسەر لێوت لە بۆچ بارکـەوتووە)یـە، وەکـو لـە (٢)شـدا هـاتووە نیـوە دێـڕی کۆتایی تێکستەکەشە، واتە هـەمان نیـوە دێـڕ بۆتـە (دەسـتپێك‌و کۆتـایی) تێکسـتەکە، لێرەدا دووبارە بوونەوەی میسراعی یەکەم لە کۆتایی پارچـەکەدا جۆرێـك لـە قـوفڵ‌و کۆتایی هێنان (خیتام) بۆ تێکست پێك دەهێنیّ.[55]

لە تێکستی (فەریاد)دا هاتووە:

(١) جەبین میناى زیو / گەردن هوما / خاڵ مشکی تاتاری/
شەدەشل / چاو بەکل / روو سوورە گوڵ / تەراڕو عەییاری

(٢) کە ئـاوی جۆگەڵەی سابلاغیّ نەشئەی چاوی مەخموورت
لە مێرگۆڵەی سەهەندو کێوی لاجانیّ بەفر بۆ عالەمیّ باری

(٣) وەرە تـا شـەرحی ئەحواڵی دڵی خۆمت لە بۆ بێژم
وەرە تا من بە فرمێسکم بشۆم بۆت پەردەیی تاری

(٤) علیم الله لە پاش تەشریف‌و چوونی تۆ لە سابلاغیّ
وەتەن وێران‌و ماڵ سوتاوو کیژ بیّ لاوو خوێن باری

(٥) بە زوڵم‌و جەوری دوژمن بوو بەهاریان زەردە پاییزێك

---

(55) قضايا الشعر المعاصر: ٢٨٠.

لە بێ رەحمیو دڵ سەختی بەباریان بار لە لێو باری

لە (١) دا نیوە دێڕەکە بۆتە سێ کەرتو سازگارییەکی روون لەنێوان هەر سێ بزوێنی درێژی زمانی کوردی (و، ێ، ی)ی سەرواکانیانەوە هەیە، لەنیوە دێڕی دووەمدا سێ ئاوەڵناوی لێکدراوی هاوسەروا وەکو (شەدەشل، چاو بەکڵ، روو سوورە گوڵ) جۆشو ئاوازێکی ناسكو جوانیان ناوەتەوە. لە دێڕی (٢)و (٣)دا ئاوازەی دەنگی (ی)و (ی)کراوە، لە ریزبوونو گونجاندنو بەستنەوەی قەتارەی وشەکان (ناوەکان) بەیەکەوە، چ حەشرو سۆزو ئاهەنگێکی خوڵقاندووە. لەنیوە دێڕی دووەمی (٤)دا (و)ی درێژ ئەو رۆڵەی گێڕاوە. لە (٥)دا سەرچۆپی کێشی ئاوازی وشەکان دەنگی کپو نەرمی (ب)و بڕگەی کورتو ناسکی (بە)یە، کە لە کۆتایی دێڕەکەدا باز دەداتە ئاستی وشەسازیو، (بار) لە (بەباریان بار لە لێو باری) سێ پاتە دەبێتەوە ئاوازو ئاهەنگی دێڕەکە دەگەیەنێتە لوتکەی جۆشو جوانیو لەباری، شیعریەتو ئیستاتیکای دەقەکەشی گەیاندۆتە ئاستی داهێنان.

لە ئاستی دەنگسازیدا وا دەبێ تیپە (نەبزوێنە — بێ دەنگ)کانیش رۆڵێکی ئاوازەیی گرنگ دەگێڕن، با ئەم دوو دێڕە لە (تەحەسوری جەوانی تەرانەیی وەتەن) بەسەر بکەینەوە:

لەوێ تێر ئاو دەبێ خولیای جوانی رووحی غەمگینان
ئوفوولی ئەرغەوانی رۆژی رووی پاش مانگی تابانە
کە خاکی پاکی وی لانکە لەبۆ ئێسقانی باپیرمان
لەسەر قەبری جەوانان دیدەی شللێرە گریانە

لەدێڕی یەکەمدا دەنگەکانی (ف، غ) لەناوەڕاستو (ر) لەسەرەتادا جۆرە ئاهەنگێکی جوانو هەمەچەشنەیان پێکهێناوە، لەدێری دووەمدا سەرەتا (ك)و ئەنجا دەنگی (ل) لە (شللێرە)دا لەرینەوەیەکی نەرمو ناسکی هەیە.

- لەژێر زنجیری زوڵمو بەندی یەخسیری چ مەحزوونە
تەماشای دایکی مەحبووبت بکە چۆن دەستی بەسترا بوو

دەنگی (ز) لە (زنجیرو زوڵمو مەحزوون)دا بۆتە زەنگو زایەڵەی ئاهەنگی وشەکان لەنیوە دێڕەکەدا. رۆڵی (س) لە شەتەك دانی (دەستی بەستراو) روونو ئاشکرایە، ئەم تەعبیرە چەند جار لە شیعری شاعیردا دووپاتە بۆتەوە. لە دوا تێکستی (مەگەر لێم عاجزی) دا هاتووە:

- له پێشا پێشی تابووری موژەت هەردوو برۆت کە چ بوو
دەڵێی بۆ تیپی عاشق زولفەقارە تیغی بوورڕانم
ع
کە مەندی زوڵفی خاوت چونکە بازووبەندی بازوومە
چ حاجەت واعیزی سەر زڵ بە ئەفسون بەستی دەستانم
تەلیسمی گەنجی حوسنی تۆ، موعەممای عالەمی کۆنە
لە حەللی وی بەسەرچوو عومرمو هێشتاکە هەر جوانم
کە نەرمین باوەشی تۆ، بێشکەیە بۆ قەڵبی مەجرووحم
بە لەنجە لێی گەڕێ ساتێ هەدادا توفلی گریانم

(پێشاپێش) جووتە وشەیەو لەپاتەبوونەوەی وشەیەکدا دروست بووە، لەنێوان (تیپ)و (تیغ)دا ڕەگەزدۆزیو تەناسوب هەیە، دەنگی (ز) لە (زولف، بازووبەند، بازوو)، هاتۆتەوەو سەدایەکی وەك یەکی پێداون، (بازوو بەند)یش لە وشەی (بازوو + پاشگری - بەند) سازکراوە. لە (موعەممای عالەمی کۆن) هەردوو دەنگی (م)و (ع) ڕۆڵی سازشی ئاوازەیی نێوان هەر دوو وشەیان بینیوە. لە دێڕی دواییدا ئەوە دەنگی چەڵەنگی (ب)یە کە ئەو تەناسوبە جوانو لەبارەی لەنێوان (باوەشو بێشکەو قەڵب)دا پێکهێناوە.

# بەشی پێنجەم

## مەبەست و ناوەڕۆك لە بەرهەمی شیعری شاعیرانی ناوچەی موكریاندا

## باسی یەکەم

### مەبەستی شیعری لە بەرهەمی مەلامارفدا:

#### ١. پاڕانەوە لە یەزدان:

دەستپێکی دیوانی مەلا مارف قەسیدەیەکە لە وەسفو ستایشی پەروەردەگاری مەزندا لەژێر ناوی (سوپاسی یەزدانی مەزن) کە تیایدا دەڵێ:

هەچـــی زەڕڕاتـــی عـــەرزو عاسمانـــە
کـــوراتی بـەرهەتـــاوی لانـــساری
لـــەدێری رووپـــەڕەی دەورو زەمـــانی
بـەهـــەر نـەخـــشێ تماشـــاکەم دیـــاری
عـــەزیزی تـــۆ لـــە هـــەر لا خۆشەویـــشتە
زەلیلـــی تـــۆ بەکـــەس نایـــەت قوتـــاری
گوڵـــستانو گـــوڵو گـــوڵزارو گوڵـــشەن
نـــەیو شمـــشادو ســـەرووی جوێبـــاری

ئـەنجا شـاعیر دەسـت بـە دوعـاو پاڕانـەوە دەکـات بـۆ ئـەوەی بکەوێتـە ژێـر لوتـفو مەرحمەتی کردگار:

بـــەنازو رزاو ئیعجـــازی موحەممـــەد
بـــە ئەســـحابو بـــە ئـــالیو چـــوار یـــاری
بـــە هـــاوارم بگـــە لانم زەلیلـــە
بـــە غەیـــری تـــۆم نییـــە هومێـــدەواری
ئـــەمن مەعروفەکـــەی تـــۆمو پەشـــێوم
ســـەری تێکـــردووم پـــیریو هـــەزاری

شـاعیر لـە قەسیدەی (بـاڵی سـەمەندەرو یارمـەتی دوازدە ئیمام)، دەکەوێتـە وەسـفو ستایشی ئیمامەکانی ئاینزای شیعەو یەکە بە یەکە ناویان دەبات:

رەسمەن لەسەرم لازمە عەرزێكی بنووسم
بۆ مەحكەمەی سالحەیی حەزرەتی (حەیدەر)
ئەی (بول حەسەنا)، بم بە غولامی حەسەنەینت
خاكی قەدەمی سەییدی (سەجادی) منەوەر
جارۆكەشی خاكی قەدەمی (باقری) تۆیە
كەیخوسرەوو داراو فەرەیدوون و سكەندەر
یەك نوختە لە عیلمی لەدونی (سادیق)ە ئەورۆ
نووسراوە لە ئەوراقی دڵ و سینەوو دەفتەر
قوربانی سەراپەردەی (موساو رەزا)تم
بالاترە قوببەی لە سەراپەردەیی ئەخزەر

تا دەڵێ:

ئەی پادشەهی مەسنەدی ئیقلیمی ویلایەت
ئەو رۆژە كە (مەهدی) لە تەرەف حەزرەتی داوەر
خەلعەت دەكرێ ئەفسەرو ئەورەنگی عەدالەت
نامێنێ لەسەر سەتحی زەوی ناوی ستەمگەر
من عاریزم ئەو رۆژە لە ئەو زاتە بزورگە
تەعقیبی دەكەم تا دەگەمە دامەنی مەحشەر

## ٢. وەسفی سروشت

لە لیریكی (خیوەتی گوڵ و تنۆكەی شەونم)دا دوای ئەوەی لۆمەو سەرزەنشتی وشكە سۆفی دەكا لەوەی كە چاوی بە بەهاری رەنگینی وڵات هەڵنایە ئەنجا دەڵێ:

تێفكرە تماشاكە لە كووچەو لە خیابان
سۆزی نەیە نەشئەی مەیە ئاوەزەیی تارە
پۆڵ پۆڵ سەفی مەحبووبە لە گوڵزارو چەمەندا
تۆ دێوی مەگەر مەنزڵی تۆ هەر لە موغارە
رایخستووە فەرڕاشی سەبا فەرشی زومەڕڕەد
وەك ئەتلەسی یەك رەنگە بەبێ گەردو غوبارە

شاعیر لە نامەیەکی شیعریدا کە بۆ (ئاغای موهتەدی) نووسیوە لە وەسفی سروشتی جوانی دێیەکەیدا (ئاشی گوڵان) گوتویە:

ئاشـــی گوڵانـــە مـــەنزلی یـــانی لەبـــەر گـــوڵان
قـــوترو موحیـــتو مـــیحوەرو قـــوتبی مـــوعەتتەرە
تـــا چـــاو هەتـــەر دەکـــاتو هـــەتا دڵ دەڵـــێ بەســـە
بـــاغو درەخـــتو عـەرعـــەرو ســـەروو ســـنەوبەرە
خـــەملیوە ســـەر زەمینـــی بـــە غونـــچەی گـــوڵ ئاتەشـــی
ئـــاوی لەتیفـــە، ســـافە، هـــەوای عـــەتر پـــەروەرە
فەرشـــی زومـــەڕڕەدی، گـــوڵی زەردو ســـوورو ئـــاڵ
تێکـــەڵ بـــووە دەڵێـــی تەبـــەقی عـــودو مەحجـــەرە

لە وەسفی جوانی یارەکەیدا دەڵێت:

کـــە حوســـنی یـــارو ئـــەغیارم لـــە میزانـــی خـــەیاڵم دا
بـــە دڵ دیـــتم هەمـــوو لاییکـــە، ئـــەو تـــەنیا لـــە لاییکـــە
خەزێنـــەی روومـــەتی لـــەعلی، لـــەبو ســـیمی زەنەخـــدانی
گـــوتم بێتـــو خـــودا بیـــدا عەجـــەب گـــەنجو تەلاییکـــە
ئیـــشارەی کـــرد لامـــی زوڵفـــی ئـــەلفی قامـــەتی یـــەعنی
جـــەوابی قـــەددی داڵـــی تـــۆ فەقـــەت لامەلفـــە لایـــێکە

لە وەسفی شاری مهاباد دا دەڵێ:

هـــەزار حـــەیفو ئەفـــسووسە بـــۆ ئـــەم شـــارە رەنگینـــە
کـــە قابیـــل بـــوو ببێتـــە مەرکـــەزی هـــەر شـــاوو شـــازادە
عیمـــاراتو قـــســـوورو بـــاغو بـــاغاتو گوڵـــستانی
هـــەزار ســـوێندت دەخـــوارد دەتگـــوت بەحەشـــتی بـــاغی شـــەدادە
موغـــازەو قەیـــسەریو دوکـــانو حـــوجرەی وا موجەلـــەل بـــوو
وەکـــو قەســـرێ کـــە بـــۆت قەیـــسەرت کـــرا بـــێ ســـازو ئامـــادە
لەبـــەر پارچـــەی حـــەریری زەردو ســـوورو ئەتلـــەسو زەڕڕی
لـــە رەنگـــی ســـەوزو ئـــاڵو کەســـکو شـــینو میـــشکیی ســـادە
فتـــوورەی پـــڕ فتـــووری روسو ژاپـــۆنو بـــەریتانی
مـــەتاعی هینـــدیو مـــاڵی فـــەرەنگو چـــینو کانـــادە

بەیــەك ئەنــدازە رەنگــینو موزەیــەن بــوو كــە پێــت وا بــوو
نموونــەی ئەســكەلەی بێــرووتو شــامو شــاری بەغــدادە

دیوان: ٣٨

### ٣. رووداوی مێژوویی

١. شاعیر قەسیدەیەكی درێژی هۆنیوەتەوە سەبارەت بەو كارەساتی لافاوەی لە ساڵی ١٩٣٦دا بەسەر شاری مهابادا هاتووە، كە دواتر ساڵی رووداوەكە لە مێژووی ناوچەكەدا بە (ساڵی سێڵاوی) تۆماركراوە،[1] شاعیر رووداوو كارەساتەكەی لە قەسیدەیەكی (٤٥) بەیتیدا بەناوی (سێڵاوی بەدبەختی) تۆماركردووە، سەرەتا وەسفی پەرێشانی حاڵی خەڵكە لێقەوماوەكەی شار دەكاتو ئینجا دێتە سەر رووداوەكە:

لــە تــاریخی هــەزارو ســێ ســەدو ســیو پێنــچی شەمــسیدا
بــە رۆژی جومعــە دوازدەی جیمــی ئــەوەل نــۆوی مــوردادا
لەهــەوری قــودرەتی بــاری قــەریبی نیــو ســەعات بــاری
چ بارانێــك نــەبارانێ كــە وا مــەعهودو مــوعتادە
موبــەدەل بــوو بــە چــەندین سـانیە ئــەو سـافی بـارانی
بەیــەك دەریــایی عوممــانی كــە هــیچ تــاریخ نیــشان نــادا
خوداوەنـــدا چ تۆفانێكـــە وابـــێ عاتیفـــەو روحمـــە
خوداوەنـــد چ ســـێلاوێكە ئـــەم ســـێڵاوە بێـــدادە

ئەنجا لە تینو تەوژمی لافاوەكە دەدوێ:

ئــەوەی دەیهاتــە پــێش هــەر دەیروفانــدو لای دەداو دەیــبرد
لــە حــەیوانو جیمــاداتو نەبــاتو ئــادەمی زادە
بەمــەوجی ئــەووەلی دەیــبردە ئــەوجی رەفعــەتو عیــزەت
لــە مــەوجی دووەمیــدا گــوم دەبــوو وەك دوڕ لــە دەریــادا
لــە پــاش تــالانی نێــو شــاری هجــوومی بــردە بــازاڕی
بــە زیــددی شــوغڵی میعمــاری كــە داوێنــی بــەلادادا
مـــوحیتی دایـــرەی دوكــانو بـــازاڕی بـــە ئاســـانی
بــە ســەتحو ســەقفو ســەربانی خــولی پێــدا قــولی بــادا

---

(1) مهابادو كورتە مێژوویەك: ٧٤.

٢. ساڵی ١٩٣١ لەنێوان هێزەکانی سمکۆی شکاك‌و هێزەکانی دەوڵەت شەڕو تێکهەڵچوونێك لە دەوروبەری شاری مهاباد روودەدا، لە ئاکامدا هێزەکانی دەوڵەت تێك دەشکێن، ئەنجا هێزەکەی سمکۆی شکاك کە بەشی زۆری لە عەشایەرو خێڵەکانی ناوچەکە پێکهاتبوو هێرش دەکەنە سەر مهابادو تاڵان‌و بڕۆیەکی زۆری تیادا بەرپادەکەن، ئەو رووداوەش بەناوی (ساڵی شکاکان) لە مێژووی ناوچەکەدا تۆمار کراوە.[2] کۆکەیی لە قەسیدەیەکی نەفرەت ئامێزدا ئەو مێژووەی بۆ تۆمار کردوین، تیادا هێرش دەکاتە سەر عێل‌و عەشایەری ناوچەکەو سووك‌و چروکیان دەکات:

کوردیش چ کوردە میللەتی خۆ خۆرە پێکەوە
بۆ گیان‌و ماڵی یەکتری سمکۆڵ دەکەن لە خۆڵ
دێوو درنج‌و ورچ‌و بەرازو رێوی‌و چەقەڵ
کوێرو کەڕو شەل‌و کەچەڵ‌و گۆج‌و گێڕو گوڵ
یەعنی گەورك‌و مەنگوڕو پیران‌و کاڵە موو
زەرزاو شکاك‌و مامەش‌و هەرکی سەگی گەرۆڵ
بۆ ماڵی کوردی هاتنە سەماو رەقس‌و پێکەنین
بەربوونە گرمەگرم‌و چەق‌و لووڕو کۆڵەگۆڵ
وەك گورگی هارو برسی بڵاوبوون لە دەشت‌و دەر
دەخولێنەوە هەموو ئەشکەوت‌و خڕو شیوو دۆڵ

ئەنجا لایەنێکی دیکەی کارەساتەکە روون دەکاتەوە:

ئاوەل کراسی کیژو کچ‌و خانمی وەتەن
دایان ڕنین ئەوان دەسەبابانی قون ترۆڵ
سابلاغی دەستو پێ بە خەنەی قەت هەتاو نەدیو
رەنگین‌و نازەنین‌و سپی‌و سۆڵ‌و نەرم‌و نۆڵ
قازی‌و مەلا تاجیرو ئەسناف‌و ئەهلی شار
گیران بە سوغرە کەوتنە ژێرباری دارو کۆڵ
سەردارو کەیخودایی موکریان خەلات کران
رانکێکی کون‌و لەتلەت‌و چۆغێکی بێ گرۆڵ

---

(2) سەرچاوەی پێشوو: ٧٤.

ئــەو رۆژە غــیرەتو شــەرەفو دینـــی خــۆت فـرۆت
ئــەی ئافــەرین رەئــیسو ئــەمیرانی تــوندو تــۆڵ

## ٤. شانازی

کۆکەیی لە زۆر شوێنی دیوانەکەیدا شانازی بە خۆیو بە شاعیریەتو بەرەوانی تەبعو سەلیقەی خۆی دەکاتو بەخۆیدا هەڵ دەڵێت، وەکو لەم نموونانەدا روون دەبێتەوە:

مــن کــە مــەعرووفم لــە گوڵـشەندا غـەزەل خـوانی ئەکـەم
جـاریٚ تـــەرحی نەقـشی ئـەرژەنگو دەمـیٚ مـانی ئـەکەم
دەفعـــەییٚ مـــەیلی تـــەرەب تـــاویٚ موســـولمانی ئەکـــەم
گـــا هـــیٚ پـــەروازی بڵنـــدی ئـــەوجی رووحـــانی ئەکـــەم

دیوان: ١٤

چـییە سـا بەسـیە شـاعیر مـەوعیزەو شـیعرو غـەزەل خـوانی
مـــەتاعی تـــۆ هـــەمووی بـــیٚ قیمـــەتو بـــیٚ رەونـــەقو رەنگـــە
کـە شـعرت وەك سـەدەف فـەرزەن هـەموو پـڕبن لـە دانـەی دوڕ
لـــەلای ئەشـــخاسیو شـــكو بـــیٚ تـــەبیعەت ئاســـنو ســـەنگە
کـــە مـــەقبوولی جـــەنابی شـــێخو ئـــەربابی تەبیعـــەت بـــیٚ
نیگـــارین خانـــەیی نەققاشـــی چـــینو نەقـــشی ئەرژەنگـــە

دیوان: ٢٤

هەر بۆ نیشاندانی دەسەڵاتو توانای شاعیری خۆی، لە پارچەیەکدا بۆ (عەزیز) ناوێك دەنووسیٚ:

بـــۆ بـــە شـــارەت نەقـــدی جـــانو قیـــسمو ئـــەنواعی غـــەزەل
کامـــەیان چـــاکن بـــەوە بـــۆ تـــۆ ئـــەمن تـــەعزیم دەکـــەم
ئـــەووەڵی شـــەو شـــێعری شـــوکرو نیـــوە شـــەو شـــێعری بـــەقا
ئـــاخری شـــەو شـــێعری حوســـنی عاقیبـــەت تـــەنزیم دەکـــەم
توتیـــی تـــەبعم بـــە یـــادی قـــەندی لـــوتفو ســـوحبەتت
شـــەککەر ئەفـشانە منـیش هـەر شـوکری تـۆی تـەعلیم دەکـەم

دیوان: ٨٩

### ٥. پەرێشانیو داخی دەروون

وەکو لە ژیاننامەکەیدا بۆمان ئاشکرا دەبێت، کۆکەیی بە درێژایی ژیانی دووچاری چەرمەسەریو نەگبەتیو نەهامەتی هاتووە. جگەرسووتان، وێڵیو دەربەدەری، هەژاریو دەست تەنگی، کوێریو نابیناییش دەبێتە سەرباری هەموو دەردان، بۆیە لە زۆر شوێنی بەرهەمە شیعرییەکانی تەعبیری رەوانو روونی ئەم حاڵەتی هەژاریو پەرێشانیەی بەدی دەکەین، هەست بە ناڵەو داخو کەسەرەکانی دەکەین:

مەڵێن یا شێتە یا مەستی شەرابو ئارەقو بەنگە
خەیاڵاتم پەرێشانە، دڵم تاریکە هەم تەنگە
مەکەن مەنعم لە هەوری بیری من بارانی خوێن بڕژێ
لە سەحرای سینەدا دیسان هەرایە شۆڕشە جەنگە
شەهی ئقلیمی بەدبەختی لە بۆ تەسخیری مولکی دڵ
هوجوومی کردووە تالب بە تاجو تەختو ئەو رەنگە

دیوان: ٢٢

لە تێکستی (سکاڵاو زایەڵە)دا زبانی شاعیر بەم شێوەیە هاتۆتە گۆ:

رووی زەمانەی بێ وەفا رەش بێ وەکو رووی مودەعی
بێ بەشی کردم لە سوحبەت کونجی میحنەت جێگەمە
ئاهی سەردو رەنگی زەردو میحنەتو جەورو جەفا
موئنیسو یارو رەفیقو هەمنشینو هەمدەمە
کێوی کەللەم وەك دەماوەند دەمێ خاڵی نییە
یا بە تەم مەشغوولە یا مەشمووڵی هەورو ماتەمە
بۆ مەتاعی دیدە چاوم خوێن دەرێژێ دەم بەدەم
رۆژی رووناکم شەوی تاریکو لەیلی موزلەمە
لەشکری فەقرو پەرێشانی هوجوومیان کردووە
دەورەیان داوم بە نێزەو خەنجەرو شیرو قەمە

دیوان: ١٠٣

شاعیر بە چاکی پەی بە زوڵمو ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی دەبات، بەتایبەت لە کۆمەڵێکی خێڵەکیو دواکەوتوودا بۆیە دەڵێ:

کـه مــن شـــەمعی ئومێـدم کەوتـە نێـو فـانۆسی زولــمانی
بە من چی گەر چرای عالـەم هـەموو وەك ڕۆژی ئـەنوەر بـێ
کـە مــن شــاهی وجــودم بــەیتول حــوزنی وەحــدەت بــێ
بـە مـن چـی گـەر هـەمو دنیـا نیـزامو تـۆپو عەسـکەر بـێ
کـە مــن جــامی شـەرابم پـڕ لـە ژەهـری مـارو ئـەقرەب بـێ
بـە مـن چی شەربەتی تۆ پـڕ لـە شیرو شـەهدو شـەککەر بـێ

دیوان: ٢١

شاعیر گلەیی لە دەست بێ وەفایی و وەرگەڕانی ڕێو ڕەسـمو نەریتـە مرۆڤایەتییـەکان دەکات:

دەردی بێ دەرمانو سەرباری هەموو دەردی گران
بـێ وەفـایی دۆسـتانو ئینقلابی عـالەمە
رایەڵو پۆی تێکچووە ماشینەکەی چەرخی فەلەك
هەروەکو ئەوزاعی من ئاڵۆزو دەرهەم بەرهەمە

دیوان: ١٤

### ٦. ستایش و سەرزەنشت

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو چەمكو مەبەستە دژ بەیەكو پێکەوە ناکۆکن، کەچی بەلای ئێمە دوو دیوی پێکەوە گرێدراونو لە بەرهەمی شاعیردا دوو مەبەستی هەرە گرنگو دیارو بایەخدارن، کۆکەیی شاعیرێکی ڕەندو سالووك بووە، بەم دوو چەکە ڕووبەڕووی ناعەدالەتییەکانی دەوروبەرەکەی بۆتەوە، بۆ دابین کردنی بژێویو وەدەست خستنی لوقمەنانێك، کە ئەویش زۆر بـە زەحمـەت بۆی دابـین بـووە، جگـەر گۆشـەی خوێنو دەمـارو بـیرو هۆشـی، واتـە قەسـیدەو غەزەلـەکانی کردۆتـە شاباشـی ئاغایـەك، وەجـاغ زادەیـەك، خێرومەنـدو خێرخوازێـك بـەو هیوایـەی خـەڵاتو بـەراتێکی لـێ دەسـت بکەوێت، لەبەرامبەر ئەو کەسانەشدا کە قەدریان لـە خـۆیو لـە بـەهرەو هونەرەکـەی نەناوە، ئەوا بەندو قافیەو بەیتـە مزرەکـانی کردونەتـە پۆلـوی ئـاگرو بـەری داونەتـە پووشـوی تـەبعو زەوقو سـەلیقەی وشـکیانو هێـرەی پێکـردوون، قـسەی مـزرو موستەحەقی حەواڵە کردوون، تا ببن بە پەندو عیبرەت لەناو ویلایەتدا. سەرەتا ئاوڕ لەلایەنی پیا هەلگوتنو ستایش لە بەرهەمی کۆکەیی دەدەینەوە:-

لە باسی چاو تێری‌و بەخشایشی حەمەد ئاغای عەبباسیدا دەڵێ:

ئـەی سـەبا چـاوی سـەرم زەحمـەت بکێـشە تـا سـەرا
سـەهلە بـۆ تـۆ گەرچـی دوورەو پـێچ‌و هـەورازی هەیـە
بـۆ حـزووری مەرکـەزی ئـالی بـەنی عەبباسـیان
ئـەو جـەوادە شـۆرەت‌و تـەعریف‌و ئـاوازی هەیـە
مونعمێکـە ریـزە خـواری نیعمـەتی بـێ میننـەتی
خـۆش تـرە وەزعـی لـە ئاغایـەك کـە دەریـازی هەیـە

ئەنجا شاعیر دێتە سەر ئەسڵی مەبەست‌و دەڵێ:

پرتـەوی شـوعلەو شـوعاعی دایـرەو ئینعـامی تـۆ
بـۆ شـەوی تـاریکی ئـەو حـوکمی چـرا گـازی هەیـە
گەرچـی چـەن سـاڵە لـە دەروازەی سـەرایی هیمـەتت
یـەك حقـوق‌و قیمـەتی بـێ کەسـرو سـەر ئـەفرازی هەیـە
مونتـەها ئـەو سـاڵ لەبـەر دەخلـی کـەم‌و خـەرجی گـەزاف
ئینتیـزاری جـایزەی مەخـسووس‌و مومتـازی هەیـە

دیوان: ٥٠

هەروەها لە تاریف‌و ستایشی حەسەنی سەیفی قازی دا دەڵێ:

ئـەی حەسـەن ئـەی سـاحەبی وەجهـی حەسـەن
مەزهـەری فەرمایـشی جـەددول حەسـەن
یـانی فەرموویـە ئەگـەر خێرتـان دەوێ
(أطلبُـوهُ مِـنْ ذوِي الوَجْـهِ الحَسَنْ)
تـا دەمێـنم دەس لـە تـۆ هـەڵناگرم
پـارەم کـەن بـە سـەیفی بولحەسـەن
هـیچ‌و پووچـە قیلوقـالی مـوددەعی
گـشتی بـێ ئەسـڵ‌و پـرو پـوچ‌و قـسەن
چـەندە پـێم خۆشـە ببیـنم دوژمنـت
پـێ لەسـەر کورسـی لەگەردنـدا رەسـەن

دیوان: ٥٦

هەروەکو لە شوێنێکی تردا بۆ (قازی حەمامیانی) نووسیوەو دەڵێ:

قەڵــەم هەســتە بنووســە بــۆ حــزووری حــەزرەتی قــازی
لــە پــاش عــەرزی ســەلامو ئیحتیرامــاتو ســەر ئــەفرازی
لــەوێ ڕۆژێ کــە تــۆ ڕۆیــی لــە شــاری هیجرەتــت فــەرمو
وشــك بــوو نــەهری شــێعرو بــەحری فیکــرو نیکتەپــەردازی

لە تاریفی (سەییدی شەمسی)یشدا دەڵێ:

ســەییدی شەمــسی کــە شەخــسێکی نەجیبــەو موحتــەرەم
واقیعــەن شایــستەیە گــەر پێــی بڵــێین ئــەهلی کــەرەم
مــن لــەلام وایــە کــە نەیــدیوە لــە مەکتــەب حــەرفی لا
بۆیــە کــەس نــەی بیــستووە لــەو ســەییدە ئــیللا نەعــەم
کافییــە بــۆ مــەتحی وی ئــەمڕۆ لــەنێو ئــەم شــارەدا
فیلمەســـەل مـــەشهوورە وەك نــارولقوڕا فەوقــەل عەلــەم

دیوان: ٦١

سەبارەت بە میرزا کەریمی شاتریش گوتویە:

ئافــارین (پاشاســـن) ئــەی مــیرزا کــەریمی شــاتری
ئیفتیخــاری خانــــەدانو دوو دمــــانی تــــاجری
مەئخــەزی ئیــسمت ســەبەب بــوو ناتیقــەی هێنایــە کــار
وەرنــە عــەزمم کردبــوو لادەم لــە خــەتتی شــاعیری
فــەخرە بــۆ ئــەربابی هیمــەت گــەر بــە یــادی نێــوی تــۆ
لێبــدەن شــامو ســەحەرگاهان لــە تــەپڵی نــادری
بــا کــەریمانی مــەجازی پــڕ بکــەن بــۆ ئیمتیــاز
گــوێ لــە حەڵقــەی بەنــدەگی گــەردن لــە تــەوقی چــاکری
جەوهــەری ئیکــرامو حوســنی ئیحترامــت لایقــە
گــەر بڵــێم تــۆ هــەر لــە خــاكو بــادو ئــاوو ئــاوری

دیوان: ٩١

ئــەم ئــەدگارە لــە بەرهــەمی کۆکەییــدا ڕووبــەرێکی فراوانــی داگــیر کــردووەو لــە نموونــەکانی وەکــو (کــاکی چــەلەبی، بــۆ ئاغــای بلــووری مهابــادی، شــێعری قەشمــەرو جــەحێل، بــۆ مــەلا حوســێنی مــەجدی، دۆزەخو جەننــەت، قەلعــەی ئەلــەموت، گــوڵو

گولزارو باغی ئەدەب)دا دووبارە دەبنەوە، دەردی گوتەنی[3] رەنگە هەندێ جار ستایش کراو لەکەر کەتر بوو بێت بەلام شاعیر لەبەر موحتاجیو لە پێناوی نیو کیلۆ گۆشتدا، یا دوو کەللە قەند، یا کۆنە عەباییكو دەستە لیباسێکی پەرپووت، هەستاوە بەناچاری شیعرو قەسیدەی پێشکەش کردووەو بە شانو بالی خۆیو بنەماڵەکەیدا هەلگوتووە. دیارە زۆریش هەبوون کە پیاوی خێرومەندو چاكو قەدرزانی شیعرو شاعیری بوونو لایان لە شاعیر کردۆتەوەو دەستی پیاوەتییان لە ئاستیا نەگێڕاوەتەوە. بەلام خەلکانێکی سەقیلو قرچۆكو چرووکیش هەبوون کە دەستیان بە روویەوە ناوەو لە ئاست بانگو هاواری شاعیر گوێیان کەڕکردووە، ئەویش مەردانە لە حەقییان هاتووە، بەتایبەت ئەو بەناو خەلیفەو قازیو کەسایەتییە نەفامو نەزانە ویژدان مردووانەی دڵ رەقییان لە بەرامبەریا نوواندووەو لەبەر خۆشەویستی پوولو پارە هیچ خزمەتێکیان بە شیعرو شاعیری لەبەرچاو نەگرتووە، یا ئەو عێلو تیرەو تایەفانەی لەبەر خۆ خۆریو بەرژەوەند پەرەستی هیچ کۆمەکێکیان بە رێبازی گەلو نیشتمان پەروەری لەبەرچاو نەبووە. شاعیر دلێرانە، بێ ترسو دلەراوکێ پەردەی شەرمەزاری لەسەر رەفتارو هەلسوکەوتی نالەباریان لادەدا.

لە قەسیدەی (سێلاوی بەدبەختی)دا شاعیر کاتێك بە وردی وێنەی ئەو کارەساتە جگەر بڕە دەکێشێ کە لافاو بەسەر شاری مهابادو دانیشتووانەکەیدا هێناوە، کەچی ئەوەش لە بیر ناکات کە لەولاوە کەسانێکی نەفس نزم هەبوون کە بەناو لەخوا ترسو زاهیدیش بوون، ئەو دەرفەتەیان بەهەڵ زانیوە بۆ تالانو بڕۆو ماشتنەوەی کەلو پەلو مالی خەلکی لێقەوماو، لاشیان وابووە دەسکەوتو غەنیمەتێکی موفتو حەلالە:

> وەکو فەیئو غەنیمەت بۆ مەتاعی موفتو بێ قیمەت
> دەیان هێنا بەبێ زەحمەت بە بارو کوڵو عەرڕادە
> لە بۆ یەك تۆپە چیت بوو خۆی دەخستە چۆمو بن گۆمێ
> ئەوەی خەلکی دەیانگوت ئەهلی زیکرو فیکرو ئەورادە
> بەلێشاوی دەهێنا مالی ئاوبردەی موسولمانان
> لە لاشی وابوو سەرکردەو رەئیسی جەیشی زوهادە
> کە دەتگوت چت لە چیت، داوە حەرامە پیسە مورداره
> دەیانگوت نیعمەتێکە موفتو مالێکی خودا دادە

دیوان: ٤٣

(3) چێشتی مجێور: ٣، ٤٥.

شاعیر لە ریسواکردنی هەڵمەتی عێلانی تالآنچی بەناو کوردو هاونیشتمانی، بۆ سەر شاری مەهاباد لەکاتی شۆڕشی سمکۆدا، لە هیچ ناپرنگێتەوە، قسەی وایان پێ دەڵێ شستو شۆیان دەشکێنێ:

بـــۆ مـــاڵی کـــوردی هاتنـــە ســـەماو رەقـــس و پێکـــەنین
بەربوونـــە گرمـــەگرم و چـــەق و لـــوورو گۆڵـــە گـــۆڵ
وەك گـــورگی هـــارو برســـی بلاوبـــوون لـــە دەشـــت و دەر
دەخولێنـــەوە هـــەموو ئەشـــکەوت و خـــڕو شـــیوو دۆڵ
بـــۆ کاڵـــە کـــۆن و ناڵـــە شـــکاوی فـــڕێ دراو
خۆیـــان دەخـــستە ئـــاوو ئـــاورو ژێـــر ئـــەرزی چـــاڵ و چـــۆڵ
پـــوول و ئەســـاس و دەوڵـــەت و مـــاڵی نـــە کـــەم نـــە زۆر هیـــچیان
نەهێـــشت و بۆمـــە نـــەما غـــەیری خـــاك و خـــۆڵ
عـــێلات کـــە رووی رەشـــە لـــە شـــەرەف پـــاکی بـــێ بەشـــە
ئـــەمما بڵـــێن بـــە خـــان و خـــەوانین و مـــیرو قـــۆڵ

کۆکـەیی لـە ئاسـت دڵرەقـی و گـوێ پێنـەدانی خەلیفـەی گونـدی ئێنـدرقاش بـە داواکارییەکانی لێی تووڕە دەبێت و لە چەند شوێنێکدا زۆر چاکی دەشێلێت:

خـــەڵاتی نـــارد خەلیفـــەی دەســـت و پـــێ رووت
عـــــەبایێکی رزیـــــوو کـــــۆن و فـــــەرفووت
کـــە تێفکـــریم ســـەنەی تـــەئریخی عـــومری
موعاســـیر بـــوو لەگـــەڵ تـــالووت و جـــالووت
بـــە حـــوکمی زەرەبینـــیش نەتـــدەزانی
کـــە عەســـلی پەمپەیـــە یـــا پـــەشمی مـــەخلوت

دیوان: ٧١

هەروەها لە باسی رەوشت و خووی خەلیفەدا گوتویە:

لـــە بـــاب و فەســـڵی تـــەزویرو ریـــا هێنـــد چوســـت و چـــالاکە
هـــەموو کـــەس خـــۆ دەپـــارێزێ لـــە مـــەکرو کەیـــدو تـــەزلیلی
وەکـــو جـــەردەی موســـەللەح دەچـــتە ســـەر رێگـــەی موســـولمانان
بـــە ئیمـــان ئیکتیفـــا ناکـــا دەکـــا نـــەزعی ســـەراویلی

هـــەموو رۆژێ لـــە مەكتەبخانـــەیی تـــەدریس‌و تەدلیـــسی
دەنووســـن ســـەد جـــەوازی نـــومرە یـــەك روتبـــەی عـــەزازیلی
بـــە ریـــش‌و ســـورمەت‌و عەمامـــەو شـــكڵ‌و هـــەیولائی
بـــە لـــەحنی نـــازك‌و قـــەوڵی ئـــەكازیب‌و ئـــەباتیڵی
فریـــوی جـــاهیلی وەحـــشی دەدا بێـــچارە نازانـــێ
مـــەقام‌و مـــەنزلی ئیبلیـــسە ریـــش‌و پـــێچ‌و مەنـــدیلی
(أیـــا مَـــن قُلـــتَ إن الـــشِعرَ عِـــصیانٌ ونُقـــصانٌ)
( لكمْ إحسـاتكم یـا لائِمي نَقْصي وذَنبي لي)

دیوان: ٧٢

كەسانێكی بەمـەزەو خـۆش زەوق دەچـنە بـن كلێـشەی مامۆسـتا كۆكـەیی‌و وای بـۆ دەهۆننەوە كە جەنابی مەلا حوسێنی مەجدی سەرۆكی زانایانی مهاباد زەمت دەكات، مەلا مارفیش نایكاتە نامەردی ئەم چەند دێرە نەستەقەی حەواڵە دەكات:

خـــواهیش دەكـــەم بڵـــێن بـــە جـــەنابی مـــەلا حوســـەین
زۆر عـــەیب‌و حەیفـــە لـــە بۆمـــە بـــەعزێ قـــسان بكـــەین
ئـــەو زەمـــی مـــن بكـــات‌و مـــن مـــەتحی ئـــەو بكـــەم
تێكیـــش بگـــەین كـــە هەردوكمـــان درۆ ئەكـــەین

دیوان: ٩٨

### ٧. بابەتی كۆمەڵایەتی

گۆڕان‌و نوێبوونـەوەی شـیعری كوردی لـە دوای جـەنگی جیهانیی یەكـەم لـە گـۆڕانی ناوەڕۆكـەوە دەسـتی پێكـردووە، كاتێـك مەبەسـت‌و بابەتـە كۆمەڵایەتییـەكانی چـاكەخوازی‌و زانـست پـەروەری‌و بـانگی عەدالـەت‌و یەكـسانی لـەژێر كاریگـەری ئاڵوگۆڕەكـانی جیهـان‌و ژیـان‌و دەسـتكەوتەكانی شارسـتانیەت چـەكەرەی كردۆتـە نـاو شـیعری كـوردی‌و دەروازەی تـازەی بـەڕوودا كردۆتـەوە، هـەر ئەمـەش بۆتـە مایـەی رەنگدانەوەی بابەتگەلێكی جۆراوجۆرو تاڕادەیەك جیاواز لەگەڵ پێشوو لە نـاوەڕۆك‌و مەبەستەكانی شیعری كوردییەوە، كە هەر ئەم ئاڵوگۆڕو پێشكەوتنە لە پاشانا دەبێتـە مـاكی گـۆڕان‌و نوێبوونـەوە لـە شـیعری كـوردی لـەباری شـێوەو روخساریـشەوە. بابەتگـەلێكی لـە وێنـەی زانـست پـەروەری‌و، چاكـسازی كۆمەڵایـەتی لـە ریـزی مەبەستەكانی شیعری كۆكەیین‌و لێرەدا ئاوڕیان لێ دەدەینەوە.

شاعیر لە تێکستێکیدا رووی قسەی لە رۆڵەکانی میللەتەکەیەتی‌و داخ‌و کەسەر بۆ هەژاری‌و نەخوێنەدەواری‌و دواکەتووییان هەڵدەرِێژێ، ئەنجا داوایان لێدەکات کە ئاگاهی پەیدابکەن‌و رووبکەنە زانیاری‌و سەنعەت‌و باوەش بۆ دەستکەوتەکانی شارستانیی بکەنەوە:

بیشۆنەوە پێم چاکە بە سابوونی سەداقەت
ئەم چڵکی نیفاقە لە دەم‌و چاوو لە دەستا
ئیقدام‌و قیامێکی بکەن روو بە سەنایع
هەر بۆ مەیە تەنیا کە بەهار بۆتە زمستان
ئەورۆ لە فونوون‌و هونەرو عیلم‌و سەنایع هەرکوردە
کە بێ حیسەیە باقی هەموو وەستان
برِوانە لە نووری هونەرو شەمعی مەعاریف
تاریکە شەویش بۆتە قەمەرستان

دیوان: ١٧

لە بارەی رەوشت‌و خوی نالەباری کۆمەڵێ کوردەواری شاعیر زۆر بە توندی دەدوێ‌و زیادە رۆیی دەکات کاتێك کە دەڵێ:

من لە داخی کوردی بەد ئەخلاق‌و بێ عیلم‌و سەواد
یا دەبێ بمرم وە یا هیجرەت بکەم بۆ کێوی قاف
عونسورو ماهیەتی ئەم قەومە هەر کیبرو غروور
هیچ لەباریاندا نییە غەیری درۆو لاف‌و گەزاف
حەق نەناس‌و ناسپاس‌و بێ ئەساس‌و بێ حەواس
موفسیدو ئەهلی غەرەز مایل بە جەورو ئیعتیساف
کەس نییە پێیان بڵێ ئەی پرِ نیفاقی بێ ویفاق
تابەکەی تو خودا هەتاکەی ئەو شیقاقەو ئیختیلاف
غەیری کوردی بێ تەعسوب میللەتی دنیا هەموو
بوونە ساحێب سەروەت‌و عیلم‌و سەوادو مووشکاف

گ / نیشتمان، ژ/٢٠:٣

هەروەها گلەیی لە سەرۆك‌و سەرکردەکانی عەشایەری کورد دەکات کە نەیانتوانیوە رێبەرایەتی میللەت بکەن بەرەو پێشکەوتن‌و سەرفرازی.

لەبەر بێ فیکرو ئیقدامی رەئیسانی عەشایر بوو
کە رۆژن بۆتە زولماتی شەوی تاریکی دەیجووری

هــــەموو میللـــــەت گەیـــشتنە مــــەنزڵی مەقـــسوودو خۆشـــنوودی
فەقــەت كــوردن بــە جــێ مــاون بــە مــەحرو‌ومی بـــە مــەهجووری
عـــەزیزم ئیفتخـــاری خـــاریجی هــــەم عیلمــــە هــــەم ســــەنعەت
بــــە ملیــۆن‌و بــــە فرســـەخ تـــۆ لــــە عــــیلم‌و مەعریفـــەت دووری
تەماشـــاكە لەبـــــەر شـــوعلەی چـــــرا بـــــەرق‌و ئەلــــەتریكی
كــورەی ئــەرزی هــەموو یەكپارچــە بۆتــە یــەك كــورەی نــووری

گ/ نیشتمان، ژ/٥: ١٩

## ٨. كوردایەتی

شاعیر سـەرباری ئـەوەی كـە خـۆی گوتـەنی (پیری‌و فـەقرو بـێ چاوی) بازییان پێـی كـردووەو برسـتیان لـێ برپـوە، بـەڵام مەسـەلەی نیـشتمان‌و میللەتەكەشـی خـەم‌و سـەودایێكی زینـدوو بـووە لـە بـیرو لـە دەروونیـدا، بەتایبـەت ئـەو لـە رۆژگـارو سەردەمێكدا ژیاوە كـە كوانـووی بزووتنـەوەی كوردایـەتی لـە سلێمانی‌و لـە موكریـان لەگەشانەوەو پەرەسەندن دابووە، كۆكەیی مرۆڤێكی هوشیارو بـە ئاگـا بـووە، ئاشـنای باس‌و خواسـتی (حیزبـی هیـوا)و بڵاوبوونـەوەی گۆڤـاری (گەلاوێـژ) بـووە، دواسـاڵانی تەمەنیـشی هاوكاتـە لەگـەڵ پێكهـاتنی كۆمەڵـەی (ژێ. كـاف)و بڵاوبوونـەوەی گۆڤـاری (نیشتمان)، چەند تێكست‌و پارچە شیعری كوردایەتیشی لـە ژمارەكـانی ئـەو گۆڤـارەدا بڵاوبۆتەوە. لێرەدا ئاماژە بە هەندێ لایەنی كوردایەتی لە شیعری كۆكەییدا دەكەین:

لە شیعرێكدا كە بۆ (كۆمەڵی هیواو حەرفی ژ.ك)ی گوتوە دەڵێ:

ئـــــەی خودایــــــە بــــــۆم بنێـــــری قاســـیدێكی ســـینە ســـاف
...چتە خزمـــــەت كۆمــــــەڵی هیـــــواو حـــــەرفی ژێ‌و كـــاف
...یر نــــەبێ بــــڕوا لــــە قــــەولی مــــن بــــچێ پێیـــان بڵـــێ
...ەی مــــودیری ئیتیحــــادو ئــــەی مــــەداری ئیئتـــیلاف
هیممـــــەت‌و ئەورۆكــــــە بــــێ، ئەورۆكـــــە رۆژی غیرەتـــــە
دەســـت بدەینــــە دەســـتی یــــەك رووبكەینــــە مەیـــدانی مەسـاف
رەفعــــی زوڵــــم‌و حیفــــزی نــــامووس‌و حقــــوقی میللــــەتی
چــاكترە ســـــەد مەرتەبــــە لــــە زیــــارەتی بــــەیتی تــــەواف
یـــا بـــە ئــازادی‌و بـــە شــادی دەچــنە نــاو حەڵقــەی میلــەل
یـــا لەســـەر كورســـی ســـەرو مــل دەچــنە نێـو حەلقــەی تــەناف

گ/ نیشتمان، ژ/ ٣: ٢١

هەروەها شاعیر نوقلانە بۆ دەرچوون و بلاوبوونەوەی هەردوو گۆڤاری (گەلاوێژو نیشتمان) لێ دەداتو دەڵێ:

لە شەوقی نیشتمانو شوعلەی ئەستێرەی گەلاوێژە
برینی رووحو قەڵبو قالبم فیلجوملە ساڕێژە
ئەگەر باوەر دەکەن یاران سەدای تەپڵی بەشارەت دێ
مەڵێن ئەم شاعیرە دێوانەیە یا شێتە یا گێژە
دەڵێن ئەو کاروانی قافیلەی کوردی وەپاش کەوتوو
کەمی ماوە نەجاتیان بێ لە ئەم هەورازو ئەم لێژە

ئەو بانگەوازەی شاعیریش لەکاتی خۆیدا (برا بییری چراییکی بکەن بیکەن بە جەمهووری) هەتا لەپێش پێکهاتنی کۆماری کوردستانیشەوە بووە، وەکو دروشمێکی زیندوو لە دڵی مێژوودا ماوەتەوە وەك مەشخەڵێك بۆنەوەکانی دوای خۆی، کاتێ دەڵێ:

لە رۆژنامەی مودیری کە چ مەداری چەرخی شەفتووری
ئەنوسێ رۆژی کوردی کەوتە ئەوجی بورجی بێ نووری
برا بیری چراییکی بکەن تاریکە شەو دادێ
قیامێکی بکەن تا فرسەتە بیکەن بە جەمهووری
کەسێ میللەت پەرەستو خاوەنی فکرو سیاسەت بێ
تەرەققی میللەتو ئاسایشە مەقسوودو مەنزووری
یەقینت بێ لەباوەش ناگری قەت شاهیدی مەقسوود
هەتاکو پێ نەنێتە مولکی ئازادی بە مەسرووری

گ/ نیشتمان، ژ/ ٥: ٢٠

